لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# کورد
# لە مێژووی دراوسێکانیدا

## سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی

وەرگێڕانی

## سەعید ناکام



چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا ـ ١٩٧٩

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# کورد
# لە مێژووی دراوسێکانیدا

## سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی

وەرگێڕانی

## سەعید ناکام

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد

بەغدا — ١٩٧٩

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي

# الكرد في تواريخ جيرانهم

« مقتطفات متعلقة بالكرد وكردستان
من كتاب ( رحلة أوليا چلبی ) »

اعدها وترجمها
سعيد ناكام

مطبعة المجمع العلمي الكردي
بغداد - ١٩٧٩

# پێشەکی

١

ئەم کتێبە بەشێکە لە کتێبێك بە ناوی (کورد لە مێژوی دراوسێکانیدا)، کە چۆنێتی ناو هێنران و باسکرانی نەتەوەی کورد لە لایەن مێژوتوسـانی هاوسێیەوە بۆ دەسکاری و گوڵبژێر کردن دەخاتە بەر چاوی خوێنەران •
واتا ئەمە ستوکە تەقەلایێکە بە نیازی ئەوەی زەردە تروسکایی‌یێك بخاتە سەر سەردەمە تاریك و شاردراوەکانی نەتەوەکەمان •

یەك لەو نەتەوانەی زیاتر پەیوەندییان بە کوردەوە بوبێ و رابوردویان پتر تێك هەڵەنگوتبێ ، تورکەکانی عوسمانین کە هەشسەد ساڵێك لەمەوپێش بونە دراوسێ • یەکێك لە باشترین سەرچاوەی رونکردنەوەی شێوەکانی ئەو بە کۆچەری لە مەغۆلستانەوە کەوتنە ناوچەی ئاسیای بچوك و لەگەڵ کوردا دراوسێتییە کتێبەکەی ( ئەولیا چەلەبی )یە کە سێســەد و سێ و سێ ساڵ لەمەوپێش نوسیویەتی •

پێشتریش زۆر جار لە پەراوێزی کتێبـە مێژوییەکاندا نـاوی ئەولیا چەلەبیم وەکو سەرچاوەیێك بەرچاو کەوتوە و سەرنجی رانەکێشاوم ، تا لە هاوینی ئەمساڵ ـ ٩٧٧ ـ دا برایێك ناپە بەرم کە لەم رۆژانی بێکاری و دەس‌بەتاڵیمدا خۆم بە وەرگێرانی سیاحەتنامەکەی ئەولیا چەلەبی‌یەوە خەریك بکەم • بێ ئەوەی هیچ بڕیارێکم دابێ تەنیا بۆ خوێندنەوەیێکی سەرپێیی

کەوتمە چاو پیاخشاندنی بەرگی چوارەم لە شەش بەرگەکەی سیاحەتنامە •

خاکەلێوەی بەهاران خەڵکی کوردستان لە ماڵ دێنە دەر و بە پیشك و بێڵەکانی و مەساسەوە لە ناو بورە و پەرێز **وقەدپاڵەکاندا** بۆ شنگ و کەنگر و ئاڵەکۆك دەگەڕێن •

تکا لە خوێنەری بەڕێز دەکەم کەنگر هەڵکەنێك بهێنێتە بەر چاوی خۆی کە پیشکی بۆ کەنگر داوەشاند و زرنگەیێك وریای کردەوە ، کە دایەوە ••• لە جیاتی بنە کەنگر کۆپەڵە زێڕێکی بۆ هاتە دەر !

من بە تەمای کتێبێکی تورکی بوم کە سەرەتاکەی بە حەمد و سەنای (سولتانولبەڕڕەین وە خاقانولبەحرەین) دەست پێدەکات و ناوەرۆکی بریتییە لە فیشباڵو خۆ گیف کردنەوە و بە ڕێکەوت نەبێ خۆی لە قەرەی راستییێك نادا بەرژەوەندی خۆی تێدا نەبێ • کەچی وا نەبو •

ئەگەر بیر و بڕوا سۆفیانەکەی نوسەری سیاحەتنامە لە بارەی ئایینەوە بخەینە ئەولاوە چونکو کەمتر پەیوەندی بە مەبەستی ئێمەوە هەیە ، دەتوانین بڵێین ئەو شتانەی دیونی و زانیونی بەوپەڕی راستی و دەست و دڵپاکییەوە نوسیونی و نوسینەکانی کەم هەتا زۆر بۆنی رەگەزایەتی و هەڵاواردن و جیاوازکاری لێ نایێ • میر شەرەفخانی بتلیس وەکو مێژونوسێکی کورد کتێبی شەرەفنامەی بۆ کورد نوسیوە • ئەولیا چەلەبیش ئەم سیاحەتنامەیەی بۆ تۆمار کردنی دیتن و بیستنەکانی خۆی لە وڵاتەکانی عوسمانیدا نوسیوە کەچی بۆ ئەوە دەشێ ئەم بەرگەیان ناوی ( کوردستان نامە )ی لێ بندرێ ، چونکو گەلێك لەو شتانەی دەربڕیوە کە شەرەفنامە خۆی لێ بواردوە •

شێوەی نوسینەکەی ئەولیا چەلەبی ــ تەنانەت بە پێوانەی ئەو زەمانیش ــ کەمێك وشکە و کەمتر بە تەنگ وردەکاری نوسەرانەوە بوە ، منیش کە دەستم بە وەرگێڕانی کرد دو ڕێگام لەبەر بو ، یا دەبوایە ئەو شێوە

وشك و رەقەی سیاحەتنامە دەسکاریێ بکەم و بیخەمە سەر بارێکی لەبار و تاشراوی ئەدەبیێ کە دەگونجا تۆزێك جیاوازیێ تیێ بکەویێ ، یا ئەو چۆنی نوسیوە منیش شوێنی کەوم بیێ ئەوەی تاقە یەك وشەشـــی لیێ فریێ بدەم یا بیخەمە سەری ، بیێ ئەوەی رستەیێکی پاش و پێش بکەم یا قسەیێك ئەو دوو جار و سیێ جار دوو پاتەی کردۆتەوە بە یەکجار نوسین دەستی لیێ هەڵگرم .

من رێگای دوەمم رەچاو کرد ، پێم وایە ئەم کردەوەیە بۆ هەر جۆرە وەرگێراتێك راست دەرنەچیێ بۆ وەرگێرانی سیاحەتنامە بە کوردیێ رەوایە و پێویستیشە ، بۆ ئەوەی خوێنـــەر دڵنیا بیێ کە ئەو هەموو وشـــەی کورد و کوردستانە و ئەو گشت پێدا هەڵخوێندنەی ئازایەتیێ و جوامێریێ و لەخۆ بوردوییێ کوردان لە کتێبەکەدا نوسینی ئەولیا چەلەبیێیە و وەرگێڕ تاقە یەك پیتیشی لە خۆیەوە لیێ زیاد نەکردوە .

ئەمەیە هۆی ئەوەی کە دەبینن ئەم کتێبە لە لایەنی داڕشـــتن و وشە رازاندنەوەوە لاوازە و چەندی بلێیی ناوەرۆکەکەی بـــە هێز و پڕ سوودە . ئەوەی بۆ من جێیی سەرسوڕمان بیێ ئەوەیە کە نوســـەرە تورکیێزانەکانمان چەند ساڵە خۆیان بە هەندیێ شتی کەم بایەخەوە خەریك کردوە و هەموو جاریێ بە تەنیشت سیاحەتنامەدا تێپەڕیون بیێ ئەوەی لای لیێ بکەنەوە !

بە پێیی بۆچوونی خۆم ، دەکریێ پوختەی ئەم کتێبە بکەین بە پێوانەیێکی پلەی ژیاریێ کوردیێ ژێردەست لە چاو داگیرکەرەکانیدا ، ئەمەش لە هەموو بارێکدا مشـــتێکی بەوەج و بایەخدار دەکاتـــە ناو کۆجیلە تیـــوەچلەکەی کەلەپووری نەتەوایەتیمان .

**هەولێر**

**١٩٧٧/١١/٩**

★ ★ ★

## به ناوی خوای گەورە و مەزن ..
## سوپاس بۆ خوا و سلاو لە پێغەمبەر و یارانی :

من کە بەندەیێکی بچـوك و بێ نرخ ئەولیا ناوم و نیازی گەشـت و گەڕانی دنیام هەیە ، بە یارمەتی خوا یەکەم رۆژی مانـگی جیمادی یەکەم سالی ١٠٦٥ شاری ئوسکودارم بەجێ هێشت و بـە دوای مەلیك ئەحمەد پاشادا[1] رۆم کردە ئەیالەتی وان ، ئەمەش بەسەرهاتەکانی ئەو گەشتەیە :

لەگەل حەوت کەسی ئەسپسوار لە ئوسـکودار دەرچوین و زۆر بە نارەحەتی شەو گەیشتینە گوندی ( ساری غازی ) کە سـەر بە مەولەویەتی ئوسکودارە ، دوسەد مالێکی پڕ لـە باخ و درەختە ، قوتابخانە و تەکیە و گەرماو و خانی هەیە ، دوکان و بازاڕی نیە ، هاوینان جێی رابواردنی خەلکی ئەستەمولە دێن لێرە خێوەت و چادر هەلدەدەن و دەحەسێنەوە ، زۆر کەس لە مالان میوان دەبن یا دەچنە تەکیەی غازی سولتان .

لێرەوە پازدە سەعات بە قەراخ زۆر گوندی خۆش و ئاوەداندا بەرەو خورهەلات رێمان بڕی گەیشتینـە گوندی ( دەوشانلی ) کە لـە ئەیالەتی ئەنەدۆلیدا سەر بە سنجاقی قۆجەئێلیە و دو سەد مالێـکی خاوەن باخ و باخچەیە و هەمو دانیشتوانی موسلمانن .

نیوە شەو بەبێ هەرا بارمان کرد و سێزدە سـەعات بەرەو خۆرهەلات کوتامان تا چونیە ناو شاری ئیزمید و میوانی مالی ئەحمەد چەلەبی ئەبازەیی

---

(١) ئەم مەلیك ئەحمەد پاشایە کە لە خولامەتی ژورە تایبەتی سولتانەکانەوە پێگەیوە و پێشکەوتوە تا گەیشتۆتە پایەی سـەدری ئەعزەمی ، پاشان لێکەوتوە و کراوە بە والی وان .

بۆین کە سوارەی یەنیچەریی یە ، باش حەسباینەوە و خۆمانمان تێر کرد .

ئەسپێکی یەدەگمان پەیدا کرد و دیسان بەرەو خۆرهەڵات کەوتینە رێ . شارۆکەی (سەبانجە) مان بەجێ هێشت و بە ناو دەریاییێك دار و بنچك و زەلكاودا دەڕۆیشتین کە لەپڕ تۆشی شەش سوار بۆین پەلاماریان داین ، ئێمەش دەسڕێژێکیمان لێ کردن ئەسپی یەکێکیان سەرەنگرێ بۆ ، بەڵام ئاوڕمان لێ نەدانەوە و هاتین . بە تەنیشت ( سەقاریا )و بەسەر پردە چواردە کلەکەی سقاریادا هاتینە شارۆکەی (کیوە) .

دیسان هەر روەو خۆرهەڵات بە رێگاییێکی پڕ تەپۆتۆزی ناو کێوەکاندا هەندێ گوند و شارۆکە و خانی ( نظیف پاشا ) مان بەجێ هێشت و رانەوەستاین تا گەیشتینە گوند و قەڵای ( بك بازاڕێ ) ، لێرەدا دە کەس لە ئاغاکانی پاشا یەکی بە پێنج کیسە پارەوە چۆن بۆ شارەکانی (ئەنگورێ)، (کەنگری) ، (ئاماسیە) ، (چورۆم) و (مەرزیفۆن) تا سەگوان و ساریجە کۆبکەنەوە، پیاوی ناردبوە ویلایەتەکانی دیکەش بۆ لای باوەڕپێکراوەکانی. دۆ سەد قرۆش و خولامێکی گورجیشی بۆ من ناردبۆ کە لەگەڵ پیاوەکانی خۆم و کەلوپەلەکانمدا بە ساخ و سەلیمی وەرمگرتنەوە و ئەمجارەش وڵاخە سواریەکانی خۆمانم لەبەر خێوەتی خۆماندا بەستەوە. زستانەکەی هێجگار ساردە .

لەبەگ بازاڕیەوە بەرەو قیبلە دەهاتین کە لە ( ئایاش بیلی ) لە ناو کڕێوە و زریاندا چەند کەسێکمان لەپێ کەوتن ، لەوێوە بۆ (ئایاش) و (ئەستینۆز) و قەڵای (ئەنگوری) . (فەنەکلەر) . (قەرە باغلێ) ، (قەلعەجك)، (شێخ شامێ) ، (قۆجە بابا) . (ئاقچە قۆیونلێ) ، (سونقور ئۆغلۆ) ، (بەگباسدێ) ، (سنجاولێ) ، (ئیشلێ سورگون) ، (ئاقچە ئاسمە)و تەکیەی (شێخ خەلیل) . گوندی شێخ خەلیل لە ئەیالەتی سێواسدا سەر بە سنجاقی

کەسکینە ، دۆ سەد ماڵێك و مزگەوت و تەکیەیێکی لێرە و گوندێکی ئاوەدانە • لێرە زیارەتی قسنی شێخ خەلیلم کرد •

لێرەڕا بە ناو گوندی میرزا چاوەشدا هاتینە شارۆکەی (یەنی شەهر) و لەوێشەوە بۆ شاری (سێواس) • پاشا سێ رۆژ لەم شارەدا حەسایەوە و لەم ماوەیەدا خەرجی بیست ئاڵا سەگوان و ساریجە و دۆ هەزار ئاغا و چوار هەزار و شێست کەسی کۆکردەوە لەگەڵ ئالیکی سێسەد وشتر و ئەسپ و ئێستر •

رۆژی چوارەم لە سێواس دەرچوین بەرەو خۆرهەڵات لە پردەکە پەڕینەوە و بە حەوت سەعات هاتینە شارۆکەی (ئولاش) • لێرەشەوە بەم زستانە سەختە روەو خۆرهەڵات بەناو بەفر و تۆفدا چەند ئەسپی لەپێکەوتومان لێ بەجێما تا گەیشتینە کوێستانی سولتان حەسەن•ئەم سولتان حەسەنە کە لە شایەکانی ئازەربایجان بوە لەم ناو دۆڵ و چیا سەختانەدا گەلێك کێلە بەردی قوچ و کۆلەکەی داری چامی بۆ رێپیشاندانی کاروانی و هاتوچۆ کەران چەقاندوە ، هەر رێبوارێك گوێ نەداتە ئەم نیشانانە و لە رێ لا بدا دەکەوێتە ناو ڕنوە بەفری بێبنەوە و دەخنکێ • بە هەزار کوێرەوەری لێرەش دەرباز بوین و بە حەوت سەعات هاتینە گوندی (قنغال) کە لە خاکی سێواسدایە و ئاغایێکی تورکمانی بەسەرەوەیە ، خانێك و مزگەوتێك و چەند دوکانی هەیە ، لەبەر خراپەکاری تورکمانەکان شوێنێکی بە ترسە •

دیسان رۆ بە خۆرهەڵات هاتین بۆ قۆناخی ( خانی ئالاجە ) کە ئەمیش لە خاکی سێواسدایە و ئاغای تورکمانی بە سەرەوەیە ، لەبەر دیوارە نەخشینەکانی (ئالاجە)یان ناو لێناوە ، ئەم خانە لەم شوێنەدا شتێکی زۆر پێویست و بەجێیە • دیسان هەر بەرەو خۆرهەڵات هاتینە گوندی (حەسەن چەلەبێ ) کە سێسەد ماڵێکە لە خاکی سێواسدا ، مزگەوت و خانی هەیە و

دا نیشتوانی لە خێڵی شاسونن • ئەمجار ڕوەو قیبلە بە ناو چیادا گەیشتینە گوندی (چوکچ) کە سەد ماڵێــکی تورکمانی لێیە و ئاوەدانە ، بەڵام پاش ئەوەی ئەم هەمو حەشامەتەی تێ ڕژا خەڵکەکەی لە پەلوپۆ کەوتن • دیسان بەرەو خۆرهەڵات بە پێنج سەعات گەیشتینە قەڵای (حوکم خانی) ، لەبەر ئەوەی ئێرە لغاوە گیرەیێکی زۆر سەختە ، ( حاکم بیئەمریللا )ی میسر ئەم قەڵایەی لێ بنیات ناوە تا ڕێگای جەردەیی و خراپەکاری بگرێ ، خەڵکەکە لە جیاتی ئەوەی بڵێن خانی حاکم ، بە هەڵە حوکم خانی پێدەڵێن ، هەوارگەی تورکمانەکانە لە خاکی سیواسدا و خانەکەشی کۆنە ، لە سەردەمی سوڵتان محەمەد خانی چوارەمدا وەزیرەکەی ئەم قەڵا قایمەی لێرەدا دروست کرد ، قەڵادارو سێسەد کەسی تێ خست و دەروازەی ئاسنی بۆ هێناو کردیە **بەرپرسی** پاراستنی ڕێبوارانی (مەلاتیە) و (ئولاش) ، سێسەد خانوییێکیشی دروست کرد و دانیشتوانی لە هەمو خەرج و باجێك بەخشی، ئاو و هەوای سازگارە، مزگەوتێك و خانە کۆنەکە و گەرماوێك و نزیکەی سەد **دوکانێکی** هەیە •

دیسان بەرەو خۆر هەڵات بە حەوت سەعات هاتینە گوندی (حەسەن بادرق) کە دوسەد ماڵێکە لە سەر سنوری مەلاتیە ، خان و مزگەوتی هەیە و ئاوەدانە ، بەڵام لەبەر ئەوەی بەم چلەی زستانە حەواندنەوەی ئەم هەمــو عەسکەرەیان لە وزەدا نەبوە ، ماڵەکانیان بەجێ هێشتوە و هەڵاتون و خۆیان لەناو چیاکاندا شــاردۆتەوە ، عەســکەرەکانمان تــەواو ناڕەحەت بون و وڵاخەکانیان تا بەیانی بە برسێتی مانەوە ، من چوبوم بۆ تەماشای منارەی مزگەوتەکە، لەسەرەوە جەوالێك جۆ و تێرێك کام دۆزییەوە و بۆ ئەسپەکانم بو بە جەژن ، لێرەوە بەرەو خۆرهەڵات هاتین تا گەیشتینە قەڵای (مەلاتیە) •

**قەڵای مەلاتیە :**

پارچەییێکە لە وڵاتی ڕۆم ، بە زمانی ڕۆمی (ڕەقەبە)ی پێدەڵێن ، ئەو کاتەی یونس پێغەمبەر لە شاری موسڵ بو ، قەیسەرێك بە ناوی ڕەقەبە ئیمانی

پێ هێنا ، ئەو قەیسەرە ئاو و هەوای ئێرەی پێ خۆشبێ قەلاییکی لێ بنیات نا و بەندەرەکەشی کرد بە شارێکی گەورە ، پاشان گەلێك دەستا و دەستی کرد ، لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا بە دەست (نۆشیروان) شای ئێرانەوە بێ، (هارونە رەشید) چەند جارێك مەلاتیەی گەمارۆ دا و بۆی نەگیرا ، سالی ۲۰۰ ی کۆچێ (میر زیاد) لە نەوەی ئیمامی عومەر و دوای ئەو کوڕەکەی (میر لوقمان) و کوڕەزاکەی ( میر عومەر ) بە دوسەد هەزار عەسکەرەوە تەقەلایاندا بۆیان نەگیرا ، بەلام یەکێك لە سەرکردەکانی میرعومەر حوسێن غازێ ناو پاش چل رۆژ گەمارۆ دان گرتی ، میرعومەریش لە تۆلەی ئەم ئازایەتییە هەر دایەوە بە خۆی •

سالی دو سەد و سێ و نۆ (ئەلینای ئەکفوری) ئەم قەلایەی گرت ، بەلام هەر لەو سالەدا (یەحیا کوڕی عەلێ) لە عەباسییەکان بە یارمەتێ (حسێن غازێ)و کوڕەکەی ( بەتال غازێ ) بە پەنجا هەزار عەسکەرەوە قەلای مەلاتیەیان سەندەوە و لە رەگ و ریشەیان دەرهێنا و روخاندیان• پاشان لە سالی ۲٤٤دا (هارونە رەشید) هاتە مەلاتیە دیوارێکی هێجگار قایمی بۆ دروستکرد جا چوە سەر ئەستەمۆل بۆگرتنی • پاش ئەوەش ئێرە زۆری دەستا و دەست بە خۆیەوە دێ تا لە سالی ٤٧٦دا کە (سولتان عەلائەدین) هاتە خاکی رۆم ئەم مەلاتیەیەی گرتو تێکیدا و تەختی کرد • پاشان (میر محەمەد ) لە میرەکانی دانشمەندی ئاو و هەوای ئێرەی بەردل کەوت لە سالی ٥٨٣دا قەلاییکی لێ کرد کە هێشتا هەر ماوە ، ئەم قەلایەش زۆر دەستا و دەستی کرد ، لە سەردەمێکدا فەرماندەی (دیاربەکر) و فەرماندەی (مەرعەش) کە هەردوکیان ( زولقەدری ) بون لەسەر ئەوەی مەلاتیە هی کامیانە قڕەیان لێ پەیدا بو ، کوردەکانی دیاربەکر لە عوسمانێ یاخێ بون و ولاتەکانێ ئاماسیە و سیواسیان تالان و وێران کرد ، ( ییلدرم خان ) بە سێ هەزار کەسەوە هات مەلاتیەی گەمارۆ دا و سالی ۸۰۰ گرتی • پاشان

(تەیموری لەنگ ) کە ئاماسیەی بۆ نەگیرا گەڕایەوە ســەر مەلاتیە گرتی و قڕانی تێخست • بەڵێ ئەم دنیایە پەشتەماڵێکە هەردەمە بە بەر یەکێکەوەیە•

لە دوایێدا ( سولەیمان خان ) ئەم شارەی گرت و بۆ بە هی عوسمانیێ، ئێستا پاتەختی بەگی سنجاقە و سەر بە ئەیالەتی مەرعەشە ، فەرماندەکەی بە پێنسەد عەسکەرەوە حکومەت دەکا و ساڵێ هەشتا کیسەی دەست دەکەوێ، خاسەی میری پێنسەد هەزار ئاقچەیە ، حەوت زەعامەت و ٢٧٦ تیماری هەیە ، زەعیمەکانی بە جبەلەبەرەکانەوە ٨٠٠ عەسکەرێك دەبن کە لەگەڵ پاشادا بۆ شەڕ دەچن، بەگی ئالاّ و سەرۆکی چەریێ و یوزباشیێ هەیە، پایەی دادگاکەی سێسەد ئاقچەیە ، دەور و پشتەکەی گوندی کورد و تورکمانەکانە ، لــەم دێهاتانە ساڵی بیست کیسە دەست قازیێ دەکەوێ • شێخەل ئیسلام و نەقیبی ئەشراف و نایبی شار و مفتیێ و ویۆدە و ئاغای خەرجو باج ئەستێن هەیە ، ئەم باجگرە بە هەزار عەسکەرەوە بە توندیێ فەرمان دەردەکا و پارەی میریێ دەستێنیێ ، ئەمین ئاغا و شابەندەر و کوێخای سوپاو سەرداری یەنیچەریێ و قەڵادار و ئاغای باجی هەیە •

## ناوی مەلاتیە :

عەجەم بەم شارە دەڵێن ( ئەسپوزان ) و تورکمانەکان ( ماڵ ئاتیە ) و عەرەب ( مەلاتییە)ی پێدەڵێن و وێنانەکان (رەقەبە) یان ناو لێ نابو ، چونکو ئەم شارە بۆ یەکەمجار رەقەبە ناوێکی ئۆمەتیێ (وێنس پێغەمبەر) بنیاتی ناوە، پاشان کچەکەی ( ئەسپوز ) ناو ئاوەدانتری کردوە ، گۆڕی ئەم باوك و کچە لە ناو باخێکدایە •

## دیمەنی قەڵای مەلاتیە :

ئەم شــارە لە هەر چوار لاوە بــە کێو دەورە دراوە ، لای قیبلەی کێوەکانی ئەسپوزانە کە چەند جۆگەلە ئــاوی لێ دێتە خوار ، لــەناو ئەم

کێوانەدا گەلێك گۆڕاییپان و بەرین هەیە • لەناو دۆڵێکی فراوانی قەراخ ڕۆباری (دێر مەسێح) . قەلاییێکی پێنج سوچ بە بەردی تاشراو بنیات نراوە ، جۆگەلە ئـاوی کانیاوەکان لـە دیواری قـەلا دەدەن و بـەلای باکوردا سەرەوخوار دەبنەوە پاشی پێنج سەعات ڕێ دەڕژێنە زێی فوراتەوە کەچی سەر چاوەکەیان لە کانیلەییێکی ئەسپۆزانەوە دەست پێدەکا • لە قەلاوە بە ناو ڕەوەزەکاندا ڕێگای چۆنە خوارەوە بۆ سەر ڕۆبار هەیە ، لە کاتی گەمارۆ درانا لەم ڕێگایەوە دەچن بۆ ئاو • قەلاکە خۆی لەسەر پارچە زەوییێکی نزمدا دروست کراوە •

**مەلاتیە بۆ دروستکرا ؟**

بنیاتنەری یەکەمی شای گەورە ( محەمەدی کوڕی دانشمەند ) بۆ لە سالی ٥٨٣دا • ئەم بەرەی دانشمەندانە سەرەتایان لە خاکی ئەو دیوی زێی (ماوەڕائون نەهر)وە بوە ، لەگەڵ باپیرە گەورەی عوسمانیان (شا سولەیمان) لە ماهانی ئەوێوە لەسەر ئیزنی تورکی تورکان (خواجە ئەحمەدی یەسەوێ) بە هەزار و حەوسەد کەس دەس و پێوەندەوە کۆچیان کرد و هاتنە ولاتی ڕۆم ، ئەم شا سولەیمانە لەکاتی مەلە کردن لە زێی فوراتـدا خنکا ، ( ئەر توغرول )ی کوڕی تەرمی باوکی لە بن دیواری قەلای (جەعبەر)ی ڕۆخ زێی فوراتدا ناشت ، هەمو هۆزەکە ئەویان لەجێی باوکی کرد بە بەگ ، پاشان گوتیان ئێمە بەگمان لێرەدا خنکاوە ئەم شوێنە ودمی بۆمان خراپـە باریان کرد و چۆنە لای سوڵتان عەلائەدینی سەلجوقی و کران بە بۆی بەگ • خوا کارێکی کرد لە سالی ٦٠٠ دا سەلجوقییەکان دوایان بڕایەوە و ئەرتوغرول بو بە بەگی ڕاستێ ، پاشان عوسمانۆکە بو بە بەگ و خاوەنی سـکەی پارە و ئەم خێلە بە نـاوی ( عوسمانێ )یەوە ناوبـانگی دەرکرد و بو بـە دەولەتێکی هەتا هەتایە • جا ئەو ڕۆژەی سولەیمـان شا لـە ئاودا خنـکا دانشمەندیتەکان کە لەگەلیان بون لە ڕۆخی ئەم روبارەدا مانەوە ، شوێنەکە

ئەوەندە بژوێنو سازگار بۆ و ماڵ و ئاژەلیان بە جۆرێکی ئەوتۆ زیادی کرد کە لە ژمارە دەرچۆ ، جا هەوالی ئەم دەولەمەند بۆنەیان گەیشتەوە ماهان نیشتمانی پێشۆیان و خەڵك بە هەزاران لەوێرا کۆچیان کرد و هاتن لە دەوروبەری قەلای (جەعبەر)و (سەلە)و (بالیس)و (بۆمبوج)و (رەقە) و (ئورفە) و قەلای بیرەجگدا گیرسانەوە ، زاوزێیان کرد ، زۆر بون و بون بە گەورە ، لە سالی ٥٨٣دا محەمەدی کوڕی دانشمەند ئەم قەلای مەلاتیەی ئاوەدان کردەوە • ئێستا کۆنێکی تازە کراوەیە و بە بەردی زلی تاشراو داندراوەتەوە ، بەرزایی دیوارەکانی ٢٦ گەزە ، شارێیەکانی بریتین لە دەروازەی ئالجە ، دەروازەی سورگۆم ، دەروازەی مشاق و دەروازەی بازاڕ ، نە لای باکور و نە لایەکانی دیکەی خەندەکی نیە ، هەر چوار دەوری ٥١٠٠ هەنگاوە ، زۆر بەرفراوان نیە ، لەناو قەلادا مزگەوت و جبەخانە و عەمباری دەخڵ هەیە ، سێسەد مالێکە و قەلاداری تێدایە ، لەبەر ئەوەی ناوخێلە تەنیا حەفتا عەسکەری هەیە • بازاڕەکەی لە دەرەوەی قەلادایە •

**بنەماڵە و خانەدانەکانی مەلاتیە :**

لەم شارەدا ٥٢٦٥ خانوی دو نهۆم هەیە و خانوبەرەی گەورەش زۆرە، هەموی باخ و باخچەی تێدایە و بە قوڕ سواخ دراون ، وارشێکی گەورەی بە دەورەدا هاتوە ، لە دەرەوەی ئەم شارەدا دیواری قەلای نیە بەلام شەو دەروازەکانی دادەخرێن •

**گەڕەکەکانی مەلاتیە :**

٣٢ گەڕەکی هەیە ، بەناوبانگەکانی ئەمانەن : گەڕەکی کۆنە جومعە ، گەڕەکی مزگەوتی گەورە ، گەڕەکی ئەمیر عومەر ، گەڕەکی سەرا ، گەڕەکی کچان ، گەڕەکی خانەقا ، گەڕەکی تۆپداشی ، گەڕەکی قەرەخان ، گەڕەکی

چەرمك . گەڕەكی دەروازە ڕەنگین ، گەڕەكی بێستانچیـیەكان ، گەڕەكی كوچاك ، گەڕەكی ئەعاراز و گەڕەكی كوردان • لە حەوت گەڕەكدا ئەرمەنی هەیە بەڵام جولەكەی تێدا نیە •

**مزگەوتەكانی :**

٣٢ مزگەوتی هەیە دوازدەیان جوعمەی لێ دەكرێ ، هەرە بە ناو بانگەكەیان مزگەوتی ( ئولو )ە . بیست مزگەوتی كۆڵانیش هەیە . هەرە كۆنەكەیان لەناو قەڵادا مزگەوتی میر عومەر و مزگەوتی قەرەخان و مزگەوتی سەرا و مزگەوتی كچان و مزگەوتی خانەقا و مزگەوتی تۆپداشی و مزگەوتی چەرمك و مزگەوتی نەخشین و مزگەوتی بێستانچی و مزگەوتی بەگداش ئاغا و مزگەوتە بچكۆلە و مزگەوتی كوردانە • لە حوجرەكانیش حوجرەی (ئیمام سجا) و (ئیمام عیوەز) بە ناوبانگن • لە تەكیەكانیشی تەكیەی (غازی سەید بەتاڵ ) لە ناو باخی ئەسپۆزاندایە . سەید غازی خۆی لێرەدا لە دایك بوە . مەلیك ئەحمەد پاشا ئەم تەكیەیەی تازە كردۆتەوە ، ئاوی سەرچاوەكانی خۆش و سازگارن ، لە كۆهی ئەخگەر واتا چیای ڕەژۆ و كانی دێر مەسیح هەڵدەقوڵێن و شار پاراو دەكەن ، حەوت سەبیلخانەی لێیە كە یەكیان هی مستەفا پاشای سەلەحدارە •

**سەرا و خانوبەرەكانی :**

یازدە سەرای گەورەی لێیە كە ماڵی گەورە و پیاو ماقوڵانی تێدایە ، لە هەمویان ڕازاوەتر سەرای پاشا و سەرای ئەمینە •

**كاروانسەراكانی :**

لە هەموان ڕازاوەتر خانی سیلاحدار مستەفا پاشایە كە لە بڕوا پێكراوەكانی سوڵتان مراد خان بوە ، ئەم كاروانسەرایە سەد و حەفتا ژوری

تێدایە کە سەرەکانیان بە گومبەز هاتۆتەوە • دەروازەی ئاسنی تێخراوە و ساڵی دروستکرانی لەسەر دەروازەکە نوسراوە •

**قەیسەری و بازاڕی :**

بازاڕێکی ئاوەدانی هەیە ، بەڵام دوکانەکانی دیواریان وەکو شام و حەلەب بە مز دانەپۆشراون • لەگەڵ ئەوەشدا هەر جۆرە کوتاڵو کاڵاییێکت بوێ دەست دەکەوێ •

**خەڵکەکەی :**

بە هۆی سازگاری ئاو و هەوایەوە پیاوەکانی هەمو بەهێز و تێکسمڕاون و تەمەنیان دەگاتە شێست و حەفتاش کەچی دوانیان بە ساخی دەمێنێتەوە ، زۆر پیریش بن رەنگو روویان بە ئاڵی و گەشی دەمێنێ ، خەڵکێکی زیندو و بە خۆوەن ، لەسایەی ئاو و هەوای خۆشەوە دانیشتوانی جوان و بە نمودن بەڵام چونکو کوردستان و کوێستانە ژنی جوانی بە ناوبانگیان کەمە • لەبەر ئەوەی لە نەتەوەی کوردن کچیان بگاتە دە ساڵی وەختی بەشودانی دێ •

لە پیاوە ماقوڵەکانی ئێرە بەکداش ئاغای مەلیك پاشایی ، بەکاری خوا خۆی بەسەر شیرەکەیدا دا و خۆی کوشت •

شارەکە شاری کورد و تورکمانە ، لە باب و باپیرانیانەوە فێری پزیشکی و دەرمانکاری دەبن و ئەوەندە شارەزان لە ئەڵمان و قرمان وێنەیان نیە • حەوت دوکانی برینکاری تێدایە ، وەستا بەشارەتی کورد لە هەرە شارەزاکانیانە ، لەبەر ئەوەی کوردستانە پیاوی درشت و زلی زۆرە، زۆریشیان هەیە کە شەوانە شەونوێژ دەکەن و ڕۆژانە بە ڕۆژون ، دەوڵەمەندەکانیان کەوڵی سمورە و خوری لەبەر دەکەن ، لەوان خوارتر

جلکیان شاڵ و شەپکە ، لەوانە ژێرڕاتر چۆغ و خامی مەلاتیە و کەوای شین لەبەر دەکەن • ژنە دەوڵەمەندەکانیان بە پەچەی مخیر و سەرپۆش دەگەڕێن، ژنی هەژارەکانیان چارشێوی سپی و پەچە و کلاوی سێوری لەسەر دەنێن ، هەمۆشیان جزمەی زەرد و سور لەپێ دەکەن •

**زمانیان :**

بە کوردی و بە تورکمانی دەئاخەون ، تورکەمانەکانیان شــێوەیێکی تایبەتی خۆیانیان هەیە کە تورکەکان باش تێیان ناگەن •

**ئاو و هەوای :**

هەتا بڵێی ئاو و هەوای سازگارە و خۆشە ، بە قسەی گەشت کارەکانی دنیا هەوای ئێرە وەکو هەوای تەورێز وایەو بگرە خۆشتریشە ، هەر لەبەر ئەم ئاو و هەوایەیە خەڵکەکەی وا بەخۆوە و بەگوڕن •

**ئاوی چالاوەکانی :**

نزیکەی دۆ هەزار چالاویان هەیــە کە ئاوێکی خۆشــ و پاکیان لێ هەڵدێنجن و باخ و بێستانەکانیانی پێ ئاو دەدەن ، جگە لەوەش هەرکەسە لە ماڵی خۆیدا چالاوی هەیە لە کاتی پێویســتا بە کاری دێنن • ئەوانــەی کاریشیان بە ئاوی چالاو نیە دیسان چالاویان **لەحەوشەدا** هەیە •

**گەرماوەکانی :**

حەوت گەرماوی خۆش و رازاوەی لێیە ، وەکو گەرماوەکانی ئەلجە و مستەفا پاشا کە زۆر خۆشن • لەوانە خوارۆتر گەرماوی تازە و گەرمــاوی بەگ و گەرماوی قوماجك ، گەرماوی عەلی مینسریش کە پیاوچاکێك بنیاتی ناوە سەرەڕای گەرماو زیارەتگاشە ،جگە لەمانە لە سێسەد ماڵدا گەرماوی

تایبەتی ناومالّ هەیە . هەروەها گەرماوی چۆم و گەرماوی بارام پاشا لە ناو وارشدا .

**ناوی پیاوەکانیان :**

بەکداش ئاغا ، حاشی ئاغا ، قوتلو ئاغا ، عەتا بەگ، رەزا بەگ،سنان بەگ ، شادی بەگ و لەم بابەتە . ناوی مەلاکانیان بە نازناوی مەلبەندەوە دەگوترێ وەکو مەلا بەردنجی ، مەلا خوبریدێ ، مەلا شقاقی ، مەلا سور ئاغا ، مەلا حەبیبێ و مەلا خەلیلێ .

**ناوی ئافرەتان :**

حەوا ، هوما ، تەنزیلە ، ئەنزەلە ، کەلیمە ، عالمە ، روقیە ، ئەمینە ، کەزابان ، کەلسومە ، فاتمە ، خاتیمە ، مریەم ، ئەمهان ، نساقادین ، زولەیخە، مەشکورە ، عاتکە ، زوخروفە ، سەنیە ، هاشمە ، خەدیجە خانم و ئەمانە ..

**ناوی خزمەتکارەکانیان :**

دلاوەر ، سەروەر ، هونەروەر ، بەشیر ، نەزیر ، ئیواز ، رۆستەم ، فکرلێ ، سولەیمان ، کەڕاڕ ، سیاوەش ، زولفەجام ، زولفەقار ، مراد ، زلزەن ، خوداوێردێ ، ئەڵلاوێردێ ، چالاب وێردێ ، جانوێردێ ، جانبزدێ ، جوانمەرد .

**ناوی کەنیزەکان :**

تابندە ، حاکمە ، تەرفیل ، خونچەبۆی ، نێرگز ، گوڵشاخە ، سومبلە ، هوارە ، فیدایە ، وردیە ، مالکە ، میهرێ ، فەخرێ ، یاسەمەن ، گولستان ، ئەفناد ، شاخمە ، باتویە ، دەمرخان ، بەدەخشان ، گولگون ، جان فیدایە .

**شوێنی پیشـــەکارەکان :**

شەش قاوشی پیشەکاران هەیە کە هەر یەکەی هــەزار کەس دەگرێ ، ئەمانە زوربەیان پێلاودرو و کوتاڵ فرۆشـــەکانی لا ی تەرەبزونن ، هەمــو شەوێ پاش نانخوران تەپڵ لێدەدرێ و دەرگاکان دادەخرێن و دەرکەوان دەبێتە فەرمانڕەوا • جگە لــەو خانوبەرانەی لە سەرەوە باســمان کردن ، خانوبەرەی کۆنە مزگەوت لە کاتی خۆیدا ئاوەدان بوە بەڵام ئێســـتا پەکی کەوتوە •

**پردەکانی :**

پێنج میل لە خوار مەلاتیەوە پردێکی گەورەی چل کڵی هەیە کە سوڵتان حەسەن بنیاتی ناوە . ئاوی ئەسپوزان دوای ئەوەی بەناو باخەکاندا دەخشێ لەگەڵ ئاوی دێر مەسیح و کانیاوەکان و روباری توخمە لێکدەدەن و بە ژێر ئەم پردەدا هاژە دەکەن •

**کلیســـاکانی :**

حەوت کلێسای هەیە کە هەرە گەورەکەیان لەنزیك دێرمەسیحدایە لــە داوێنی کێوێکی بڵند بــە قەراخ لێژێکەوە کە لەناوەڕاستی چیــاوە هاتوتە خوار و راست و چەپی باخ و باخاتە •

**دانەوێڵە و بەرهەمەکانی :**

حەوت جۆرە گەنمی باشی هەیە کە وێنەیان مەگەر لە حۆراندا دەست بکەوێ ، جۆ و پەمۆ و تەختە و گیای مێرگەکانی باشن ، پاقلە و دانەوێڵەی بە ناوبانگە • لە سنعاتدا خامی سپی لۆکە و دەزوی پەمۆی ناودارە •

**خواردەمەنی و میوەی :**

لە کێوەکانیدا هەڵوای خوایی « گەزۆ » هەیە (گەزەنگو)ی پێدەڵێن ،

بەکاری خوا لە ئاسمانەوە دەبارێتە سەر گەڵای داران و دەبێتە حەلوایەکی رەوان و خۆش ، لە چیاکانی مازو و لە دەشتەکانی پیــواز و ئەسپەناخ و کەلەم و سەوزەی جۆربەجۆری هەیە ، حەوت جۆرە قەیسی و هەشتا جۆرە هەرمێی لە دەفتەردا نوسراوە ، حەوت چەشنە بەهێ و بیست جۆرە سێوی هەیە لەگەڵ ترێ و هەڵوژەی بە ناوبانگ •

**خواردنەکانی :**

لەم شارەدا جۆرە هەنگوینێکی سپی هەیە کە لە دنیــادا هاوتای نیە مەگەر هەنگوینی ئایدۆس بیگاتێ ، هەمو ساڵێ چەند سەد هەزار مەشکەی سور پر دەکرێ لە هەنگوینی قاڵکراو و بــۆ گەورە پیاوانی ئەســتەموڵ دەنێردرێ ، خۆشاوی ئەم هەنگوینە و خۆشاوی مرەبای بــە هێی مەلاتیە زۆر بەتامن •

**کار و کاسبی دانیشتوانی :**

زۆربەی خەڵکەکەی باخەوانن و بــە بەرهەمی درەختەکانیان بەڕێ دەچن • هەندێکیان بە خەڕەك دەزو دەڕێســن و هەندێکیان جۆڵان جاو دروست دەکەن • واتا هەمو دانیشتوانی ئەم شارە خەریکی کار و کاسبین •

**باخەکانی :**

بە پێی دەفتەری میراو لەم شارەدا حەوت هــەزار و هەشسەد باخ و شەشسەد باخی پەرژینداری تۆمار کراو هەیە •

**روبارەکانی :**

لە خوار و ژور و ئەملا و ئەو لای مەلاتیە بــە تێکڕایی حەوت ئاوی گەورە و بچوك هەیە ، لەمانە ئاوی (سمیات) کە لە کێوەکانی قەڵای سمیات دێتە دەرێ و لە دەرەوەی مــەلاتیە تێــکەڵاوی روباری (توخمە) دەبێ •

ڕۆباری توخمەش لە کێوەکانی ڕەقەبە هەڵدەقوڵێ لە باخەکانی ئەسپۆزان ئاوی سێ سەرچاوەی دیکەشی دێتە سەر کەمێك بەرەو خوارتر ئاوی (پیکار باشی) تێکەڵ دەبێ و پاش ماوەیێك ئاوی دێر مەسیحیشی دێتە سەر، دوای ئاودانی باخەکانی ئەسپۆزان بن دیواری قەڵای مەلاتیە دەشواتەوە و دەڕوا لە (دۆڵی دەواڵ) لەگەڵ ڕۆباری (تەل) یەکدەگرێتەوە •

ئاوی تەل ـ پێنج میل لە خوار شاری مەلاتیە لقێکی ڕۆباری توخمە دێ و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەبێتە ڕۆبارێکی گەورە و بە ژێر ئەو پردە چل کلێ زلەدا دەڕوا کە سوڵتان حەسەن بنیاتی ناوە و دەگاتە مەلاتیە ، کاروانی و بازرگانانی ڕۆم و دیوریك بەسەریدا دەپەڕنەوە • ئەم پردە یەکێکە لە پردە بە ناوبانگەکانی کوردستان بەڵام ناگاتە بەرزێ و گەورەیی پردەکانی بەتمان و حەسەنکێف •

**باخ و کوێستانەکانی ئەسپۆزان :**

بەلای گەشتکارانەوە باخە هەرە بەناوبانگەکانی عوسمانێ ئەمانەن :
لەسەر سنوری بۆدین لە پشت قەڵای (پچوی سەرم ـ سەرو ؟) بارۆتخانە ، لە بەردەمی قەڵای شاری (سیرۆز) ، باخی (سوداق) لە وڵاتی (کفە) ، باخەکانی (سجا)و (کاغەدخانە)و (گوگسو) لە ئەستەموڵ ، ئەو سەد و حەفتا باخە تایبەتیانەی بۆ پیاسەی سوڵتانەکانی عوسمانێ داندراون ، جێگای تۆپ لە شاری ئزمید ، باخی (مەرام) لە (قۆنیە) ، باخی (ئیستیفان) لە (ئادالیا) ، باخی (دارندە) لە شارۆکەی دارندە ، باخی ریحانێ دیاربەکر لە ڕۆخی زێ ، باخی شاری (فەیوم) لە (میسر) و گەلێکی دیکەش •••

بەڵام ئەم باخاتەی ئەسپۆزانی مەلاتیە لەبەر ئاووهەواخۆشێ و میوە زۆرێ لە پێش گشت ئەو باخانەوەیە کە باسمان کردن • میوەکانی ئێرە ئەمانەن :

حەمری ئاڵ ، حەمری زەرد ، حەمری مشمش ، حەمری سپی ، حەمری بەگی ، حەمری ئاودار و حەمری گۆشتن حەوت جۆرە قەیسین کە بە هەزار حاڵ لەناو سەبەتەدا دەگاتە ناو شار ، چونکە هەر تۆزێـــکی بقرنجیێ هەمو ئاوەکەی دەچۆڕێتەوە، هەر دانەیێك لەم قەیسیانە بەکێشان چل پەنجا درەم دەبێ ، جگە لەمانە ژمارەی جۆرەکانی دیکەی قەیسی هەر خوا دەیزانێ ، ئەوەندە زۆرە دەیکەن بە نانە قەیسی و شار بە شاری دەبەن ، لە دەفتەردا هەشتا جۆرە هەرمێی نوسراوە، هەرمێ شینە ئاودارەکەی بەناوبانگە و دانەی یەك (قیێة = اوقة) دەبێ، لەم هەرمێیە ترشیات دروست دەکەن کە ئاوەکەی دەغەز پەڕێنە ، دەڵێن هەرکەس زۆری لێ بخواتەوە گەرم دادێت و نەشـــە دەیگرێ ، بۆ بەهێز بون سودی هەیە و ئەوانەی ژنیان هەیە زۆری دەخۆن. هەرمێی بەگیش زۆر خۆشە ، دەوڵەمەندەکانی ئەستەموڵ بە پـــەلە ئەمامی هەرمێی مەلاتیە دەبەن و لە زەویەکانی ئەستەموڵدا دەیچەقێنن تـــا هەرمێی مەلاتیەیان ببێ .

مەلاتیە حەوت جۆرە سێوی هەیە کە بۆ بەتامی و ئاوداری لە سێوە خۆشەکانی ئزمید خۆشترن ، ئەوەندەی سێوە ( سوداق )ە کانی شاری کفە درشت نین ، یـــەکی هەر سێ چل درەم دەبن بـــەڵام خوای گەورە جۆرە رەنگێکی داوە بە سێوی مەلاتیە کە سورەکەی سوری قـــوخ و ئاڵەکەی کاڵ و رەنگەکانی دیکەی ئەوەندە رون و دڵگرن لە هیچ رەنگێکی ئاسایی ناچن ، هەر ژورێك پێنج شەش دانە لـــەم سێوانەی لێ بێ هەمو ماڵـــەکە بۆنخۆش دەکا ، لە هەموی خۆشتر نازەنینەکانی ئێرە فێربون لە سەردەمی کاڵی سێوەکاندا شیعرێك یا قسەییێکی خۆش و نەستەق بە داوە مێوی باریك دەنوسن و بە سێوەکەوەی دەلکێنن، ئەو سێوە وردە وردە رەنگ هەڵدێنێ و سور دەبێ ، کە گەیشت و لێیان کردەوە ، مێوەکانی لێ دەکەنەوە دەبینی شوێنی مێوەکان بە سپێتی ماوەتەوە و بەم خەتە جوانە شیعرەکەی لە سەر

نوسراوه ، هەندێ جار لە جیاتی مێو قاقەز دەبڕن و پێوەی دەنوسێنن ..
سێوی ئێرە شار بەشار و وڵات بە وڵات بــە دیاری دەڕوا . تەنانــەت بۆ
سوڵتانەکانیش دەبرێ . حەوت جۆرە بەهێی هەیە کە یەکی یــەك قیە دەبێ ،
لەوانە بەهێی پاپات و بەهێی کوللێرە زۆر تام و بونخۆشن ، بە تایبەتی هی
ئەو باخەی خاتوچکەکەی سەید بەتاڵ غازی تێدا لە دایك بوە . لە دەوری
ئەم باخە جۆرە ترێیێك هەیە کە وێنەی لە وڵاتەکانی دیکەدا نیە . ترێ
هەڵگرتن بۆ زستان و دۆشاو گرتن و باسوق کردن پیشەی خەڵکی ئێرەیە ،
هەڵوژە و خۆخیشی هەیە بەڵام ئەوەندەی هەڵوژەی ئەســتەموڵ و خۆخی
تەگەرداغی زل و ئاودار نین .

بە کورتی قەڵەم لە تاریفی ئەم باخە بەهەشت ئاســایە دا دادەمێنێ کە
چارەکێك لەشار دورە و کەوتوتە لای قیبلەوە . جگە لەم باخی ئەسپوزانە
ورد و درشتی خەڵکی شاریش باخی تایبەتی خۆیانیان هەیە ، لەگەڵ بەهار
داهات ناو شار بەجێ دێڵن و دەچنە ناو باخەکانیانەوە ، تەنیا بارزگانەکان و
کەسانی غەریبە و هەندێ ماڵە گاور و نزیکەی سێسەد کەس پاسەوان لە ناو
شاردا دەمێننەوە ، ئەم پاسەوانانە بە شەو فانۆس دادەگیرسێنن و پاسی ناو
شار دەکەن ، بە تەپڵ لێدان بە ناو شاردا دەگەڕێن ، هەر پیاو خراپێك ببینن
دەزبــەجێ دەیکوژن چونکە لە ســولتانەکانی پێشودوە فەرمانی وایــان
بەدەستەوەیە .

بەم جۆرە هەشت مانگ خەڵکی ناو شار بەخاو خێزانەوە لەناو ئــەم
باخانەدا رادەبوێرن و دوعا بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەکەن ، هەر یەکێك لــە
دانیشتوانی شار دەبێ باخێکی یەك فرسەقی ببێ ، لــە دەفتەرەکانی میرێدا
حەوت هەزار و هەشسەد باخ نوسراوە کە میراو ئاویان دەداتێ . لە ناو هەر
باخێکیشدا خانوێك هەیە ، سێسەد حەوزی بە فیچقەی لێیە ، ماڵە گەورەکان
گەرماوی خۆیانیان هەیە ، مــاڵی پاشا و مەلا و ئەفسەر و کاربەدەســتان

لێرەن ، مزگەوتی جوعمە و قوتابخانــەی منداڵان و تەکیــە و گەرماوی گشتیؔ و شەشسەد دۆکانێکی لێیە ، بە کورتیؔ ناوشــار چەندی خاتۆبەرە لێبێ ئێرەش ئەوەندەی هەیە •

**جیؔ سەیرانی سەرچاوە :**

ســەیرانگایێکی بیؔ وێنــەیە لە قەراخ دێری مەســیحدا و هەرچی سەیرانگای دیکە هەیە هەمۆیان لە چاو ئێرە هیچن ، خیابانێکی پڕ لە گوڵو سێبەرە دەڵێی چوار باخی ئیسفەهانە ، گوڵ و سومبول و نێرگز و وەنەوشە لە ژێر پێی سەیرانکەراندا دەبنە پێخوست و داری ئەمبەرەو بەری خیابانەکە سەریان لە ئاسمانە و لە هەواوە گەیشتۆنەوە یەك و تێك ئاڵاون بەجۆرێك کە تیشکی هەتاو ناگاتە زەوی و بەر سەیرانکەران ناکەویؔ، لە هەر گۆشە و بن پنچکێك هەزاران بولبول و مەلی خۆشاواز دەچریکێنن و وا لە رێبوار دەکەن راوەستیؔ و گویؔ بگریؔ •

دەنگ خۆش و مۆسیقا ژەنەکان هەریەکە لە لایێکەوە کۆڕی خۆیان گەرم دەکەن و ئاسمان دەخەنە سەما ، خێرەومەندەکان لە ناو ئەو مێرگ و چیمەنانەدا سەکۆی دانیشتنیان کردوە کە جۆگەلە ئاوی پاکی بە بەردەمدا دەڕوا و ئاشی کەبابەکانیان بە ڕێژنەی ئاو دەگەڕیؔ و شــیشە گۆشتەکان دەسوڕێن و دەبرژێن • لــەم سەیرانگایەدا دەســتە دەستە خەڵك لێك کۆ دەبنەوە هەندیؔ باسی زانین دەکەن و هەندێك شیعر دەخوێننەوە و هەندێکی دیؔ چیرۆك دەگێڕنەوە ، لــە لایێکی دیؔ پیاوی قســەخۆش و نوکتەباز و لاسایی‌کەرەوە دانیشتوان دێننە پێکەنــین • لەولا ترەوە دەســتەیێك لە دانیشتوان زۆر بە سۆز و کوڵ باسی ئیمامەکان دەگێڕنەوە •

هەر چوار لای ئەسپوزانیش باخ و باخچەی یەك لــە تەنیشت یەك گرتۆیەتی و پازدە گوندی ئاوەدان و پڕ لە خەڵك لە ناو ئەو باخانەدان کە

خان و مزگەوت و گەرماو و بازاڕۆکەی خۆیانیان هەیە . هەریەکەش کانیاوی خۆی هەیە کە باخچەکانی ئاو دەدا •

**شـــارەکانی چواردەوری مەلاتیـــە :**

لە مەلاتیەوە بۆ لای خۆراوا بە ڕێی وەلاش و قەنقالدا بە ســێ ڕۆژ دەگاتە شاری سێواس ، لە باشوری خۆرهەلات شـارۆکەی ( ئالبستان ) هەیە ، لای باکوری قەلای (دیوریك)ە ، ئەو ڕوبارەی لـە ئالاجەخانڕا دێ بە ژێر پردی دیوریکدا تێدەپەڕێ ، لەوێشەوە پاش پەڕینەوە لە پردی گولە زەرد دەگاتە قەلای (عەین) کە لە ڕۆخی فوراتدایە و تا مەلاتیە سێ قۆناخی تەواوە • باشوری مەلاتیە قەلای حەسەنمەنسورە کە ســێ قۆناخ دورە و کێوی ( کومورلێ )یان کەوتوتە نێوان • لای قیبلەش دوڕگەی دیجلەیە • لە باکوری خۆرهەلات بە قەراخ زێی فوراتدا دەگاتە قەلای (خارپوت) کە سێ ڕۆژە ڕێیە بـــەلام من خێرا ڕۆیشتم بە دو ڕۆژ گەیشـــتم چونکو ئەم قۆناخانە بە توند ڕۆیشتن نەبێ نابڕێن • لای باشوری قەلای (دڕندە)یە و قەلای (ڕۆم) چوار قۆناخ لەو خوارترە • قەلای پیرەجگیش هەر کەوتوتە لای باشور ، ئەوانە هەر یەکێ سێ ڕۆژ ڕێگان بەلام (ئاقسەرای) دورترە و بە پێنج ڕۆژ دەیگەنێ ، بەندەری حەلەبیش هەر کەوتوتە باشوری مەلاتیە و پێنج قۆناخ دورە ، قەلای مەرعەش و قەلای دیاربەکریش یەکی پێنج قۆناخ دور کەوتونە لای خۆر هەلات ، قەلاکانی (عەنتاب)و (قەیسەرێ) کەوتونە باشوری مەلاتیەو ڕێگای پێنج ڕۆژن •

بـــەم جۆرە مەلاتیە کەوتوتە نێوان ئەم هەشـــت شارە گەورەیـــەو بەندەرێـــکی ئاوەدانە ، دانیشـــتوانی کوردو تورکن ، کـــوردی ئیزۆلێو تورکمانیشی زۆرە ، خەلـکەکەی ئازاو دلێرن ، هەمویان موسلمانو بەدینو غەریب دۆستن و نانیان لەبەر چاو نیە ، هەر ئاوارەیێك ڕێی بکەوێتە مالیان زۆر ڕێزی دەگرن ، شاری زانا و گەورە پیاوانە و جێگای شاعیرانە •

**زیارەتگاکانی :**

لە لای راستی ئەسپۆز و (قەرەبابا) هەیە و لەلای چەپ (عەلیبابا) و لە نزیك داراغاجی ( سوڵتان سـەید کەماخلی ) نێژراوە ، ئەمانە هەمویان لەگەڵ هارونەرەشیددا هاوبەشی گەمارۆدانی ئەستەمۆلیان کردوە ، لە نـاو باخەکانی ئەسپۆزداماڵی سـەید بەتاڵ هەیە کە خانوچکەیێکی بچـوکە و لەسایەی هیمەتی ئەو بەتاڵەوە حەوسەد ساڵە هەیە و هەر وەك خۆی بە پێوە ماوە ، لەبەر ئەوەی مەلیك ئەحمەد پاشا دۆستی ئەو خانەدانەیە ئەم قسنەی گەورەتر کرد و گومبەزێـکی گـەورە و چەنـد حـوجرەی بـۆ کرد و چێشتخانەیێکی بۆ دانا و گەلێك قاپ و قاچاخی مسی بۆ کرد بە وەقـف و سەرکارێکی لەسەر دانا ، ئێستا بوە بە تەکیە و زیارەتگا ، خەڵکی شار بـۆ دوعای بارانە لێی کۆ دەبنەوە و شوێنی دوعا قوبوڵ بونە ، لە نزیك ئێـرە (سەید ئەحمەدی درنی) و جێگای چلەکان و زیارەتگای (شێخی شـافعی) هەیـە .

پاش ئەوەی تێر بە مەلاتیەدا گەڕاین بارمان کرد ، یازدە سەعات روەو خۆرهەڵات هاتین لە قەراخ زێی فورات و چاتێکمان گرت ، هەوا خۆش بو ، هەندێ کەڵەك و بەلەممان پەیدا کرد و بە سێ رۆژ لەمبەرەوە پەڕینەوە ئەو بەری فورات و چوینە ناو هۆزی/ ئیزۆلی کورد لە ویلایەتی دیاربەکر .

سەیری خـۆش لەوەدابو هەندێك لـە مەلەوانو کەڵەکەوانە کوردە ئیزۆلییەکان بە روت و قوتی لەسەر رێی پاشا ریزیان بەسبو گوایا سەلامی بۆ دەکەن ، پیرەکانیان بەوانی دیکەیان دەگوت « کوڕۆ دەسـت بۆ پاشا راتەکێنن ، ئەدەب وایە ! » خۆیان بە روتی هاتونە بەردەمی پاشا و ئەدەبیش فێری ئیدیکە دەکەن . پاشا بێ ئەوەی تەماشایان بکا هەشتا زێڕی دانێ و رۆیی ، لە نزیك فورات چوینە گوندی ئیزۆلی کە دوسەد ماڵە و لـە خاکی خارپوتدایە ، مزگەوتێکی هەیەو دانیشـتوانی هەمو لـە دز و رێگرەکانی

ئیزۆلین • لێرە بەرەو خوارتر لە سەر فورات خانی رەژۆ هەیە کە شوێنێکی زۆر بەترسە • لە خوار ئەوەوە زێی فورات بە تێوانی دۆ کێودا ئەوەندە بە خوڕی و تیژی دەڕوا هاڕە هاڕی زراوی پیاو دەبا ، (سولتان مرادی چوارەم) نیازی وابۆ لەم شوێنەدا پردێکی بلند سازکا و پێویست بۆ ئەملا و ئەولای دەربەندەکەی بۆ تەخت بکا ، تازە دەستیان پێ کردبۆ کە مراد خان مرد و پردەکە بە نیوە چلێ مایەوە • دروستکرانی پردێکی گەورە لە سەر فورات لە نزیك ئاوی رەژۆ کارێــکی زۆر خێر و چاکە ، بــەلام پردی وا گەورە وەستای زۆر شارەزای دەوێ ، چونکو لەمبەرەوە بۆ ئەوبەر ١١٠ گەزی شایە و لە تاقەکانی ئەیاسۆفیا پانترە ، لەگەل ئەوەشدا هەر کارێك ئادەمزاد بەراستی دەستی بداتێ سانایە •

لێرەوە بە گوندی ( مالقوچ )دا تێپەڕین و قەلای خارپوت لــە لای چەپمانەوە بەجێ ما . دیسان رووەو خۆرهەلات هاتین و لە گوندی ( مــەلا ئەفەندی) وچانێکمان گرت ، ئەم گوندە لە خاکی خارپۆتدایە و سەد مالێکی ئاوەدانە، مزگەوتی هەیە و مەلا ئەفەندی خۆشی لەو مزگەوتەدا نێژراوە پاشا لێرەوە ئاغاکانی خــۆی ناردە سەر گوندەکانی خارپوت وەکو باشــخان، ئۆرتەخان ، شەربەتــین ، ئەگیل ، ئەرخەنێ ، چەرمــك ، جنێ و پــالۆ تا میوانداری بکەن • پاشا بڕیاریدا دە رۆژ لەم گوندەدا بحەسێتەوە ، لــە هەرێمەکانی دەور و بەرەوە ئازۆقەهاتن دەستی پێکرد • لێرەدا منیشی ناردە کن بەگەکانی ئەرخنێ و ئەگیل •

**چۆنم بۆ لای بەگەکانی ئەرخنێ و ئەگیل :**

**لەوێوە** هاتمە گوندی (هابۆس) کە لە ئەیالەتی دیاربەکردا ســەر بە سنجاقی خارپۆتە و کەوتۆتە رۆخی دەریاچەی خارپۆت و سێسەد مالێکە ، لەوێوە هاتمە (ساریقامیش) کە گوندێکی خاوەن باخ و درەختە و لەوێشەوە

بەرەو خۆرهەڵات بە یەك رۆژ لە رۆباری مراد پەڕیمەوە نامەی پاشام گەیاندە مورتەزا بەگی (پاڵۆ) ، ئەویش باری سەد و پەنجا وشتر ئازوقەی بۆ بەڕێکرد و خۆشیان سازکرد بۆ پێشوازیکردنی ، سێسەد قرۆش و ئەسپێك و کەوڵێکیشی دا بە خۆم •

ئەم قەڵای پاڵوە لە قەراخ رۆباری مراد لە شوێنێکی ئەوەندە بەرزا بنیات نراوە سەری گەیوەتە ئاسمان ، ئێمە بە ئاسانی لە ئاوەکەماندا و چوینە ناو دەروازە ئاسنەکەی ، گوندێکی کورد و ئەرمەنییە لە خاکی دیاربەکردا ، لێرەدا زێ لقێکی لێ دەبێتەوە لە ژێر دەروازەکە بە ناو دۆڵێکدا دەڕوا ناوی چنارەیە و دەچێتە دیاربەکر • وەختی خۆی (نۆشیروان) قەڵاییێکی لێرەدا بنیات نابو و دەروازەی ئاسنیشی تێ خستبو، لەبەر ئەوە ناویان نابو (دەمیر قاپو) ــ دەرگا ئاسن ــ ، ئێرە رەشەباییێکی هەیە جارێ بۆ باکور و جارێك بۆ باشور هەڵیدەکا پاشان هاتینە گوندی (ترخی) کە لە خاکی دیاربەکردایە و خەڵکەکەی کوردن ، لە قەراخ زێیە • لێرەوە هاتینە گوندی (بەرد نسیج) کە پردێکی سەیریان لەسەر رۆبارەکەی دروست کردوە ، هەرچۆنێ بێ ئێمە بەسەریدا پەڕینەوە و هاتینە قەڵای ئەگیل •

**قەڵای ئەگیل :**

لە سەردەمی سەلیم خاندا مەلا ئیدریس و بیقلی پاشا ئەم قەڵایەیان لە فەرمانڕەوای کوردستان (قەچور خانی گەورە) سەند ، ئێستا سنجاقێکە سەر بە دیاربەکر • قەڵاکەی لە پارچەیێك تەختایی سەر چیاییێکی بەردین دروستکراوە ، باخ و باخچە و خانوی خۆشی هەیە ، لە خانوبەرە بەناوبانگەکانی ماڵی عەبدول مومنی کوڕی موجار بەگە کە پیاوێکی پیری دنیادیتوە ، بەگی ئاڵا و سەرۆکی چەری هەیە ، بەڵام بەگەکەی بەگی عوسمانی نیە و لابردنی بۆنیە ، بەگ بمرێ کوڕەکەی دەبێتە بەگ چونکو

حکومەتی سەربەخۆیە • کە سوڵتان نامەی بۆ دەنێرێ بە نازناوی (جەناب) دەست پێدەکا • ئەگەر بەگ بمرێ و کوڕی نەبێ حکومەتەکەی دەدرێ بە یەکێکی دی لە خۆیان •

لە پاش تەماشاکردنی ئێرە بە سواریێ لە زێ پەڕینەوە و هاتینە شارۆکەی (حینێ) کە لە رۆخ زێیە و باخاتی هەیە ، خانوەکانی چین لەسەر چین و جوان رازاونەتەوە • لێرەوە بە ناو باخ و دارستاندا گەیشتینە قەڵای ( ئەرغنێ ) •

**قەڵای ئەرغنێ :**

ئەم قەڵایە پردێکی خنجیلە و دەروازەیێکی ئاسنی هەیە و بۆ حەسانەوەی هەشت نۆ سەعاتێك باشە ، بنیاتنەرەکەی ( سوڵتان ئەرغنێ ) کوڕی ( سوڵتان ئەوحەدوڵلا )ی عەباسییە ، خەڵکەکە بە هەڵە ( ئارخینێ) دەڵێن • ئێرە چەند شا و سوڵتان دەستاودەستیان پێکردوە ، لەساڵی ١٩٢١دا بە یارمەتێ (مەلا ئیدریس) خەڵکەکە خویان دا بەدەست بیقلیپاشان و کلیلەکانی قەڵایان بۆ هێنا ، جا لەسەر فەرمانی سولەیمانخان بۆتە پاتەختی بەگ و ئێستا سنجاقە• باجی بەگەکەی بۆ میری ٢٠ ئاقچەیە(٢) ،دە زەعامەت و ١٢٣ تیماری هەیە ، سەرۆکی چەرێ و بەگی ئاڵای هەیە • بەپێی قانۆن بە چەکدارەکانیەوە دوێ هەزار عەسکەری هەیە کە لە ژێر ئاڵای بەگدا دەچن بۆ شەڕ ، قازییەکەی سەد و پەنجا ئاقچەی هەیە ، قەڵادار و نەفەرەکانی قەڵا و کوێخای سوپا و سەرداری یەنیچەرێ و دارۆخە و میراوی شاری هەیە • شێخەل ئیسلام و نەقیبی ئەشرافی لە دیاربەکر دادەنیشن •

قەڵاکە لە رۆخی شەتولعەرەب لە زەوییەکدا بە بەردی تاشراو داندراوە و قەڵاییێکی جوانە ، جبەخانە و تۆپەکانی هی بەگە • لەبەر ئەوەی

---

(٢) شوێنی پارەکە بە سپێتی هێڵراوەتەوە .

لەسەر سنورە و ناو خێلاتە چەك و یارمەتی لە دەولەتەوە نادرێ • ترێ و شەراب ( مەی )ی ئەرغەنی بە ناوبانگە • یەکێك لە لقەکانی زێ لە چیاکانی ئەم قەلایەڕا دێتە خوار و بەژێر قەرەئامێددا تێدەپەڕێ •

لەم ئەرغەنییەوە بەرەو خۆراوا قەلای (چەرمك) یەك قۆناخ دورە • قەلا و شارۆکەکانی عەبدی هیر ، سێوەرەك ، رەهبە ، سەنروحا ، قەرەقایق ، کەڕکەڕ ، چونکوش ، سیفراز ، سورە ، کاختە ، حەسەن مەنسور ، بەهسەنی ، سەدربار و مەرعەشیش لەم دەور و بەرەدان •

ئەسپ و پێنج شیری شێخانی و قەتارێك ئێستری سوری بە دیاری بۆ بەگی ئەرغنی کە نامەی پاشام دایە باری دوسەد وشتر ئازوقە و پێنج نارد ، بۆ منیش ئەسپێك و پەنجا قرۆش و شیرینکی مەعماری دامێ • پاشان بەگی ئەرغنی بە سێ هەزار عەسکەری کوردستانەوە چو بۆ پێشوازی پاشا • بەرەو باکور هاتینە (باشخان) کە لە خاکی دیاربەکردایە •

بەگی ئەرغنی بە دیارییەکانیەوە گەیشتە خزمەت پاشا کەولی سمۆری خەلات کرا و لە خزمەت پاشادا مایەوە • عەسکەری پاشا زۆر بەرۆژ زیادی دەکرد و ئیبشیر پاشا پتر ترسی لێ دەنیشت • بۆ رۆژی دوایی پاشا نامەیێکی بۆ والی دیاربەکر (فیراری مستەفا پاشا) نوسی کە ئەو سێ و حەوت کیسە قەرزەی لەسەریەتی بیداتەوە ، بۆ ئەم مەبەستەش منی رەچاو کرد •

★ ★ ★

## له باشخانه‌وه چوونم بۆ دیاربه‌کر

پاشا به‌ره‌و ( ته‌رجیل ) و ( مفارقین ) که‌وته ڕێ که له‌م کاتی ده‌مه‌و به‌هاره‌دا که‌مێك له ناو چیمه‌نه‌کانی ئه‌وێدا بسێنێته‌وه تا ئه‌و خێوه‌ت و شتومه‌که‌ی له‌گه‌ڵ پیاوه‌کانی له دیاربه‌کر ماون بۆی بنێرمه‌وه ، مالاواییم لێکرد و لێك جیا بوینه‌وه •

که له باشخان ده‌رچوم ڕێگای قه‌ڵای چه‌رمکمان گرته به‌ر ، خانی (سیفیر دیکه‌ن) که‌وته لای ڕاستمانه‌وه • خۆم و ئه‌و ده پیاوه‌ی له‌گه‌ڵمدا بون ڕوه‌و قیبله هاتین له (ئۆرته خان) قۆناخمان گرت ، پاشان به‌ره‌و قیبله هاتینه شارۆکه‌ی (شه‌ربه‌تین) که کاول بوه و سه‌ر به دیاربه‌کره • ئێره له سه‌رده‌می خۆیدا زۆر قه‌وخا بوه ، ئێستا ته‌نیا دوسه‌د ماڵێك و مزگه‌وتێك و خانێکی گه‌وره و چه‌ند دوکانۆکه‌ی ماوه ، ته‌کیه‌یێکی کۆنیشی هه‌یه ، باوکی به‌گی ئه‌گیل (قچار به‌گ) لێره نێژراوه و قسن و گومبه‌زێکی جوانی بۆ کراوه ، هه‌رچی داهاتی ئێره‌یه کراوه به وه‌قفی ئه‌و خوالێخۆشبوه • دانیشتوانی موسڵمانن و قه‌ڵاکه‌ی زۆر لێ نزیکه •

دیسان به‌ره‌و قیبله هاتین بۆ پرده ڕه‌ش که زۆر قایم و ڕازاوه‌یه له‌سه‌ر ڕوباری ( دوکچدێ ) • که له‌م پرده په‌ڕینه‌وه به نێو به‌رده‌لان و لغاوه گیره‌ی به‌رده‌ڕه‌شدا ده‌هاتین که به‌کاری خوا شه‌ست و ڕه‌هێڵه‌یه‌کمان به‌سه‌ردا

باری خۆمان و وڵاخەکانمان هێزمان لێ بڕا ، بە هەر کولەمەرگێـك بـ
خۆمانمان گەیاندە ناو دیاربەکر •

**قەڵای قەرە ئامێد یا شاری دیاربەکر :**

لەسەر چۆنێتیی ناونرانی ئەم شارە زۆر قسەی جیاواز هەیە • دەڵێـر
ئەو کاتەی (وێنس پێغەمبەر) لە (موسڵ) بۆ زۆری تەقەلا دا کەس نەهاتـ
سەر دینەکەی ، ئەویش دڵی ئێشا و دوعای خراپی لێکردن ، مۆسڵ کاو
بۆ ، لەوێوە هاتە (دیاربەکر) و کەوتە رابەری خەڵك ، دانیشتوانی ئێرە بـ
بێ سێ‌ودو باوەڕیان پێکرد و هاتنە سەر ئاینەکەی • ئەو پێغەمبەرە زۆری
پێ خۆشبۆ و دوعای چاکەی بۆ کردن گوتی : « یاخوا شار و وڵاتەکەتـار
ئاوەدان بێ و دانیشتوانی هەر شاد و دڵخۆش بن و ماڵ و منداڵیان ئازا و
رەشید بن » ، نزیکەی حەوت ساڵ لە ئەشکەوتێکی چیاکانی ئێرەدا ژیا
ئەو سەردەمە کیژێکی جوان فەرمانڕەوا بۆ لەسەر دەستی وێنس پێغەمبەر
موسڵمان بۆبۆ ، لەبەر ئەوەی زۆر دەوڵەمەند بۆ، بە فەرمانی وێنس پێغەمبەر
ئەم شارەی بە بەردی رەش دروستکرد • جا چونکۆ بنیاتنەری شار کـچ
بوە مێژۆنوسانی عەجەم (دیار بیکر)ی پێدەڵێن واتا شاری کیژۆڵە ، بەڵا
مێژۆنۆسانی رۆم لەبەر ئەوەی دیوارەکانی بە بەردی رەش داندراوە (قەر
ئامێد)ی پێ دەڵێن و لە دەفتەری شاشدا وا نوسراوە •

ئەم شارە چەند دەستا و دەستی کردوە.، لە پاش نۆشیروان لەســەر
دەمی خەلیفە ئەبۆبەکردا خالید بە حەفتا هەزار کەسەوە هاتــە ســەری و
گرتی و ئەو کافرانەی تێیدا بۆن لە ترسان خۆیــان لە قەڵاوە هەڵداشتـ
خوارێ و هەپرۆن بە هەپرۆن بۆن • پاشان جارێکی دیکە کەوتەوە دەستی
کافران ، سوڵتان وەحدوڵلای عەباسێ بە سوپاییکی زۆرەوە هاتە ســەری
گەمارۆی دا ، لە پاش حەوت مانگ قات و قڕی کەوتە ناو قەڵا و دانیشتوانی

به پێی پەیمانێکی حەوت مادەیی خۆیانیان دا بەدەستەوە :

١ـ وەکو سەردەمی ئیمامی عومەر سەری یەك زێڕ جزیە بدەن •

٢ـ کلێساکانی ناو قەلا نەرووخێندرێن •

٣ـ قەشە و مەتران و پەتریکەکانیان باجیان لێ نەسەندرێ •

٤ـ بازرگانی ئەوانیش وەکو موسلمانەکان باج بدەن •

٥ـ لەناو خانوەکانی خۆیان و لە ناو قەلادا بمێننەوە •

٦ـ زیارەتگا و گۆڕستانەکانیان تێك نەدرێ و نەکرێنە باخ و باخچە•

٧ـ ڕێگای مێزەرە رەنگا و رەنگەکانیان لێ نەگیرێ •

پاش قبوول کرانی ئەم حەوت مەرجە قەلایان دا بە دەستەوە و ئێستاش هەر لەسەر ئەو پەیمانە بە ڕێوە دەچن • لەو ڕۆژەوە ئەم دیاربەکرە لە باوکەوە بۆ کوڕ ماوەتەوە و هەر خۆیان حکومەت بوون • لە زەمانی سولتان سەلیمی یەکەمدا کە ( سولتان مەلیك موزەفەر) فەرمانڕەوای دیاربەکر بوو ، پاش ڕۆیشتنی (سەلیم خان) بۆ خەزای چالدێران کوردەکانی دیاربەکر دەستیان بە چەتەیی و ڕاو و ڕووت کرد و لە ڕێگاکانی (کەماخ)و (تورجان) و (بایبورد) و قەلای (خانیجە)وە زۆریان زیان بە لەشکری موسلمانان گەیاند، ئەم هەواڵە گەیشتە سەلیم خان نامەیێکی زۆر نەرم و دۆستانەی بۆ فەرمانڕەوای دیاربەکر نووسی کە : «براکەم ، تکام وایە پیاوەتیمان لەگەڵ بکەیت و ڕێگەی ئەو کوردانە نەدەی خراپە بکەن و پێشیان بگری » ، فەرماندەی دیاربەکر کە ئەم نامەیە دەخوێنێتەوە لە وەلامدا بۆی دەنووسێتەوە «هەر کاتێ تۆڵەت لە شائیسماعیل سەندەوە ، وەرە تۆڵە لە دووجار سەد هەزار کوردە تفەنگدارەکانی دیاربەکری منیش بستێنەوە • » سولتان سەلیم دەڵێ مادام حاکمی دیاربەکر خۆی ئەم ڕێگایەی بۆ دانایین ئیشەللا وا دەکەین •

ئەوەبو لە شەڕی چالدێراندا عەجەم شکان و سوپای عوسمانی بە سەرکەوتویی گەڕانەوە ، لە ئەرزەڕۆمەوە ( محەمەد بیقلی پاشا )ی بە سەد هەزار عەسکەرەوە ناردە سەر دیاربەکر و گەمارۆی دا ، حەفتا شەڕی قورسیان کرد ، هەرچەندە دەروازەی چیا و دەروازەی ماردین بە گوللە توپ درزی تێکەوتبو بەڵام قەڵا هەر وەکو خۆی بو ، لەلای ماردینەوە سوپایێکی زۆر دەرکەوت و نامەبەران نامەییکیان بۆ بیقلی پاشا هێنا کە خوێندیەوە لە خۆشیانا باڵی گرت و گوتی « کوڕینە ، حەزرەتی ( مەلا ئیدریس ) فەرمانڕەوای ئامێدی کە لە چالدێران فریامان کەوتبو ئەوا لێرەش بە چل هەزار کەسەوە گەیشتە یارمەتیمان !• ئەمە سوپای ئەوە ، بابێن ئەوانیش لەملامانەوە بوەستن • » عەسکەرەکانی مەلا ئیدریس بێ ئەوەی گوێ بدەنە ماندویەتی یەکسەر چونە ناو سەنگەرەوە ، کوردەکانی ناو قەڵا کە ئەمەیان دی ترسیان لێ نیشت ، پاشان بەپێی ئاشتی‌نامەیێك قەڵایان دا بەدەستەوە • بە پێی ئەو پەیمانە هەمو کوردەکان لەگەڵ فەرمانڕەواکەیان لە قەڵا هاتنە دەر و چونە ماردین ، پاشان لەوێش خۆیان نەگرتەوە •

ئەم هەواڵە خۆشە لە دەشتی (تورجان) بە دەستی ( سەلیم خان ) گەیشت ، ئەویش دیاربەکری دا بەو سەردارە و عەمادیەشی بۆ هەتاهەتایە دا بە مەلا ئیدریس و بەم پێیە بڕیارنامە نوسرا ، لەسەر ئەمە مێژونوسانی رۆم لەمەڕ ئەم بەسەرهاتە دەنوسن «ئەم داگیرکردنەی سەلیم خان بە دەستی ئەبو شوارب محەمەد پاشا و بە هاوکاری مەلا ئیدریسی بتلیسی بوە » •

لە پاشترا کە سوڵتان سولەیمانخانی کوڕی سوڵتان سەلیمی رەحمەتی دەچو بەغدا بگرێ و هاتبوە ئێرە ، ئاو و هەوای دیاربەکری زۆر بەدڵ بوبو و گوتبوی « هەی ئاوەدان بێ قەرە ئامێدی خۆم » و مشتای دابونێ و بە سێ مانگ دە هەزار کیسە ئاقچەی سکە لێدا کە لێی نوسرا بو ( سوڵتان

سولەیمان کوڕی سەلیم خان خوا دەوامی بدا ، ئەم سکەیە لە قەرە ئامێد لێدرا ) ئێستاش لەملا و لەولا گەلێك لەم پارانە دەدۆزرێنەوە کە زیوێکی پەتییە، پاشان ئەم ویلایەتی دیاربەکرە جیا کرایەوە و بۆ بە ئەیالەتی وەزارەت •

**قانۆنی سوڵتان سولەیمان لەمەڕ ئەیالەتی دیاربەکرەوە :**

ئەیالەتی دیاربەکر وەزارەتێکی (تۆغلی)یە ، ئەو نامە و فەرمانانەی لە لایەن سوڵتانەوە بۆ والییەکانی دەنوسرێ بە ناوی دەستوری موکەڕەم ، موشیری ئەفخەم دەنوسرێ ، باجی وەزیرەکەی دوازدە جار سەد هەزار و شەشسەد و شێست ( ١٢٠٠٦٦٠) ئاقچەیە ، هەمۆی دوازدە سنجاقە و پێنج سنجاقی سەربەخۆشی هەیە ، لە نۆزدە سنجاق دوازدەیان وەکو ئەیالەتەکانی دیکە تیمار و زەعامەتە و بەگەکانیان لەلایەن دەوڵەتەوە دادەنرێن و لا دەبرێن ، بەڵام هەشت سنجاقیان هی بەگە کوردەکانە ، لە کاتی داگیرکراندا لەسەر پێشنیاری بیقلی پاشا ئەو سنجاقانە بە خانەدانی و بنەماڵەیی بۆ هەتا هەتایی دراوەتەوە بە خۆیان و ئەو بەگانە داندران و لابرانیان بۆ نیە ، دوای مردنیان کوڕیان یا یەکێك لە خزمانیان دەچێتە جێیان ، داهاتیان سەربەستە ، زەعامەت و بازرگانیان هەیە ، لەکاتی شەڕدا زەعیم و بازرگانەکان لەگەڵ فەرماندەی تیپ و سەرۆکی یەنیچەری لە ناو سوپای دیاربەکردا دەبن ، ئەگەر بۆ شەڕێك بانگ کران و نەهاتن سنجاقەکە دەدرێتە یەکێکی دیکە لە خۆیان •

جگە لەو سنجاقانە پێنج سنجاقی دیکەش هەن کە حکومەتی بڕیار دراوی سەربەخۆیان هەیە و فەرمانڕەواکانیان بە سەربەخۆیی زەعامەت و بازرگانی دەبەن بەڕێوە ، هەر چەندێك داهاتیان بێ هی فەرمانڕەوایە ، ئەو فەرمانانەی لە سوڵتانەوە بۆیان دێ بە نازناوی (جەنابی •••) دەست

پێدەکا • سنجاقەکانی عوسمانی لە دیاربەکردا ئەمـانەن : (خارپـوت) ، ( ئەرغەنێ ) ، (سێوەرەك) ، (نەسێبین) ، (حەسەنکێف) ، (چومۆشگەزەك)، (سعرد)، (مفارقین) (ئاقچە قەلای نسێبین)، (خاپۆر) و (شەنگار)• دیاربەکر پاتەختی پاشایە ، فەرماندەی ئەم سنجاقانە هەمۆیان بـەگی عوسـمانین • سنجاقە خانەدانەکانیش ئەمانەن : (سێغمان) ، (قولـپ) ، ( مـەهرانیە ) ، (تەرجیل) ، (ئەتاق) ، (پرتك) ، (چەپاقچۆر) و (چەرمك)• ئەمانـە بەپێی قانۆن خانەدانین و لە کاتی وەجاخ‌کوێرێ فەرمانڕەواکانیان دەبێتـە ملـکی عوسمانێ •

ئەو حکۆمەتە سەربەخۆیانەی لەنـاو ئەیالەتی ئامێـدان ئەمـانەن : (جەزیرە) ، (ئەکیل) ، (گەنج) ، (پالۆ) و (حەزۆ)• ئەمـانە سەربەخـۆن و نازناوی میر میرانیان دەدرێتێ ، بەلام هەر دەبێ لەگەڵ وەزیردا بچن بـۆ شـەڕ •

بە میری شار و میری پسان و میری پۆزان و میری قانجۆك و هـی دیکە نزیکەی سێسەد پیاوی لێهاتۆی هەیە ، دەفتـەرداری بازرگانـان ، دەفتەرداری کوێخا و دەفتەرداری مالێ هەیە ، باجی میرییەکەی ( ٤٠٣٩٩ ) ئاقچەیە ، لە ئامێدی پاتەختی پاشادا نۆ زەعامەت و ١٦٨ تیمار هەیە • لـەم سنجاقەدا بەپێی قانۆن بە جبەلەبەرەکانەوە دۆ هەزار عەسکەری چـەکدار هەیە ، بەلام بێ جبەکانی هەر حەوسەد کەسێك دەبن • سەرانسەری دیاربەکر لە کاتی شەڕدا سێ هەزار عەسکەری پڕ چەکی هەیە و پاشـا سێ هـەزار هەلبژاردەی تایبەتێ خۆی هەیە •

**باجی بەگ و فەرمانڕەواخانەدانەکانی ئەیالەتی دیار بەکر :**

باجی میرلیوای حـەزۆ ( ٢١٩٩٩٩ ) ، هـی مـیر لیوای ئەرغـەنێ (٢٠٠٥١٥) ، میری سێوەرەك (٤٠٣٠٤٣) ، میری ئاتاق (٤٤٧٢٠٠) ، مـیری

تەرجیل (٤٤٥٣٠٠) ، میری چەرمك (٢١٤٠٠٠) ، میری حەسەنکێف (٢٠٣٩٥٥) ، بنەماڵەی ئەگیل (٢٦٩٧٥٠) ، میری (چەپاقچور) (٣٧٠٠٠٠) ، میری (جومتوشگەزەك) (٣٣٤٢٢٣) ، میری (ستیغمان) (٣٤٩٠٠٧) ، میری (سعرد) (٢٢٣٧٧٢) ، میری (ئاقچەقەلا) (٢٠٠٠٠٠) ، میری (شار) (١٩١٥١٧)، میری (پسیان) و (پۆزان) (١٠٠٠٠٠) ، خانەدانی (قولپ) (١٦٦٦٦٨) ، میری (خانجۆك) (٤٢٧٨٠٠) ، میری (پەرتك) (٣٨٠٠٠٠) ، میری (گەنج) (٢٧٨٣٠٠) ، دەفتەرداری خەزێنەی قەرەئامێد (١٤٠٣٩٥) ، کوێخای دەفتەرداری دیاربەکر (١٠٠٩٢٤) ، دەفتەرداری زەعامەت ( ٨٠٠٠٠ ) ئاقچەیە .

**فەرماندە عەسکەرییەکانی ئەیالەتی دیاربەکر بە ریزە :**

(١) چاودێری گشتی و سەرداری مەزن وەزیری دیاربەکرە ، (٢) کوێخاکەی ، (٣) فەرماندەی جەزیرە ، (٤) فەرماندەی ئەگیل ، (٥) فەرماندەی گەنج ، (٦) فەرماندەی پالو ، (٧) فەرماندەی حەزۆ ، ئەمانە و ئەو هەژدە میرەی لەسەرەوە ناویان هات تێکڕا دەبنە بیستوپێنج فەرماندە، دوای ئەمان (٢٦) دەفتەرداری ماڵ . (٢٧) کوێخای چاوەشەکان ، (٢٨) دەفتەرداری زەعامەت ، (٢٩) ئەمینداری دەفتەر ، (٣٠) ئەمینداری چاوەشەکان ، (٣١) توسەری چاوەشەکان ، (٣٢) بەگی تیپ ، (٣٣) سەرۆکی چەری ، سەرەڕای ئەمانە لەهەر سنجاقێکیشدا یەك بەگی تیپ و یەك سەرۆکی چەری بژمێرین ژمارەی ئەفسەرەکان دەگاتە سێ و هەشت ئەفسەر لەگەڵ ...[٣] دەکاتە حەفتا ، (٧١) کوێخای سوپا ، (٧٢) سەرداری یەنیچەری ، (٧٣) قەلادار ، (٧٤) حسێن ئەفەندی رۆژنامەچی ، (٧٥) کار بەدەستی بەیتول ماڵ ، (٧٦) ویوادای شار ، (٧٧) ئاغای دارۆخە ، (٧٨) باجگری گومرگ ، (٧٩) ئاغای خەرجئەستێن ، (٨٠) باجگری ماڵان ،

---

(٣) پارەکە نەنوسراوە .

(٨١) شابەندەر ، سێسەد وردە بەگیش بخرێتە سەر ئەمـــانە لە دیـاربەکردا نزیکەی چوار سەد فەرماندە هەیە کە فەرماندەی عورفین •

شاری ئامێد مەولەوییەتێکی پێنسەد ئاقچەییە ، لەســەر فەرمـــانی سوڵتان مەحزەرباشێ و چۆخەدار باشێ هەیە ، لەبەر پاراستنی سامی خــۆی ئابای سەچاقلێ لە ئەسپەکەی خۆی دەدا ، نایبی لە هەرێمەکاندا هەیــە ، مەلای هەرێمەکان ساڵانە چل کیسەی رۆمییان دەدرێتێ ، پاشاش لەم ئەیالەتە بەربڵاوەدا سەد هەزار قرۆشی دەست دەکەوێ • هەرچەندە ئێرە کوردستانە و هەمۆیان شافعێ مەزەبن ، مفتێ و نــەقیب ئەشرافی مەزەبەکانی دیــکەش هەیــە •

**قەڵای دیاربەکر :**

لە رۆخی شەتول عەرەب لەسەر چیای کچ کە کێوێکی بەرزە بە بەردی رەش دروست کراوە ، ئەگەر چێ ئەو چیایە بەردیشـــە ، لای ژوورەوەکـــەی مێرگ و چیمەنێکی بەرینە ، بەری خۆرهەڵاتی قەڵا بۆ لای باکور رەوەزێکی ئەوەندە بەرزە سەر لە ئاسمان دەسوێ و ئەشکەوتی کـــچ کەوتۆتــە بـــن قەڵاوە ، جێ زیارەتگای وێنس پێغەمبەریش هەر لەوێیە ، ئەوەندە بڵنـــدە لە سەرەوە پیاو زات ناکا بڕوانێتە خوارێ ، بنەکەی ئەوەندە قوڵە دەڵێـــی شێـــوی دۆزەخە • بە هۆی رووبـــارەکەوە ئەمبەرەوبەری کراوەتـــە باخ و بێستان و پەرژین کراون ، ئەم باخاتە ساڵی شەش مانگ دەبێتـــە جێـــگای سەیران و رابواردنی خەڵکی شار ، ئەم زێ گەورەیە کاتێ لەو سەرەوە بۆی دەڕوانی ئەوەندەی جۆگەلۆکەیێك دێتە بەر چاو • بەم جۆرە ئەم لایەی قەڵا ئە ئاوا سەری گەیشتۆتە ئاسمان و لایەکانی دیکەی باکور و خـــۆراوا و قیبلەی زەوییێکی تەختە • دیوارەکانی یەکی چل گەزی شا بڵندن ، لـــە بنیشەوە دە گەزی بۆ کراوە بە بناخە ، قەڵاکەش چونکو بە بەردی رەش

کراوه ناوی (قەره ئامێد) یان لێناوه ، وەستای کارامه له شێوەی چوارگۆشەی لاکێشیدا بەرەو باکور درێژی کردۆتەوه ، به جۆرێك که هەمو قولله و ددانەکانی چاویان له یەکتره و لەکاتی گەمارۆدرانا یەکتر دەبینن و فریای یەك دەکەون • لەبەر ئەوەی قەلا لەسەر بەردی خار و رەوەزێکی یەکپارچه داندراوه ئەگەر دوژمن گەمارۆی بدا ناتوانێ له ژێرەوه کونی بکا یا سەنگەری بۆ بێنێته پێشەوه ، تەنیا مەترسیلەوه دایه گەمارۆ درێژه بکێشێت و قاتوقڕی بکەوێته ناو دانیشتوانی قەلاوه • لای خۆرهەلاتی لەبەر رەوەزه بەرزەکه پێویستی به خەرەند نیه ، بەلام باکور و خۆراوا و باشوری خەندەکی هەیه، له سوچی چوارگۆشەکانیدا بورجی وای هەیه دەلێی سەددی یاجوج و ماجوجه ، وەکو قەلاکانی دیکه سێ نهۆم و چوار نهۆم نیه بەلکو تاقه یەك نهۆمی قایمه و چوار دەروازەی ئاسنی تێخراوه ، دەروازەی لای باکور که دەروازەی چیای پێ دەلێن رێگای شەربەتین و ئەگیل و ئەرغەنی و چەرمك و خارپوت و پالوی لەسەره ، لای خۆراوا دەروازەی (رۆم) ه بۆ گورستان و کێوه **رەشەکان** دەچێ ، لای قیبله دەروازەی ماردینه و خۆرهەلات دەروازەی (نوێ) یه •

له قەلا بۆ خوارەوه له پرد بپەڕێتەوه و قەلاکانی مفارقین و پردی بەتمان بەجێ بێلی به یەك قۆناخ دەگەیته قەلای حەزۆ •

دەروازەیێکیش له قەلای ناوەوەدا هەیه تایبەتی پاشایه بەرەو خۆرهەلات بۆ سەر زێ دەکرێتەوه دەرگای (ئۆغرۆن) ه و رێگای گشتی نیه ، دیواری قەلا و ئەم دەروازانه هەموی ـ به شەقاوی خۆم ـ یازده هەزار هەنگاوه ، گۆشەی لای خۆرهەلاتی سەرای پاشایه و لەبەر ئەوەی چاڵ و چۆڵ و سەخت و هەلەموت بو نەمتوانی بیپێوم بەلام بۆم دەرکەوت که له دەروازەی چیاوه تا دەروازەی ماردین ناوی قەلا دو هەزار شەقاوه ، بەم پێیه ئەوەی لەسەر بەردەکانەوه پێوامان دو هەزار شەقاو بێ

چــواردەوری قەڵای قەرەئامێد دەکاتە چواردە هەزار شەقاو • قوژبنی لای باکوری ئەم قەڵایە کە بەسەر زێدا دەڕوانێ بە بەردێکی خار و رەشی ئەوتۆ هەڵچنراوە هەزار کوتکی ئاسنی لێدرێ کاری لێ ناکا و لە ناو ئــاگریشدا ناتەقێ ، شتێـکی سەیرە •

**قەڵای ناوەوە :**

تەواو چوار هەزار شەقاوە ، لە ناوەوە سەد و پەنجا ژۆر و گەلێــك دیوەخانی هەیە و سەرایێکی گەورەش • هەر وەزیر و وەکیلێك هاتبێتــە ئێرە ، ژۆر و گەرماو و حەوز و **فیچقەی** لێ زیاد کردوە و پەرەی پێــداوە تا ئەوەندەی گەورە و خۆش بوە • هەمۆ پەنجەرە و شانشینی‌یەکانی بەســەر شەتول عەرەبدا دەڕوانن یا لەسەر دۆڵی (گردە رەش)ن کە دیمەنێکی زۆر دڵگیری هەیە ، لەناو سەراکەدا دیوەخانێکی کۆن هەیە سوڵتانەکانی پێشو دروستیان کردوە ، نەخش و نیگارێکی ئەوتۆی تێدا کراوە کە وێنەی ئەمە مەگەر لە قاهیرەی میسر و هۆڵی قەلاوندا بەر چاو بکەوێ • بنیاتنەری ئەم سەرایە بیقلی پاشای وەزیری سوڵتان سەلیم بوە ، سەرایێــکی گەورەیە ، قەڵای ناوەوەی زۆر قایمە • ئــەو لایەی قیبــلەی کە دەڕوانێتــە شــار دەروازەیێکی ئاسنی هەیە هەمیشە تۆبەچێ وریای لەسەرە • ئاوی ئاشەکانی ئەم قەڵایە بە کاری خوا لەبن بەردێك دێتە دەر و پاش گێڕانی ئاشەکان دەچێتە ناو سەرای پاشا و لەوێوە لە دیواری قەڵاوە بە ناو دەلاقەیێــکی تەلبەنــد کراودا دەڕواتە خوار لەلای چیای کچەوە هەڵدەڕژێتە خوارێ ، لە ســەر بەردێکەوە بۆ سەر بەردێکی دی چەند تــاقگەیێك پێکدێنێــت و پاشــان تێکەڵاوی زێ دەبێ • ئاوێکی زۆر خۆشە •

**مزگەوتەکانی دیاربەکر :**

لە ناوەڕاستی شاردا پەرستگای کۆن و مزگەوتی مــەزن و هــۆی

انازێ دیاربەکر (مزگەوتی گەورە) هەیە • مێژوونووسانی رۆم لەسەر ئەوە یەکیان گرتووە کە ئەم پەرستگایە لە زەمانی (موسا پێغەمبەر)دا بنیات نراوە ، یەکێك لە کۆڵەکە سپیەکان ژوورێ بە عیبرێ لێی نووسراوە • ئـەم قەڵایــە کەوتبێتە دەستی هەرکەس ، ئێرە هەر بە پەرستگا ماوەتەوە • هەر کەس دوو رەکاعەت نوێژ لێرە بکا دڵی خەبەر دەدا کە خوا لێی قوبووڵ کردوە • دەڵێن ئەمەش لە ریزی مزگەوتی گەورەی (حەڵەب) و مزگەوتی ئەمەویێ ( شام ) و مزگەوتی ئەقسای (قودس) و ئەزهەری (میسر) و ئەیاسۆفیای ئەستەموڵە ، گەلێك نیشانەی وا هەیە دەیسەلمێنێ کە کلیسا بوە کراوە بە مزگەوت ، منارە چوار گۆشەکەی دیارە کە لەپێشدا بۆ زەنگخانە دروست کراوە ، مینبەر و میــحرابەکەی شێوەی کۆنە ، ناوەوەی بە چلچرا و قەندیل رازاوەتەوە ، کۆڵەکەی ورد و درشتی هەیە کە سێ نهۆم لەسەر یەك داندراون • هەر لەناو ئەم مزگەوتەدا مزگەوتی شافعییەکان جیایە و ئەوانەی شافعین دێنــە ئێرە ، مزگەوتەکە چوار دەرگای هەیە، شەو و رۆژ بێ نوێژ کەر نیە، لە هەشتا لایەوە دەرسی عیلم دەگوترێتەوە، لە چەند لای دیکەوە سۆفییەکان خەریکی زیکر و پاڕانەوەن ، حەوشەی دەرەوەی بە مەڕمەڕی سـپی فــەرش کراوە ، لــە ناوەراستی حەوزێکی دەزنوێژی لێیە لە پلوسکەکانیەوە دەزنوێــژ تــازە دەکرێتەوە ، ئاوەکەش لە کانی (حەمراوات) و سەرچاوەی (جۆگەی عەلی)ڕا دێ ، هەر چوار لای حەوشی مزگــەوت وەکو مزگەوتــی سولــەیمانیەی ئەستەموڵ کراوە بە سەکۆ و ئەم سەکۆیانە بە مەڕمەڕی هەمــە جــۆرەی سماقێ و زەنبورێ و یەرەقانێ داپۆشراون ، کۆڵەکەکانی سەرەوەیان باریك و ناوقەدیان ئەستوور و خوارەوەیان ئەستوورترە ، سەری ئــەم کۆڵەکانە بــە گومبەزی جوان هاتۆتەوە یەك ، سێ لای حەوشی ئەم مزگەوتە سێ دەرگای تێدایە • بەم زوانەش منارەیێکی چوارسوچیــان بۆ دروست کردوە • بــە کورتێ لە هەموو دیاربەکردا مزگەوتی وا گەورە نیــە ، لە ناوەوە جێــی دوو

هەزار کەس دەبێتـــەوە ، هەمو پـــایە و بن‌میچی گومبـــەزەکانی بـــە مـــز داپۆشراوە و لە خوتبەکاتیدا ناوی سولتان سەلیم خان دەخوێندرێتەوە •

( مزگەوتی پێغەمبەر ) دروستکراوێکی کۆنـــە لە نزیـــك دەروازەی چیا و شوێنێکی بە پیت و بەرەکەتە ، منارەیێکی چـــوار ســـوچی هەیـــە و گومبەزەکانی مزرێژ کراون ، ئەمیش لەلاییکەوە جێی نوێـــژی شافعیـــیان هەیە ، میحراب و مینبەر و شوێنی بانگدەرەکەی رازاوە و رەنگیشە ، لـــە حەوشەدا حەوز و فیچقەی هەیە • گوایا یەکێك پێغەمبەری لەخەوندا دیتوە و ئەم مزگەوتەی بۆیە دروستکردوە و ئەم ناوەشی لێناوە •

مزگەوتی (ئەسکەندەر پاشا) جوان و رازاوەیە و مزکاری کراوە ، منارەی هەیە ، ئەوقافی زۆرە و گەلێك کەس نانی لێ دەخوا ، مزگەوتێـــکی ئاوەدانـــە •

مزگەوتی ( بارام پاشا ) مزگەوتێکی مـــزکاری کـــراوە ، مزگەوتـــی (مەلیك ئەحمەد پاشای کورد) کە وەزیرێکی ئازا و پیاو چـــاك بوە بـــەڵام ئەوەندەی ئەم مەلیك ئەحمەد پاشایەی خۆمان ناودار نەبووە ، ئەم مزگەوتـــە لە نزیك دەروازەی رۆمە •

مزگەوتی (رەش) بنیاتنەرەکەی نەزانراوە ، شەو و رۆژ بێ نوێژکـــەر نیـــە •

مزگەوتی (ئیپاریە) کە گوایا بازرگانێکی چـــینی دروســـتی کردوە و هەفتا بار میشکی خوتەنی لەگەڵ قوڕەکەیدا شێلاوە و سواخی پێ کردوە ، بۆیە پێی دەڵێن ئیپاریە واتا بۆنخۆش ، لەکاتی هەوا ساردیدا دیوارەکانـــی بۆنی میشکی لێ دێ • مزکاری نیە ، هاتوچۆی زۆرە •

مزگەوتی (خسرەو پاشـــا) لای دەروازەی ماردینـــە ، زۆر رازاوە و

جوانە ، چونکو لە شوێنێکی قەڵەباڵغدایە نوێژکەری زۆرە • مزگەوتی (عەلی پاشا) لە گەڕەکی ساروەلی • مزگەوتی (حەسیر) لە نزیك کورتانی دروانە و نەمزانی کێ کردوێەتی ، مزکاری کراو و ئاوەدانە •

مزگەوتی (موعەللەق ــ هەڵواسراو) نەزانرا کێ دروستکەریەتی ، (تەیموری لەنگ) نیوەی لێ رووخاندوە • لەبەر ئەوە هەڵواسراوی پێدەڵێن کە منارەیێکی بەرزی چوار سوچی هەیە ، وەستاکەی ئەم منارە قورس و گەورەیەی لەسەر پێنج کۆڵەکە داناوە ، هەر چوار سوچی منارەکە یەکی لەسەر یەك کۆڵەکەیە بەڵام پاش بەرز بونەوە ناوەڕاست و قورسایی دەکەوێتە سەر یەك کۆڵەکە لە ناوەڕاستدا و تەنیا کۆڵەکەی پێنجەمە رای گرتوە ، ئەوانی دیکە بین یا نەبن فەرق ناکا ، جا بۆیە منارە هەڵواسراوی پێ دەڵێن ، لەبەر ئەوەی ئەم پێنج کۆڵەکەیە کەوتونە ناو دوکانی ئاسنگەرێك ڕێبوار باش بۆی دەرناکەوێ و سەرنجی راناکێشێ •

مزگەوتی ( شێخ عەزیزی رۆمی) تازە بنیاتە و لە نزیك مزگەوتی بارام پاشایە • لەم مزگەوتەدا زیکری خواجەکانی دەکرێت و خەڵکەکە حال دەیانگرێ • مزگەوتی (شەمسی ئەفەندی) کە مزگەوتی (کوڕی سین) یش پێدەڵێن ، هۆی ئەم ناوی کوڕی سینە ئەوەیە کە شەمسی ئەفەندی لە زگی دایکیدا بوە باوکی دەچێتە خەزا ، لە پێش رۆیشتنیا رو دەکاتە خوا و دەڵێ «خوایە وا من دەڕۆم، ئەم ئەمانەتەی زگی ژنەکەم بە تۆ دەسپێرم» ، کە لە شەڕ دەگەڕێتەوە دەبینێ ژنەکەی مردوە و نێژراوە ، بە خەڵکەکە دەڵێ « وەرن گلکۆکەیم پیشان بدەن ، من زگەکەیم بە ئەمانەت دابو بە خوا ، بڕوام وایە بۆی هەڵگرتوم » کە دەگاتە سەر گۆڕەکە سەلام دەکا ، لە ناو قەبرەکەوە دەنگی منداڵێك دەڵێ « عەلێکە سەلام شەڕکەری ڕێی خوا ، باوکی خۆم » ئەو خەڵکە وەکو شێتیان لێ دێ و بە پەلە قەبرەکە دەدەنەوە دەبینن کە منداڵێك لە تەمەنی سێ مانگیدا وەکو گوڵ جوان لەگەڵ تەرمی

دایکی راکشاوه و تەرمەکە مەمکی راستی بە ساخیَ مـاوه و ئەو منـداڵە دەیمژێ ، خوای گەوره هەمۆ شتێکی لەدەست دێ ، بە شەوی رەش لەسەر بەردی رەش رسقی مێروله دەدا چۆن منداڵێك بە ئەمانەت بەو ئەسپێرابیَ لەناو دەچیَ ؟ باوك باوەش بە کوژەکەیدا دەکات دەری دێنـیَ و گۆژەکە دادەپۆشنەوه ٠ لەبەر ئەوەی ئەو منداڵە یەکجار جوان بوه ناویان لێنـاوه شەمسیَ و بەهۆی لە گۆژ هاتنە دەرەوەی پێیان دەگوت (کوژی سـین) ٠ پاشان ئەم شەمسیَ ئەفەندییە بۆ بە « قوتب » و چەند کەشف و کەرامەتـی لیَ دەرکەوت ٠ بەپارەی حەڵاڵی خۆی ئەم مزگەوتەی دروست کرد و ئێستا پێی دەڵێن مزگەوتی ( کوژی سین ) ، واتا کوژی قەبر ٠

مزگەوتی (بیقلیَ محەمەد پاشا) کە لەمەیدانی نەزیـف پاشادایـە و بەخێراتی خۆی کردۆیەتی و خۆشی هەر لێرەدا نێـژراوه ، مزگەوتێـکی مزکاریَ و جوانە ٠ مزگەوتی (خالید کوژی وەلید) کە لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکردا ئێرەی گرتوه و ئەم مزگەوتەی بنیات نـاوه و کوژەکەشی لێره نێژراوه ٠ جا ئەم مزگەوتانە هەمۆ خوتبەیان تێدا **دەخوێندرێتەوه** ٠ مزگەوتی کۆلاّنانیشی زۆرن ، لەوانە مزگەوتی بالقیَ و مزگەوتی گەژەکی سارووەلیَ ٠

**فێرگەکانی :**

ئەو مزگەوتانەی لە سەرەوه ناومان هێنان یەکی یەك مامۆستای دەرس گوتنەوه و دۆ فێرگەیان تێدایە ، هەرە بەناوبانگەکەیان لە مزگەوتی گەوره (فێرگەی مەرجانیە)یە کە لە ناو مەلاکاندا پایەی تایبـەتیَ خـۆی هـەیە و مامۆستاکەی دەگاتە مەولەویەتیَ ٠ مامۆستا و فەقێی هەیە و لەبەر ئـەوەی وەقفی زۆره هەمۆ حوجرەکانی ئازۆقەی دیار کراو و گۆشت و مۆمیـان هەیە ٠ هەر لەم مزگەوتەدا فێرگەی شافعیەکانیش هەیە کە ئەویش ئاوەدانە٠ فێرگەی مزگەوتی ( پێغەمبەر ) فەقێی زۆره ، هەر کەسێك لێرەوه دەستـی

پێ کردنی قەت نائومێد نەبوە • فێرگەی (ئیپاریە) بەناوبانگە ، عیلمی (بەیان)ی تێدا دەخوێندرێ و فەقێیەکانی زۆ پێدەگەن و دەبنە خاوەنی عەیان و بەیان • لە فێرگەی مزگەوتی خسرەو پاشادا عیلمی کەلام دەخوێندرێ و فەقێیەکانی زۆر زمان پاراون ، لە فێرگەی ساروەلێدا عیلمی (فقە) دەخوێندرێ و دەرچووانی دەبنە مەلای شەرع • فێرگەی شێخی رۆمێ سۆفێ پێدەگەیێنێ • فێرگەی تەفسیر کە لەوێدا تەفسیرەکانی ( جەریرێ )، (تەبەرێ) ، (ئیبن مەسعوود)، (ئەبو لەیس) ، (بەغەوێ) ، (قازی) ، (دەیلەمێ)، (فەیزوللای هێندێ) و تەفسیری (ئەبو سعوود) دەخوێندرێ و مەلای زۆر زانای تێدایە •

لە هەمو مزگەوتەکاندا شێخێ قورئان خوێن هەیە کە قورئانیان لەبەرە ، بەڵام چونکو ئێرە کوردستانە ، وەکو عەرەبستان قورئانلەبەری زۆر نیە ، پێیان وایە ئەوەی شت لەبەر بکا نابێتە زانا بۆیە گوێ نادەنە لەبەر کردن ، عیلمی تەجوید ، دەخوێنن، و خوێندنەکەیان تا بڵێی تەواوە ، تەنانەت هەندێکیان خوێندنەوەی ئیبنو کەسیر و خوێندنەوەی سەبعە و خوێندنەوەی عەشرەش لەبەر چاو دەگرن و بەجێی دێنن •

هەر چەندە ئێرە وەکو ئەستەمۆڵ گومبەزی حەدیس گوتنەوەی نیە بەڵام لە هەمو مزگەوتەکاندا حەدیس بێژی گشتێ هەیە ، بە تایبەتێ ئیمامی مزگەوتی گەورەیە کە بە ئیمامە شێتە ناسراوە مەلایێکی گورەیە و زۆر بە زمانە ، عیلمی حەدیسی لە جامیعی ئەزهەر خوێندوە • حەدیس بێژ رەمەزان ئەفەندیش هەمو کتێبی موسلیم و بوخاری لەبەرە کە گوایا هەموی حەوت هەزار حەدیسە ، مزگەوتەکانی دیکەش هەریەکە حەدیس بێژی خۆی هەیە •

**تەکیەکانی :**

لە تەریقەی خواجەکاندا (تەکیەی شێخی رۆمێ) تایبەتێ یەك شوێن

نیە و گشتییە ، نان و چێشتی ئەم تەکیەیە بۆ هەمو ڕێبوار و ئاوارەکانە .
شێخەکەیان پیاوێکی پاك و ڕوخۆش و خوایی‌یە .

**کانیاوەکانی :**

لە هەمویان گرنگتر و باشتر (عەین حەمرە)یە ، سەرچاوەکەی لە خۆراوای دیاربەکردا لە کوێستانی کێوە ڕەشە ، دو قۆناخی بمێنێ بۆ شار بەژێر زەویدا گونج و کەرێزیان لێداوە و هێناویانەتە قەلاّی ئامێد ، لەپێشەوە بۆ مزگەوتی گەورە و لەوێوە بە سەر مزگەوت و خان و خانوبەرە و گەرماوەکاندا دابەش دەکرێت . زانایانی پێشو لۆکەیان خستۆتە ناو ئەم ئاوی حەمرەواتە و پاشان وشکیان کردۆتەوە و دیسان بە تەرازو کێشاویانەتەوە ، دەرکەوتوە کە لۆکەی ئاوی ئێرە لە هی مەعەڕە سوکترە و لەگەڵ ئاوی بەردەمی کۆنە سەرای ئەستەمۆڵ وەکو یەك وان، واتا ئەم ئاوە ئەوەندە سوکە . ئەم ئاوی حەمرەواتە بۆ لابردنی زەردویی و پەرکەم و تەنگەنەفەس ئەزموراوە ، تەنانەت یەکێك لە سوڵتانە عوسماتییەکان (ئیبراهیم خان) ناوبانگی ئەم ئاوەی بیستبو فەرمانی دابو ئاوی حەمرەواتی دیاربەکری بۆ بەرن ، لەوێوە سەرۆکی دەرکەوانەکانی خۆی ناردبو ، لەوکاتەدا مەلیك ئەحمەد پاشا والی قەرەئامید بوە ، کە فەرمانی سوڵتانی دەگاتێ دەیخاتە سەر سەری ، شەش قومقومەی زیو و شەش مز و شەش تۆتیا و شەش بەرد دێنن و یەکی دە وقیە ئاویان تێ دەکەن و زارەکەیان مۆری لێدەدەن و دەیدەنە دەستی سەرۆکی دەرکەوانان و دە کیسە پارەشی دەدەنێ جگە لەو شازدە کیسەیەی خەرجی دروستکردنی قومقومەکان کرابو و ئەم ئاوە بە پەلە بۆ سوڵتان دەنێرن ، بەکاری خوا ئەو ڕۆژەی ئاو دەگاتە ئەستەمۆڵ ڕۆژی چونە سەر تەختی ( سوڵتان محەمەد کوڕی ئیبراهیم خان ) دەبێ و ئەو ئاوانە بەو دەبڕێن . واتە ڕۆژی شەمە هەژدەی ڕەجەبی ساڵی هەزار و پەنجا ، سوڵتانی تازە یەکەمجار ئاوی حەمرەواتی خواردۆتەوە،

بە کورتی بلێین ئەم ئاوە بۆتە هۆی ناوبانگی دیاربەکر کە لە سالی ۱۹٤۱دا سولتان سولەیمانی خوالێخۆشبو ڕێگای بۆ پاك کردۆتـەوە و لە کێـوە ڕەشەوە هێناویەتی •

**کانی عەین عەلی :**

ئەم ئاوەش سوك و خۆشە • کانی (بالقلی)یش لە ناو شار هەلدەقولێ و دەڕژێتە حەوزێکی گەورەوە کە هەزاران ماسی مەلەی تێدا دەکەن ، بەلام ئەم ماسییانە کەس نایانگرێ بیانخوا ، چونکو لە پیاوە پێشینەکان چەنـد کەسێك کە گۆشتی ماسی ئێرەیان خواردوە شەپلە لێی داون و دەمولوتیان خوار بوە ، ئەم کاتییەش ئاوەکەی ساخە ، چونکو نەخۆشی دەپەڕێنێ زۆر کەس دێن خۆیانی تێدا دەشۆن ، ئاوی ئێرە دەچێتەوە مزگەوتی عەلی پاشا و لەوێوە دەڕواتە گەرماوی لای دەروازەی ماردین •

**ئاوی کانی قەلای ناوەوە :**

ئەم ئاوە ئەوەندەی حەمرەوات خۆش نیە ، دە ئاشی تەواوی لە بـەر نراوەتەوە و دەیانگێڕێ ، هیچ ولاتێك نیە قەلای ناوەوەی ئەوەندە ئـاوی هەبێ مەگەر سەرچاوەی جەننەت لە ئەرزەڕۆم و سەرچاوەی چل کانی لـە قەلای وان، لەسەر سنوری (بودین)یش لە نـاو قـەلای ئەستەرگۆنـدا کانیاوێکی وا هەیە لەناو ڕەوەزێك دێتە دەر و دەڕژێتە ناو زێی (دۆن) ەوە ئەویش بە ڕاستی دەلێی ئاوی حەیاتە •

**کانی چوار بەردە :**

ئاوەکەی ئەوەندە ساردە کەس ناتوانێ چوار بەردی یەك لەدوای یەك لەناو ئاوەکە دەربێنێ بۆیە ناوی چوار بەردەیان لێناوە • ئەم ئاوە پاکە لای مەیدانی نسوح پاشا بە بن دیواری قەلادا دەڕوا •

**کانی درزی پیرێژن :**

وەك ئاوی حەیات وایە • دەڵێن لەو سەردەمەدا کە هەلاکۆ ئێــرەی گەمارۆ داوە پیرێژنێك بە جادویی لە قەڵشتە بەردێك دەری هێناوە بۆیــە ناوی درزی پیرێژنیان لێناوە ، ئاوێکی خۆشە و لە کن دەروازەی رۆمەوەیە، قەڵای دیاربەکر بە هۆی ئەم هەمو سەرچاوانەوە خوا رازاندویەتییەوە و هەرگیز سەخڵەتی بێ ئاوی ناکێشێ •

لە دیاربەکردا گەلێك خانوبەرەی بەرز و بڵند هەیە ، لەوانــە مــاڵی حەفتا و پێنج کەس لە عولەما و مشایخ و وەزیر و وەکیل و ئەم جۆرانــەن کە بە زمان تاریف ناکرێن • لە کاروانسەراکانی یەکیان خانی مەلیك پاشــایە لە بەردەم دەروازەی رۆمدا ، خانوبەرەیێکی هێجگار زلە و دەڵێــی تــازە لەبەر دەستی وەستا هاتۆتە دەر ، هەمو گومبەزەکانی بە مز داپــۆشراون • جێی داخە کە دیاربەکر هەمیشە دەدرێتە دەست والی شێت و لێنەهــاتو ، ئەگەر کاربەدەستەکانی زانا بونایە ئەم پارچە خاکە بەپیتە دەبوە پارچەیێك لە بەهەشــت •

**کاروانسەرای بازاڕی ئەسپ :**

گومبەزەکانی بە مزی خوڵەمێشیڕەنگ داپۆشراون و ســەگوان و ساریجەی پاشای تێدایە ، لە خۆیان بەولاوە هەر کەس رێی تێی بــکەوێ سەگوانەکان وەکو سەگ پڕی دەدەنێ و لەتوکوتی دەکەن و ســاریجەکان وەك زەرگەتە پێوەی دەدەن •

**خانەکانی :**

خانی ئاوەدانی زۆرە ، لەوانە خانی حوسنێ پاشــا دەڵێی قەڵایــە و نەمزانی کێ بنیاتی ناوە • لە نزیك دەروازەی ماردینیش ( خانی بازرگانان) هەیە کە زۆر جوان و خۆشە • ژوری پیشەکارانیشی زۆرە •

**بازاڕی :**

بازاڕی حەسەن پاشا ، بازاڕی سوپا ، بازاڕی عەتاران کە هەر کەس لێرەوە بڕوا بۆنی خۆش دەبێ ، بازاڕی دەلالان ، بازاڕی ئاسنگەران ، بازاڕی چەلەنگەران ، بازاڕی گەوهەرفرۆشان ، بازاڕی زێڕینگەران، بازاڕی ئاسنگەران ، بازاڕی پێلاودروان ، بازڕی کورتاندروان ، بازاڕی قەزازان، بازاڕی بەزازان بە کورتی شێست جۆرە بازاڕی تێدایە ، بەلام لە بازاڕی سوپادا گوزەری کوتاڵ فرۆشان زۆر قەوخایە لەمسەر و لەوسەری دەرگای ئاسنی بۆ کراوە و پڕە لە ماڵ و کوتاڵی زۆر • ئیدی هەرچی کالا و ماڵ و کوتاڵ و گەوهەری بە نرخ پێویست بێ لێرەدا هەیە •

لە دیاربەکردا ئەو شیر و دەمانچە و قوڵنگ و تەور و تەوەرزین و خەنجەر و رمب و توکەتیرانەی دروست دەکرێن لە دنیادا بەناوبانگن ، ئاسنگەر و وەستاکار و مسگەرەکانی لە کاتی کارکردندا چەکوچەکانیان لەسەر ئاوازی مۆسیقادا دەوەشێنن و مەقامی سێگا و حوسێنی و ئیدیکەی پێ لێدەدەن و خۆشیان لە گەڵی دەڵێن ، هەر کەس گوێی لێ بێ پێی رۆیشتنی نامێنێ ، مزگەرەکانیان لە دروست کردنی قاپەکاندا و زێڕنگەرەکان لە کاری زێڕ و بەردی بەنرخدا بێ وێنەن و وەستای قەڵەمکاریان لە وێنە و نیگار کێشاندا پێش مانی و بەهزاد کەوتوون •

**دیمەن و رەنگ و رۆی خەڵکەکەی :**

هەوای دیاربەکر بەو پاکی و سازگاری و بێخەوشییە خواردنەوەی ئاوی حەمرەواتیشی هاتۆتە سەر ، دەمو چاوی دانیشتوانی سور هەڵگێڕاوە، زوربەیان دەستە بالا و بەخۆوە و رێکوپێکن ، تەمەنیان بگاتە حەفتا و هەشتا لە کار ناکەون ، زۆریشیان هەیە دەگاتە سەد سالی ، کوڕیان هێجگار جوان و خاوەنی بەژن و بالا و سور و سپی و قسە خۆشن ، کە دێنە قسە و

نوکته گێڕانەوە گوێگر دێننە سەما و پیاو لە هاودەمییان تێر نابێ •

لەم دیاربەکرەدا چەند شـاعیری قسەڕەوان و زمانپاراو هـەن کە هەریەکەیان (فزولی) و (ڕۆحی)یێکە بـۆ خۆی ، لەگەڵ زۆریان دانیشتم و ئاخاوتم ، بەڕاستی نموونەی ئەدەب و گەورەیین •

**کەوای پیاوان :**

بە زۆری سمۆر و کەوڵەکانی دیکە لەبەر دەکەن ، ئەتلەس و کیمخواش دەپۆشـن ، مامناوەندییەکانیان چۆقە و کۆنتۆش لەبـەر دەکەن و کـەم دەستەکانیان چۆقەی لەندەنیان لەبەردایە •

**جلکی ژنان :**

هەموو چارشێوی سپی بە خۆدادەدەن و پەچەش دەگرنەوە و کڵاوی بە زنجیری زێڕ و زیو دابەستراو لە سەر دەنێن و جزمە لە پێ دەکەن ، ژنی زۆر پاك و بەناموس و خاوەن زێڕ و زیو و خشڵیان هەیە ، بە قسـەی پیاو ماقوڵان لە دیاربەکردا سـەد و چل ماڵ گەرماویان لـە ماڵی خۆیاندا هەیە چونکو ژنیان نابێ بچێتە دەرەوە •

**میوانخانەی :**

جاران دیاربەکر حەوت میوانخانەی بوە کە ڕێبوار و غەریبە نانیـان لێ خواردوە و تێیدا حەساونەتەوە ، بەڵام بە هۆی خراپەی کاربەدەستـان ئەمڕۆ تەنیا میوانخانەی مزگەوتی گەورە ماوە ، تەکیەی شێخی ڕۆمیـش خواردن دەبەشێتەوە و تەکیەکانی دیکەش هەروا •

**گەرماوەکانی دیاربەکر :**

یەکەمینیان گەرماوی ئیپاریەیە کە ئاو و هەواییێکی خـۆشی هەیـە ، دوای ئەو گەرماوی (ئیشریك) لەم شارەدا بێ وێنەیە و خەڵك ناوەکـەی

به هەڵە دەکەن بە (ئەشك) • گەرماوی (ئەسـکەندەر پاشا) کە پەشتەماڵی پاك و ناتری وەستای هەیە • گەرماوی (کۆن) لە نزیك دەروازەی ڕۆمەوە لە هەمو گەرماوەکان گەورەترە و لە نزیك منارە هەڵواسراوەیە ، بەردەڕێژە و گومبەزەکانی مەڕمەڕن و زۆر جوان دروست کراوە • گەرماوی ( مەلیـك پاشا ) زۆر ڕوناك و خۆشە • لە نزیك دەروازەی چیا گەرماوی (زبلچی)ش گەورەیە • گەرماوی (ماردین)یش بە ناوبانگە قولەتێن و سەکۆی هەیە • لەناو بازاڕی حەسەندا گەرماوی (ئەسکەندەر پاشا) هەیە کە ئەم پاشایـە پیاوێکی زانا و ئەندازیاری بینا دروستکردن بوە ، لەسەر نەخشەی، خۆی و بە پێی بیرکردنەوەی گەرماوێکی ئەوتۆی پێکهێناوە کە بۆتە جێی شانازی دیاربەکر • بیقلی پاشاش گەرماوێکی لەسەر شێوەی کۆن دروستکردوە کە (گەرماوە کۆن)ی پێدەڵێن، دیوار و بن میچەکانی دڵۆپە ناکەن و سواخەکەی بۆنی خۆشی لێدێ • گەرماوی (بارام پاشا) هەیە کە ئەم پاشایە خەڵـکی غەزە بوە و ناردویەتی بەردی مەڕمەڕ و زەنبوری بە باری وشـتران بـۆ هێناوە ، لە قودس و غەزەڕا وەستای بانگ کردوە ئەم گەرماوە خـۆشەی پێ دروست کردون ، وێنەی ئەمە تەنیا گەرماوی دەفتەرداره لە شـام یـا گەرماوی عوسمان لە مەنفەلوتی میسردا• گەرماوی (چارداقلی)ش هەیە کە نازانم کێ کردویەتی بەڵام پاك و ڕوناکە • هەروەها گەرماوەکانی (دەروازەی نوێ) و (ناو قەڵا) •

ئەم گەرماوانە هەمویان بە زبڵ دادەخرێن و ئەوەندەش داخ دەبن کە پیاو لە سەعاتێك زیاتر خۆیان تێدا ناگرێ ، شـارەکانی دیـکەی ڕۆم کە گەرماو بە دار گەرم دەکەن وا داخ نابن ، ئەم گەرماو بە زبـڵ داخستـنە سودێکی دیکەشی هەیە کە زبڵ لە ناو شاردا بڵاو نەبێتەوە ، دەبینـی بـە قەرتاڵە و زەمبیل خڕی دەکەنەوە و بـۆ گەرماوەکانی دێنن و دەسـوتێ و

له ناو دەچێ • هەر دیاربەکر وا ناکا بەڵکو لە عەرەبستانیش گەرماو بە زبڵ دادەخەن •

### زێی شەتول عەرەب :

لە بارەی ئاوەکانی سەر ڕوی زەوی گەلێک قسە کراون ، ( ئیبن عەباس) دەڵێ چۆن لەشی ئادەمزاد دەماری پێدا بڵاوبۆتەوە ، ئاویش ئاوا بەسەر دنیادا بڵاوە ، (بەتلیموسی حەکیم) گوتویەتی لەسەر زەوی ( ٢٤٠ ) زێی گەورە و چل و چوار هەزار کانیاو هەیە ، دو سەد و چل زێیەکان درێژاییان لە نێوان پەنجا فرسەقەوە بگرە تا هەزار فرسەقە ، واتا نێوانیان لە پەنجا کەمتر و لە هەزار پتر نیە ، ئەوەی راستیش بێ ئەم زێی شەتول عەرەبە لەگەڵ فوراتدا نێوانیان پەنجا فرسەقە ، فورات برای نزیکی ئەم زێیەیە و لە (قوڕنە) یەکدیگیر دەبن ، چەند سەد ڕوبار تیکەڵاوی فورات دەبن کە لە هەمویان ئاو خۆشتر ئەم شەتول عەرەبەیە ، شەتیش و فوراتیش بە ئاو خۆشی ناوبانگیان هەیە ، پێغەمبەر مەتحی ئەم ئاوی فوراتەی کردوە و ئیمامی عەلیش گەلێکی بەم شەتوفوراتەدا هەڵگوتوە و زۆر گەورە پیاوی دیکە تاریفی ئەم دو ڕوبارەیان کردوە • لە پێشتردا باسی سەرچاوەی فورات و ئەو ڕوبارانەمان کرد کە دەڕژێنە ناوی ، ئیستاش باسێکی ئەم شەتەی برای دەکەین :

### شەتول عەرەب :

لە چیاکانی دیاربەکر سەر هەڵدەدا ، هەر لە سەرەتاوە لە چوار جێگا دێتە دەر و بە هەر چواریان دەڵێن شەت • ئەمە ئاشکرایە کە بە هەمو ڕوباری گەورە دەگوترێ شەت و ئەو جێگایەی لێی تێکەڵی دەریا دەبێ (مەرەجەل بەحرەین)ی ناوە ، جا لەبەر ئەوەی ئەم شەتە لە چوار سەرچاوە هەڵدەقوڵێ ، پێویستە باسی هەر چواریان بکەین •

**یەکەم سەرچاوە :**

لە دیاربەکرەوە رۆژە رێیەك بەرەو باکور لە پەنا قەلآی (پالو)دا باخێکی زۆر خۆشی هەیە کە لە کوردستاندا بە ناوبانگە و (باغن)ی پێدەلێن هەمو بەگەکانی پالو و گەورە پیاوانی جێگاکانی دی بۆ رابواردن روی تێدەکەن، ئەم باخە هی بەگی پالوە ، لە چیای پشتی ئەم باخە لــە نێوانی دو رەوەزە بەردا ئەم ئاوە سازگارە دێتە دەر کە لە مانگی تەموزدا کوڕی ئازا ناتوانێ سێ بەرد لە بنی ئاوەکە دەرێنێ ، سەرەڕای ئەم ساردیــیە وەکو بلوریــش رون و پاکە ، بە را ستی ئاوی حەیات خۆیەتی ، ئەوەندەش سوکە یەك بەرخ بخوێت و لەم ئاوەی بە سەردا بکەیت دەزبەجێ برسیت دەبێتەوە •

**دوەمین سەرچاوە :**

دیسان هەر لە نزیك ئێرەوە کێوێك هەیە بەناوی (تەحتی ماشــا) بــە لاقەدی گەلێ ئەرغەنییەوە ، لە ئەشکەوتی ئەم کێوە بە گرمەگرم و هــاژە هاژ دێتە دەر ، ئاوێکە وەکو چاوی قرژاڵ رونە و بۆ خۆشێ و پاکیش وێنەی نیــە •

**سێیەمین سەرچاوە :**

دۆلی (چنارلێ) هەیە کەوتۆتە نێوان ئەرغنێ و دەمــیر قــاپو • لــە کێوێکی بلندی ئەم دۆلە لە ئەشکەوتێك دێتە دەر • ئەمەشیان ئەوەندە پاکە دەلێی ئاوی نیلە . ئێرەش سەیرانگای وای هەیە خەلك روی تێدەکەن •

١ ئەم سێ لقەی شەت کە باسمان کردن لە ژێر پردێکی هێجگار بەرزدا کە ( بەردینج)ی ناوە یەك دەگرن و دەبنە زێیەکی گەورە ، پاشان لە خوار ئەو پردە ئاوی تەرجیلیش دێتە ناویان کە بە (شەتی تەرجیل) ناسراوە ، واتا ئاوەکانی (باغن) و (ماشا) و (دەمیر قاپو) و (تەرجیل) دەبنە یەك و دەڕۆن ، لە خوار پردی رەش روبارێکی دیکەشیان دێتە ناو کە هــەر چەنــدە لــە

کێوەکانڕا دێ بەڵام لەبەر ئەوەی لە لای پێچەوانەوە هـاتوە پێی نـاڵێن شەت • جا ئەم هەمو ئاوە لە خۆرهەڵاتی دیاربەکرەوە بە بن پردی کچـدا دەڕوا و باخ و باخاتی ئەو ناوە پاراو دەکا • ئەو کەڵەکانەی لە دیاربەکرەوە بۆ بەغدا و بەسرا دەچن لەسەر ئەم ئاوە بە حەسەنکێف و جەزیرەدا راسـت شۆڕ دەبنەوە • جا حەفتا پارچە قەڵا و شارۆکە و گەورە شار پـاراو دەکا و هەتا دەگاتە بەغدا سەد و پەنجا رۆباری دیکەی تێکەڵ دەبێ ، لە بەغداش بەرەو خوار رۆبارەکانی (دیالە) و (چرقە) و (حزب عەلێ) و هێ دیکەی دێتە سەر و لە ژۆری بەسرا لە پەنا قەڵای قوڕنە لەگەڵ فورات یەك دەگرنەوە و دەبنە یەك و لـە بەردەمی بەسرادا وەك دەریایان لێ دێ ، کەشـتییەکانی (هیندستان) و (پورتەقـاڵ) و (لوڕسـتان) و (مولتـان) و (ئینـگلیز) و (فەلەمەنگ) و (عومان) و (یەمەن) و (عەدەن) و (جیددە) و (حەبەش) دێن و لەبەر بەسرا رادەوەستن ، ماڵ دێنن و کاڵا بار دەکەن ، بەڵام زیـاتر وردە کەشتی عەجەم هاتوچۆ دەکەن شت دێنن و شت دەبەن ، بەسرا کانی مرواریيە، هەر بازرگانێکی رۆی تێ بکەی دەبینی لە دۆکانەکەیدا بە خەرمان گەوهەر و بەردی بەنرخی هەڵداوەتەوە ، جگە لەوانە لە بەنـدەرەکانی (لەحسـا) و (سەنعا) و (عەدەن) و (مۆهە) و (ئەحمەداباد) و (فەرەح ئاباد) و (دێو ئاباد) و (مەیمون مستەفا ئاباد) و (دانیـۆڵ) و (پیکوار)ەوە یـا لە ئەسکەلـەکانی (قەرەقا) و (فیلیپوت) و (دۆنقارقزە) و (دانیمـارکە)وە کەشـتی گەورە و گەمیە بایێیەکانی یەمەنێ ئەوەندە زۆر دێن کە باس ناکرێ ، ئەم شەتـول عەرەبە ئا ئەوەندە دەریایێکی بە نرخ و پڕ سودە •

شەتول عەرەب لە بەردەمی بـەسرەدا مەدد و جـەزری هەیـە ، لـە بەیانیانەوە هەتا نیوەڕۆ ئاو زیاد دەکا و پاشان هەتا ئێوارە دەنیشێتەوە ، جا هەر کەشتییەك نەبەسترابێتەوە دەنیشێ و دەچەقێ • ئەو جێـگایەی ئـەم

شەتول عەرەبەی لێ تێکەڵ بە دەریای عومان دەبێ (مەرەجەل بەحرەین)ی پێدەڵێـــن •

مەبەستی من ئەوەیە کە ئەم شەتول عەرەبە لە چیاکانی دیاربەکر لـــە چوار سەرچاوە هەڵدەقوڵێت و بەرەو خوار دەڕوا ، بە قسەی مێژوونوسان ئەم شەتە و فورات و زێی مراد لە سەرچاوەیانەوە هەتا تێکەڵ بە ( دەریای عومان) دەبن ، ورد و درشت دوو هەزار و شێست ڕوباریان تیکەڵ دەبێ • لە ئەتڵەسی هەیئەت نوساندا و لە پاپامۆنتە و ئەتڵەسی مینۆر و ئەتـڵەسی جوگرافی و ئەتڵەسی قالتون و ئەتڵەسی پادرە و نەخشەی کەشتیوانەکان ، ئەم ڕوبارانە گەورە و گچکەیان یەکە یەکە نوسراوە و ژمارەیان بۆ داندراوە• منیش کە خۆم هەر خەریکی گەشت و گەڕانم خوا یـاربێ توشـــی هـەر کامێکیان بێم باسیان دەکەم •

**ئەو ڕوبارانەی دەڕژێنە ناو شەتەوە :**

ڕوباری ( بەتمان ) لە ئاوی چیاکانی میافارقین ، حــەزۆ ، ئەتــاق و تەرجیل کۆ دەبێتەوە، ئاوی قەڵاکانی بتلیس و کفندر و ئاوی قەڵای زەرقێ و لقێکی خاپوریش وەردەگرێ و بـــە بن قەڵای حەزۆ و بە ژێر پردی بەتماندا دەکشێ چەند سەد گوند و شارۆکە و شار ئـــاو دەدا و لە نزیـــك قـــەڵای حەسەنکێفەوە دەڕژێتە ناو شەت •

**ئاوی هەرماس :**

لە چیاکانی نەسێبین دێتە دەر و پاش چەند قۆناخێك تێکەڵ بە ڕوباری ( سەرسار ) دەبێ کە ئەویش لە چیاکانی ئامێدی دەردەچێ و لەگەڵ ئـــاوی ( خەتیب ) لێك دەدەنەوە ، ئەم ڕوبارەش لە کێوەکانی کوردســـتان دێتـــە خوار و بە دەشتی چیای شەنگاردا دەڕوا لە نزیك قەڵا کۆنەکەی (تکریت) تێکەڵی دیجلە دەبێ • بەڵام ئەم سەرسارە لقێکی لێ دەبێتەوە بە تەنیشـــت

رۆباری هەرماندا دەڕوا پێش ئەوەی خاپور و قزقیا لێك بدەن هەرماس تێکەڵاوی خاپور دەبێ و پاشان لەگەڵ ئەو لقەی سەرساردا هەر سێکیان دەبنە یەك و لە نزیك ئاوی چیای کچ دەڕژێنە ناو فوراتەوە ٠

یەکێك لە رۆبارەکانی دی کە دێتە ناو شەت ( رۆباری عیسا )یە ، لە وڵاتی (کوفە) لە شوێنێك کە (وەهمە)ی پێدەڵێن ئەم ئاوی عیسایە لە فورات دابڕاوە و ناوی ( تورعەی مەلیك عیسا )ی لێ نراوە ٠

ئاوی ( سەرسەر ) ـ لە نزیك رۆباری عیسا لە فورات دابڕاوە ، خوا دەزانێ رەنگە ئەمیش بۆ ئاواکردنەوەی بیابان جیا کرابێتەوە ، لە نێوانی بەغدا و ( مەداین ) دەڕژێتە شەتەوە ٠

رۆباری مەلیك ـ لە نزیك ئاوی سەرسەر لە فورات جیا دەبێتەوە و چۆلستانێك ئاو دەدا و بە دۆڵی عیراقدا لە خوار شاری مەداینەوە تێکەڵ بە شەت دەبێ

ئاوی کوتێ ـ لە نزیك ئاوی مەلیك لە فورات دابڕاوە ، پاش پاراو کردنی چەند شوێنێك لەو چۆلستانە هەر لە نزیك رۆباری مەلیکەوە تێکەڵ بە شەت دەبێ ٠

ئەم دە پارچە رۆبارە هەموی لە لایەن عەباسییەکان و شایەکانی پێشوترەوە لە ئاوی فورات هەڵبەستراون بۆ ئاودان و ئاوەدانکردنەوەی ئەو دەشت و بیابانە ، یەکەم کەسێك کە دەستی داوەتە ئەم کارە ( مەلیك عیسا کوڕی عەلێ کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەباس )ی مامی مەنسورە ، لە سەردەمی ئەواندا رۆخەکان و ئەملا و ئەولای دیجلە و فورات بستێکیشی بە چۆلی نەمابو و زەوی بورەی تێدا نەبو ، کەشتی بەسەر ئەم شەتانەدا لە بەسرە و کوفە و مەداین و بەغدا و دیاربەکرەوە تا بیرەجك هاتوچۆی دەکرد، بەڵام ئێستا بەهۆی هەستانی ئاو و لافاوی چیاکان لە هەمو کاتێکدا ئەمەیان

بۆ ناکرێ ، تەنیا ئەو کەڵەکانەی بە هێزەی پێستە مەڕ و بزن سەر ئاو دەکەون لە دیاربەکرەوە بۆ هەر کوێیەك بیانەوێ دەچن •

لە ناو قەڵای (عەمادیە)دا دوو سەرچاوەی گەورە هەن کە یەکیان (سەر کۆهنانی مەزرکان ) و ئەوی دیکە کانی ( کەهیە خاتون )یان ناوە ، ئەم دوو ئاوە لە کێوەکانی (پەشیش) دێنە دەر و بە ژێر پردی (قوبخان)دا دەڕۆن تیکەڵی شەت دەبن •

چیاکانی قەڵای (زاخۆ) بە هەزاران کانییـــان لێ دەردەچێ ، ئەمـــانە تێکەڵی یەکتر دەبن و رووبارێکی گەورە پێك دێنن • کوردەکان لەسەر ئەم رووبارە گۆرانییەکیان هەیە بە مەقامی ( شورەگر ) دەیڵێن :

**کوردێ چۆمە جەزیرێ کەلەك بەردانێ**
**چۆمە خاپورێ خێوەت وەدانێ**

**ئا یایایا ئو یویو یویو ئو یو ییو یو**
**ئامان مروت عەزیزم بۆچی کلندو (؟) (٤)**

قۆناخێك لەولای خاپورەوە رووباری (خیزل) هەیە کە لە چیاکانی خیزل دێتە خوار تێکەڵی خاپور دەبێ و خاپوریش دەڕژێتە شەتەوە •

جگە لەمانە ئەگەر ئەو حەفتا سەرچاوانەی لە چیاکانی قەڵای (کواشێ) دێنە خوار یەکە یەکە بیاننوسین کتێبەکەمان دەبێتـــە کانینامە • ئەوەنـــدە هەیە لـــەم ئاوانە ئەوەی شیاوی باســـکردن بێ ئاوی (کواشـــێ) و ئاوی ( ئارمشت )ن کە لە چیاکانی ئارمشەوە دێن ، ئاوی ( کەلایێ ) کە لە چیاکانی کەلاییەوە دێ ، (ئاوی ئاکرێ ) لە چیاکانی قـــەڵای ئاکرێدا دێ ، ئاوی (سەلوانە)ش هەر لەوێوە دێ ، ئاوی (سندێ) لە چیاکانی هۆزی سندێ دێتە خوار و زۆر خۆشە ، ئاوی (زاخۆ) لە چیاکانی زاخۆ دێ •

ئاوی (کوواشێ) رووبار نیە بەڵام ئاوی چاکە •

---

(٤) ئەم وشەی (کلندو)یە کە بێگومان شـــێوەی نوسینەکەشی هەڵەیە بـــۆم ساغنەکرایەوە راستییەکەی چیە .

رۆباری ( زاربی ژۆرۆ ــ زەربی ئەعلا ) [٥] لــە ولاتی ئازەربایجانی عەجەمڕا دێ و نێــوان قەلای ( ئەبریل ) [٦] و قەلای ( موســڵ ) لە نزیك شارۆکەی (سندە) دەڕژێتە شەتەوە ، بەڕاستی ئەم (زوربلی)یە رۆبارێکی گەورەیە •

( زاربی خوارۆ ) رۆبارێکە لە ئەیالەتی ( شــارە زۆر )دا بە نێوان قەلای (ئەربیل) و قەلای ( رەقوقا )دا [٧] تێدەپەڕێ و دەچێتە ناو شــەت ، ئەم رۆبارانە هەمۆیان لە خۆیانەوە دەڕۆن •

**ئەو رۆبارانەی لە شەت هەڵبەستراون :**

رۆباری (قاتۆل) لە دیجلە جیــا کراوەتەوە و بەرەو خوار دەچێ لــە (قەسری جەعفەر)ەوە تێدەپەڕێ ، هەرچەندە قەســری جەعفەری پێدەڵێن بەلام (ئەلموتەوەکیل عەلەڵلا)ی عەباسێ بنیاتی ناوە ، رۆباری قاتۆل پــاش پاراوکردنی چەند سەد ئاوایێ لە خوارتر ناوی (نەهرەوان)ی لێ دەنێن و لە دامێنی گوندی (جرجریا) دەچێتەوە ناو دیجلە •

رۆباری (دوجەیلە) ــ لە کاتی خۆیدا خەلیفە ئــەم روبارەی بۆیــە کردۆتەوە کە چۆلستانی پێ ئاوەدان بکاتەوە ، چونــکو خۆی پارچەیێکی دیجلەیە عەرەبەکان بۆ بچۆك‌کردنەوە دوجەیلەی پێدەڵێن و لەناو خەڵکــدا بە دوجەیلان ناسراوە ، جاری یەکەمی کە لە بەغداوە هەڵبەسترا هەزار پارچە ئاوایێ پاراو دەکرد ، پاشان وردە وردە پڕ بوەوە و لم و خۆل پێشی گرت ، لە ساڵی ١٠٦٥ دا سەلەحدار (قەرە مورتەزا پاشا) هەزار کیســەی لە ماڵی خۆی تێدا خەرج کرد و ئەوەندەی منارەیێکی هەڵکەند ، نزیکەی سێسەد

---

(٥) مەبەست لە وشەکانی (زراب) و (زەرب) و (زەربلێ) روباری (زێ)یە .

(٦) (ئەبریل) هــەڵەی چاپییە و مەبەســت (ئەربیل)ە کە بە شاری هەولێر دەگوترێ .

(٧) وا بزانم ئەم (رەقوقا)یە شاری (داقوق)ی سەر بە کەرکوکە کە ناوەکەی کراوە بە (تاوخ) .

پارچە گوندی لەملا و لەولایەوە نیشـــتەجێ کرد و بە دوسـەد کیسە دای بەئاغایەك بە قوتەرات، گەلێك لە ئاوەکانی خۆرهەلات و خۆراوای دوجەیلە دەرژێنە ناوی و پاشان لەناو چۆلێ و لمدا وشك دەبن ، بەلام ئاوی (ئەهوان) لە لای خورهەلاتەوە ئاوی دیکەی نایێتە سەر • بە کورتێ ئەم دیجلەیە لـە هەمو لاییکەوە هەزاران ئاوی دێتە سەر ، وەکو کەلەکەوان حاجێ باغدۆ و زەنگە محەمەد بۆیان گێڕامەوە کە حەفتا هەشتا سالە بە سەر دیجلە و فوراتدا دەگەڕێن و هەمو کون و کەلەبەر و دەراوەکانی شارەزان •

لە خاکی عیراقدا نۆ روبار لە شـــەت جیا دەبێتەوە ، یەکەمیان روبارە (مەرە)یە کە لە شەت دێتـــە دەر و بەرەو خوار دەڕوا خاکی بەســـرە پاراو دەکات و دەچێتەوە نـــاو روباری (دیرە) ، دوەم روباری (دیرە)یە کە لـــە خۆراوای شەت هەلگێراوە پاش پاراوکردنی چەند شوێنێك لە ناو بیاباندا نوقوم دەبێ • گۆڕی (محەمەد کوڕی حەنیفە) لە رۆخی ئـــەم روبارەدا لە شارۆکە هەزار مالییەکەی دیرە دایە کە زوربەی دانیشتوانی شیعە و رافزێ و تەبەڕڕایین ، لەم تیرەیە هەر کەس بمرێ تەرمەکەی لێرە دەنێژن و مالەکەی دەبێتە وەقفی ئەم زیارەتگایە ، نێوانی روباری دیرە و مەرە چوار قۆناخە •

سێیەم روباری (شەبەق شیرین)ە کە شەش فرسەق لە خوار روباری دیرەوەیە ، ئەمیش گەلێك ئاوایێ ئاو دەدات و پاشان لەو چۆلەدا ون دەبێ•

چوارەم روباری ( مەعقەل)ە کە دو فرسەق لە خوار روباری شەبەق شیرینەوەیە و لای خوارو پـــاراو دەکا ، پاشـــان بەرەو بـــاشور دەڕوا لە نزیك کەلاوەکانی شاری (متینای) لەگەل روباری ئەبللە دەبنـــە یەك و پێیان دەلێن روباری (سفرای دیك) ، لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی عومەردا کە بەسرە گیرا فەرمانیدا بە (مەعقەل کوڕی بەشارە) تا سەبارەت بە ئاوەدانێ دەورو بەری بەسرە ئەم روباری سفرای دیکە جۆمال و گەورەتر بکرێ جا ئێستا پێی دەلێن روباری مەعقەل •

پێنجەم رۆباری (ئەبللە)یە کە چوار فرسەق لەخوار رۆباری مەعقەلە ، ئەم رۆبارە پاش تێپەڕینی لە قەڵای بەسرە لەبەردەمی شارۆکەی ئەبللەدا جیا دەبێتەوە و روەو خۆراوا بەرەو بیابانی مەکە دەڕوا ، پاشان بەرەو باکور دەگەڕێتەوە و دێتەوە سەر رۆباری مەعقەل و تێکەڵاوی جەزر و مەددی شەتول عەرەبی خوار بەسرە دەبێ ، جەزر و مەدد رۆژی دوجار رو دەدا ئاو دێتە پێش و دەکشێتەوە •

لە دەریاکانی (هیند)و (قەلزوم) و (هیندستان) و (پورتەقالستان) و (یەمەن) و (مەدیەن) و (سەفا)وە کەشتی دێن و لە رۆخی شەت و (عەبادان) لەنگەر داوێن و بەم رۆبارەدا دێنە بەسرە و بە رۆباری مەعقەلدا بەرەو ژور دەبنەوە • لە کاتی جەزردا دارژانی رۆبارەکانی ئەبللە و مەعقەل بە ئاشکرا دەبیندرێ ، ئەم زێیە هەمیشە مەدد و جەزری هەیە ، ئەم دو زێیەی دیجلە و فورات لە عیراقی عەرەبدا وەکو نیـو جغز وان کە رۆباری مەعقەل بۆتـە قوتبیان ، دیجلە و ئەبللە دەوری مەعقەلیان داوە کە لە پـاش سوڕانەوە بە دەوری سێ قۆناخ زەوی عیراقدا (دوڕگە گەورەکان)ی پێدەڵێن و ئەو خاکە (جەزرە) یا (جەزیرەی عومەر )ە •

شەشەم رۆباری (یەهود)ە کە سەرەتا و بنی چوار فرسـەقێکە ، ئەو شێوانەی ئەم رۆبارەیان بۆ هەڵبەستون ، زوربەیان لە سەردەمی هەلاکودا پڕ بۆنەتەوە و تەخت بون •

حەوتەم رۆباری (ئەبول خەتیب)ە کە لە نزیك رۆبـاری یەهودەوەیە ، ماوەی قۆناخێك دێتە دەر و کاتێك شەت هەڵدەستێ لەگەڵ رۆباری یەهود دەبنە یەك ، ئەمەش زۆر لای پڕ بۆتەوە و کەڵکی نەماوە ، بە جێگای وا بێ کەڵکدا دەڕوا کە تـەنیا چەند ماڵە عوربانێـکی لە قەراخ دەژین • ئـەو حاجیانەی لە بەسرەوە بۆ مەککە و مەدینە دەچن ئـەم عوربانانە رێگەیان پێدەگرن و روتیان دەکەنەوە •

هەشتەم رۆباری (مین)ە کە ماوەی یەك فرسەق لە بەسرا دوورە •
نۆیەم رۆباری ( قەندیل ) ە •

ئەم نۆ رۆبارە هەمۆیان لە شەتول عەرەبەوە هەڵگیراون ، هەندێکیان لە بیاباندا نوقوم دەبن و هەندێـك دەگەڕێنەوە دەریای بەسرە و کەشتی دەخڵ و دان هەڵگریان بەسەردا دەڕوا ، ئەمانە گەورەکانیانن ، جگە لەمانەش زیاتر لە هەزار تورعە لە شەت جیا بۆتەوە • بە مەبەستی ئاوەدان کردنەوەی دەورو پشتی شارەکانی (مەداین) ، (کوفە) ، (بەسرە) ، (قوڕنە) ، دەشتی (کەربەلا) و (بەغدا) لـە لایەن خەلیفە عەباسییەکان ( ئەلمـوتەوەکیل ) ، (ئەلموزەفەر) ، (ئەلموستەنسیر) ، (ئەلموقتەدیر) ، (ئەلموستەعسیم بیللا) ، (هارونە رەشید) و کوڕەکەی ( مەئمون ) زۆر هیمەتیان کردوە ئەم نـۆ کەندانەیان راکێشاوە و دەشت و بیابانیان پێ ئاوەدان کردۆتەوە ، بەڵام پاش ئەوان گوێیان نەدراوەتێ بە لم و خشت و خاڵ پڕ بۆنەتەوە و ئەگەر چاڵ و زەلکاویان مابێ بۆتە چەم و چخورد ، شێر و پڵنگ لانیان تێدا کردوە• ئەم درێژەدانەمان بە باسی زێ و رۆبارەکان ، لەسەر رونکردنەوەی سەرچاوەی دیجلە بۆ کە لە دیاربەکرەوە سەر هەڵدەدا •

**بەرهەم و دانەویڵەی :**

شاری دیاربەکر خۆی کەوتۆتە ناو رەقەتێك ، بەڵام ناوچەکانی دەور و پشتی حەوت جۆرە گەنمی دەنك درشت و جۆ و پاقلەی هەیە کە سەماری دە ئاقچە دەکا ، بە هۆی ئاوەدانی وڵاتەکەیەوە کێڵگە و زەوییەکانی زۆر بە پیتـــن •

**پیشـەکانی :**

لە دیاربەکردا دروستکردنی شیر ، دەمانچە ، خەنجەر ، چەقۆ ، جاوی سور ، سەختیانی گوڵدار ، پاپوج ، موست و جزمە زۆرە •

**خواردەمەنییەکانی :**

نانە گەنمی سپی ، کاهی بە قەیماخەوە ، کولێرەی سپی ، نانی مۆز ، هەنگوین ، گەزۆ ــ حەلوای خوایی کە لە ئاسمانەوە دەبارێتە سەر گەڵای داران ، زۆر شیرین و رەوانە ، چێشتی گەنمە ، چێشتی ماستاو ، ماستی عەلبە •

**میوەکانی :**

ئەو کاڵەکە بەستێنی‌یانەی لێرە هەیە بۆ خۆشی و شیرینی هاوتای نیە مەگەر کاڵەکی بۆتان بیگاتێ •

**خواردنــەوەکانی :**

ئاوی حەمرە کە هێجگار ئاسان هــەزم دەکرێ ، ئاوی شەنیش بــۆ خۆشی و پاکی بێ وێنەیە و هەمو جۆرە نەخۆشی سیسگ و دەغەزێك لەناو دەبا ، لە زەستاندا سەهۆڵێکی بلورینی هەیە •

**کار و کاسبی :**

زوربەی خەڵــکەکە بازرگانن و بازرگانی قورســیشیان تێدایــە ، هەندێکیان مۆچەخۆری میرین ، حاکمی ماردین و قەرەداخ و رۆژنامەچی و هی دیکە لە دیواندا خزمەت دەکەن ، هەندێکیش لە ناو شــاردا خەریکی پیشەی خۆیانن ، بە تایبەتی ئاسنگەر و قیومچی‌یەکان •

**زمان و شێوە ئاخاوتنی خەلکی دیاربەکر :**

داگیرکەری بەغدا (سولتان مراد خانی چوارەم) شایەکی زۆر قســە خۆش بوە و حەزی لە قسەی نەستەق و بە توێکڵ کردوە ، زیاتر ئەو شێوە تورکی‌یانەی پێ خۆش بو کە لە ئازربایجان و بەشی خۆرهەڵاتدا قسەی پێ

دەکرێ ، یەکێك لە هاودەمەکانی بە ناوی ( قاوەچێ زادە ) وەکو بلیمەتێك بوە لە لاسایی کردنەوەی خەڵکدا ، بیست زمانی زانیوە ، کاتێ باڵوێزی ئوتریش و پۆلۆنیا و چیك و فەرانسە و رۆس هاتون ئەم قاوەچێ زادەیە زۆر بە رەوانی قسەکانیانی تەرجمە کردوە ، کە هەواڵی هاتنی باڵوێزێك دەگەیشتە مرادخان ، قاوەچێ زادەی وەکو ئەوان دەڕازاندەوە و تەرجمەی پێ دەکرد، تەنانەت بۆ رابواردنی سوڵتان چەند پارچە شیعری بەشێوەی تورکمانەکانی دیاربەکر رێك خستبو بۆی دەخوێندەوە و دەی هێنایە پێکەنین •

**سەیرانگاکانی دیاربەکر :**

باخەکان و باخچە پەرژین‌کراوەکانی بەستێنی دیاربەکر بۆ خۆشی لە جیهاندا بێ وێنەن ، لە سەرە بەهاراندا دوای ئەوەی لافاو نیشتەوە و ئاو رۆن بۆوە ، خەڵکی دیاربەکر هەژار و دەوڵەمەندیان دەستی ژن و منداڵی خۆیان دەگرن و دێنە گوێ رۆبار ، هەر کەسە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا خێوەت هەڵ دەدا و لە قەراخ ئاو و بەستێنی چۆمەکە کاڵەك و شوتی و سەوزی دەچێنن ، جۆرە رەیحانەیێکیان هەیە لا سنوری باخچەکانیاندا بۆ پەرژین دەی‌چێنن ، بە ماوەی مانگێك ئەوەندە زیاد دەکا و بەرز دەبێتەوە ئەو دیوی رەیحانەکە نابیندرێ، کەپرەکانی دەم زێیان هەر چوار لاو سەربانەکەی بەم رەیحانانە دادەپۆشن ، جا کاتێ ئەم رەیحانانە گوڵیان کرد تۆوەکەی دەوەرێ و لە ژێرەوە سەر لەنوێ چینێکی تازەی لێ شین دەبێتەوە ، هەمو کەپرەکان جۆگە و ئەستێڵیان هەیە کە لە زێوە ئاویان بۆ راکێشاوە • بەم جۆرە حەوت مانگی رەبەق قەراخی ئەم زێیە دەبێتە کانگای هەرا و بەزم و رابواردن و گۆرانی و خواردنەوە، تەنانەت خاوەن پیشەکانیش لێرە خەریکی کاری خۆیان دەبن و هەرچی پێویستی خواردن و خواردنەوە بێ لەبەر دەستیاندایە ، ئەو کەسانەی کاریان لەناو شاردایە ئێواران دەست لە ئیش هەڵدەگرن و تیپ تیپ دەگەڕێنەوە باخەکانی دەم زێ •

کاڵەکی دیاربەکر زۆر گەورەیە و زۆریش شیرینە و بۆنی میسکی لێ دێ و هەر یەکەی چل پەنجا هۆقە دەردەچێ و رەنگی کەسکە ، لێرەوە بۆ شار و وڵاتان بە دیاریێ دەبرێ ، لەم کاڵەکانە بە دارچینی و مێخەك و برنج زەردەیێك درۆست دەکەن کە لە زەردەی هەنگوینی ئاتینە خۆشترە ، بەڵام شوتییەکانی زۆر باش نین • رەیحانەی ئێرە ئەوەندە هەڵدەستێ و ئەستور دەبێ کە لەپاش حەوت هەشت مانگ دارکەکەی دەکەنە ئەستونی خێوەت یا لە جیاتێ دەستەك بەکاری دێنن ، ئەم دارکە رەیحانانە کە لەبریتێ چیلکە ئاگری پێدەکەنەوە بۆنێکی خۆش بڵاو دەکاتەوە •

خەڵك شەوانە لەمبەر و لەوبەرەوە قوتیلە و چرا و فانۆس و مۆم بە شێوەیێکی جوان دەڕازێننەوە و لەسەر پارچە تەختەیان دادەبەستن و دەیهاوێنە ناو ئاوەوە ، ئەو شەوە تاریکە دەبێتە رۆژی رۆناك و بەم پێیە هەر خەریکی کەیف و بەزم و رابواردنن و دوعا بۆ دەوڵەت دەکەن •

سەیرانگای باخی قوس پارچە بەهەشتێکە بۆ خۆی ، تەنانەت ئەو کاتەی سوڵتان مرادی چوارەم هاتبوە دیاربەکر لەم باخە دابەزیبۆ و رای دەبوارد • ئەم سەیرانگایە لەم قەراخ رۆبارە ئەوەندە خۆشە تاریفی بە گۆتن و نوسین تەواو نابێ •

**شتەکانی دیکەی دیاربەکر :**

دانیشتوانی هەرێمەکانی دەرەوەی شار تێکەڵاوە ، کورد و تورکمان و عەرەب و عەجەمن ، لەناو شاردا ئەرمەنێ هەیە ، لەبەر ئەوەی قەڵای دیاربەکر لە قەراخ زێیە ، بە دوڕگەی دیجلەی دادەنێن ، چونکو خاکی نێوان دیجلە و فوراتە بۆیە ( جەزیرە )ی پێدەڵێن • بە هۆی سازگاریێ ئاو و هەواکەی دانیشتوانی جوان و ناسکن و منداڵەکانیان زیرەك و ئازان ، خەڵك بە کوردیێ و تورکیێ و عەرەبیێ و ئەرمەنیێ دەئاخەون ، زۆر غەریب دۆست و

قسه خۆش و به رابواردنن ، نوکتەزان و خاوەن قەڵـەمی تیژیـان زۆرە ، پیاوەکانیان راست و بەدینن و ژنەکانیان به ئامۆس و خاوەن ئەدەبن ، نـەك ژنیان بەڵکو کچی بچکۆلەشیان نایێتە ناو بازاڕ ، خۆ ئەگەر کچێك بـگاتە ناو بازاڕ خۆی و باوکی تەمێ دەکرێن ، ئا بەم ئەندازەیە بـە تەنگ ئامۆسی خۆیانەوەن •

**زیارەتگاکانی دیـاربەکر :**

له قەڵای ناوەوە له نزیك سەرای پاشا له شەقامی خالید قسنی پیاوێکی گەورە و پیرۆز هەیە بە ناوی (شەهید کوڕی خالیدی وەلید)، له سەردەمێکدا که خالید هاتۆتە سـەر دیاربەکر و له قەیسـەری رۆمی سـەندوە و بوە به فەرمانڕەوای ئێرە ، ئەم کوڕەی لێرە مردوە و لەم شـوێنەدا نێژراوە و قسنەکەی بۆتە زیارەتگای گشت لایێك •

زیارەتگای ( هەمزە بابا ) ــ له دەرەوەی قەڵایە •

شـێخی رۆمێ ــ پیاوی خوا و شـێخی گەورە و سەرچاوەی ڕازی خوایی‌یە، جەنابی (شێخی رۆمێ) که خۆی خەڵکی شاری ورمێی ئازەربایجانە، باپیرانی ئەم شێخە ( تۆچغا سوڵتان ) و ( شۆری سوڵتان ) له ورمێ نێژراون، خوا یاربێ هەر کاتێ چوم بۆ ئەولا باسی ئەوانیش دەنوسم • ئەم پیـاوە گەورەیە که خۆی هێجگار دەوڵەمەند بوە زیاتر له چل هەزار مریدی هەبوە و ناوبانگێکی تازەی داوە به تەریقەتی خواجەگان •

هوێ شەهیدکرانی شـێخی رۆمێ ــ له سـەردەمی سوڵتان مرادی چوارەمدا پیاو خراپ و دوژمنەکان به گوێیاندا چرپاندبو که گوایـا شێخی رۆمێ له دیاربەکر نیازی وایە به ناو مەهدێتییەوە هەستێتە پێ و بۆ ئـەم مەبەستە چل هەزار دەروێشی ڕوت و قوتی له خۆی خڕ کردۆتەوە • سوڵتان

مراد دەڵێ جارێ با بمێنێ • چوار ساڵ پاشتر کە دەچێ بەغدا بگرێ لە نزیك
دیاربەکر لە قەراخ ڕۆباری مراد پیاو ماقوڵانی شاری دیاربەکر دێنە خزمەتی،
شێخیش زۆر بێباکانە دێتە کن سوڵتان و دەڵێ «سەلامو عەلێك خونکار»
وشەی خونەکە زۆر درێژ دەکاتەوە ، سوڵتان دەڵێ « یا شێخ ئەم وشـەی
خونەت بۆ وا درێژ کردەوە ؟ » شێخ دەڵێ « شاهم لەبەر ئەوەی تۆ دەچی
بۆ بەغدا و دەیگریت و تۆڵە لە دوژمنانت دەستێنیتەوە و خوێن دەڕێژی »
سوڵتان کە دەبیسێ دەڵێ ( بەغــدا دەگری ) زۆری پێ خۆش دەبێ و لێی
دەپرسێ « یا شێخ ، تۆ بڵێی بە ساغی بگەڕێمەوە ئەستەموڵ ؟ » شێخ دەڵێ
« بەڵێ ، دێیەوە ئەم دیاربەکرە و هەندێکی دیکە خوێنی ناهەق دەڕێژی و
دەچیەوە ئەستەموڵ » • سوڵتان دەیەوێ چاکەی لەگەڵ بکا بەڵام ئەو هیچی
ناوێ ، تــەنیا داوای کەم کردنــەوەی باجی خانوانــە و جزیەکان دەکا کە
سوڵتانیش بەقسەی دەکا •

مراد خان بەرەو بەغدا دەڕوا و لەوێ پاش شەهیدبونی محەمەد پاشای
تەیار بەغدا دەگرێ • لــە گەڕانەوەدا دێتەوە دیاربەکر و چاوی بە شـێخ
دەکەوێ ، دەیەوێ پارەی بداتێ شـێخ هیچی لێ وەرناگرێ ، دیســان دو
زمان و شۆفارەکان دەچنە بن کلێشەی ســوڵتانەوە و وای تێدەگەیێنن کە
« ئەم شێخە کیمیا دەزانێ و دە هەزار کیسە زێڕی هەیە ، هەر کاتێ ئارەزو
بکا تەواوی قاپ و قاچاغی مسی مریدەکانی دەکا بەزێڕ ، ئەگەر ڕۆژێك ئەم
کابرایە بیەوێ یاغی ببێ مەترسیێکی گەورە ڕو دەدا ! » دیسان سوڵتان
گوێ ناداتێ •

ڕۆژێك لەگەڵ شێخ دادەنیشێ لێی دەپرسێ « یاشێخ تۆ بڵێی عیلمی
کیمیا ڕاست بێ ؟ » شێخ دەڵێ « بەڵێ خونکاری من ، کیمیا کاری مشایخانە،
بۆ ئەوەی نەفسی خۆیان دابمرکێننەوە دەنکە زێڕێکی پەتێ بە کیمیا دروست

دەکەن و دەیخۆن ، ئەوانەی پیاوی خوان کیمیایان بۆ ئەوە دەوێ دەنا هەمو گەنجی قارونیان بەلاوە هیچە • » سولتان دەڵێ « خۆزگە کەسێکم بدیایە کە ئەم شتە دەزانێ چونکو من بڕوام بە شتی وا نیە •» شێخ دەڵێ «ئەگەر لێپرسینەوەی تێدا نەبێ من کارێکی وا دەکەم لەبەر چاوی خۆت ئەم کارە بکەن • »

مراد خان دەچێتە ماڵی شێخ و دەرگا لە خۆیان دادەخەن ، بە رێکەوت کیژی ( کوڕی مەعانی شامی ) میری درۆز کە بۆ جوانی و فێڵبازی لە جیهاندا بێ هاوتا بوە لە ناو حەرەمی شێخدا دەبێ ، دێتە خزمەت سولتان و دوای گەلێك قسە و دوعا خوێندن هەر وەکو لە باوکی خۆی فێر بوە ئاگرێك دەکاتەوە و قەنتارێك مس دێنێ دەیتوێنێتەوە و ئەوەندەی دەنکە نیسکێك ئیکسیری تێ فڕێ دەدا دەزبەجێ ئەو مسە دەبێتە زێڕێکی پەتی • شێخ لەو زێڕە چەند دەنکێك دروست دەکا خۆی دەنکێك دەخوا و سێ دەنکیش دەدا بە مرادخان دەیخوا ، ئەو شەو و رۆژە هیچ خواردنێکی بۆ ناخورێ • جا مراد خان دڵنیا دەبێ کە گوتەی شۆفارەکان راستە ، پیاو دەنێرێ شێخ و کیژی کوڕی مەعان لە ماڵی خۆیاندا دەخنکێنن و لە دەرەوەی دەروازەی رۆم دەی نێژن • پاشان مراد خان دەگەڕێتەوە ئەستەمۆڵ زۆری پێ ناچێ دەمرێ •

ئەم بەسەرهاتە مەلیك ئەحمەد پاشا بۆی گێڕامەوە کە لەو رۆژەدا سەلەحداری مراد خان بوە و پاشان کراوە بە والی دیاربەکر • چونکو باوەڕی بەم شێخە هەبو زۆر جار دەهات زیارەتی دەکرد •

قسنی ( شێخ موسلیحەدین مەلا عەزیزی لاری ) ــ کە خەلکی لاری هیندستانە ، پیاوێکی زانا و دنیاگەڕ بوە ، بە سەیاحەت هاتۆتە رۆم و بوە بە هاودەمی سولتان و ناوبانگی بلاو بۆتەوە ، دوایی لە مزگەوتی خسروییەی

دیاربەکردا بوە بە سەجادەنشین ـ پۆست نشـتین ـ و تا مردوە شێخایەتی کردوە ، ئێستا لە کن شێخی رۆمی نێژراوە •

جگە لەمانە دیاربەکر زیارەتگای دیکەشی هەیە ، بەڵام ناسراوەکانیان ئەوانە بۆن کە ناومان هێنان •

هەر جـاریٚ رێم کەوتبێتە دیـاربەکر ، لەگەڵ (فیراری مستەفا پاشا) و پیاو ماقولانی ئێرەدا دەچۆین بۆ راو و گەڕان و رابواردن ، بەڵام ئەمجارە کە لەگەڵ مەلیك ئەحمەد پاشادا بۆ فرمان هـاتۆم و خێوەت و کەلوپەلـی پێویستمان پیٚ نیە هەروا ماینەوە ، والی مستەفا پاشا بە چل و حەوت هەزار عەسکەرەوە چوە بۆ دەشتی ماردین و شەنگار بۆ ناوبژی کردنی شێخی عارەبی شام ( شێخ عەلی فارس )و هۆزی (تەی) کە بە شەڕ هاتون ، منیش بۆ ئەوەی گەشتێکم کردبیٚ و فرمانەکەشـم بەجیٚ هێنابیٚ ، لەگەڵ دۆ سەد کەسـێك هاوڕیٚ و دەستوپێوەندم لە دیـاربەکرەوە بەرەو قیبـلە رۆم کردە قـەڵای ماردین و شەنگار •

## ڕۆیشتنم بۆ قەڵای ماردین و شەنگار

که له دیاربه‌کر ڕێ کەوتین زێ کەوتە
لای خـۆرهەڵات و بـەرەو جەزیرە
هاتینە گوندی (گوگسۆ)ی سەر بە
دیاربەکر .

## جەزیرەی گەورە

پێش ئەوەی خوای گەورە ئـەم دنیایە دروست بکا ئـەم جەزیرەیە ئاوەدان بوە و بەهەشتێکە لە نێوانی شەتولعەرەب و فوراتدا . یەکەم لای باکوری قەڵای خارپوتە و قەڵای (پرتك)یش کە لەناو کوردەکانی ئیزۆلیدایە. سەرێکی ئەم جەزیرەیە بەرەو خوار بۆ لای قبیلە شۆڕ بۆتەوە تا دەشتەکانی بەغدا و کوفە و کەربەلا و لەوێشەوە دەگاتە قەڵای قوڕنە ، واتا جەزیرەیێکی زۆر پان و بەرینە کە درێژایی چل و شەش قۆناخ و پانایی لە سێوە تا پازدە قۆناخە ، لە ناو ئەم جەزیرەیەدا سەد و حەفتا و شەش پارچە قەڵای ئامادە و قایم و پتەو هەیە کە لەمانە حەفتا و شەشیان لە سەردەمی هەلاکۆ و تەیمۆری لەنگدا ڕوخاون. ئەو قەڵایانەی ئەمڕۆ بە ساخی و ئاوەدانی مابنەوە ئەمانەن:

(دیاربەکر) ، (ئەگیل) ، (ئەرخەنی) ، (خارپوت) ، (پرتك) ، (ساخمان)، (چومۆشگەزوك) ، (چەپاقچور) ، (گەنج) ، (ئەتاق) ، (جسقە) ، (قوڵپ) ،

(تەرجیل) ، (مەهرانیە)و (مۆشـس) کەوتونە لای باکور ، قەڵای (پالۆ) لـە دەرەوەی رۆباری مرادیەدایە ، مەلاتیەش بە دەرەوەی جەزیرە دەژمێردرێ •

(چەرموك) ، (عید هر) ، (چەنكوش) ، (سـمیات) ، (سـن رۆحە) ، (رەحیە) ، (سێوەرەك) ، (حەدیسە) ، (خەزە) ، (عانە) ، (دێر) ، ( سەلە ) ، (مەرقیسا) ، (رەسافە) ، (رەقە) ، (حەرران) ، (حەساد) ، (روخا) ، (قەڵای رۆم)و (بیرەجك) هەمویان لەناو ئەم خاکە پیرۆزەدان •

(ماردین) ، (حەسەنكێف) ، (خاس تەپە) ، (شەنگار) . (تەل هەوار) ، (موسڵ) ، (نەسێبین) ، (جەزرە) ، (ئامیدێ) و (ئاکرێ) لای خۆرهەڵاتن و لە دەرەوەی جەزیرەدان •

ئەو شوێنەی شەڕی (سەفین) لە نێوان (ئیمامی عەلێ)و (عایشە)ی لێ کرا ئێستا قەڵای جەعبەری لێ دروستکراوە ، هەرچەندە کەوتۆتە خۆرهەڵاتی فورات دیسـان هەر بـە جـەزیرە دەژمێردرێ • قـەڵاکانی ( هێزان ) و (ماکسین)و (تەل جەزیرە) و (کفر توتا) و (بەلەدۆل خەتیب) و (شاری خدر)و (حەدیسە) لە ناوەڕاستی جەزیرەدان • قەڵای (تکریت) بە جەزیرە دادەنرێ و قەڵای (قوشلەر)یش هەروا •

پاش حەسانەوەمان لەو گوندە بەرەو قیبلە بـە ناو بەردەلانێکدا بەو هەوا گەرمە رێگامان بڕی و لە دەربەندی ( زەر زیوان ) قۆناخمان گرت کە شوێنێکی زۆر پڕ مەترسێ و نائەمینە ، پەنا بەخوا • باشور و لای قیبلەی دەشتی ماردین و شەنگارە • لێرەوە هاتینـە گوندی (مالون)و لەوێشەوە بەرەو باشور بە حەوت سەعات گەیشتینە زیارەتگای (شـێخ زۆلێ) پاشان هاتینە قەڵای (ماردین) •

**قەڵای ماردین یا تەختی دارا :**

مێژوتوسانی رۆم و وێنان بە پێی بڕوا مەسیحایەتییەکەی خۆیان زۆر شتی خەیاڵییان لەسەر ئەم قەڵایە توسیوە ، بەڵام ( مەقدیسی ) دەڵێ هۆی بنیات نانی ئەم قەڵایە (وێنس پێغەمبەر) بوە ، چونکو ئەو لە وەرزی زستاندا لە شاری (ئەلخەتیب)ی نزیك موسڵ دادەنیشت و هاوینان دەهاتە هەوارگەی چیاکانی ماردین • ئێستا ئەشکەوتێك لە چیای ماردیندا هەیە تەکیەی وێنس پێغەمبەری ناوە ، ئەو سەردەمە بەم کێوەیان دەگوت ( چیای قوچ ) ، هەژدیهایەك لە ئەشکەوتەکانی پەیدا بوبو چەند هەزار کەسی لە ئومەتی وێنس پێغەمبەر خواردبو ، ئەوانەی دژی ئەو پێغەمبەرە بون داوایان لێکرد با ئەو هەژدیهایە بکوژێ تا ئەوان باوەڕی پێ بکەن ، ئەویش بە یەك بەرد هەژدیهاکەی کوشت و سێ هەزار کەس بە جارێ هاتنە سەر دینەکەی و لە دەور و پشتی ئەشکەوتەکەی ئەودا خانویان کرد و کەوتنە کاسبی کردن ، رۆژ بە رۆژ دەوڵەمەند بون • جا کێوەکەیان ناونا ( کێوی مار ) و بە شارەکەشیان دەگوت (ماردین) •

ئەم قەڵایە لە نێوان چەند شایەکدا دەستاودەستی کردوە و سەردەمێك پاتەختی (دارا) بوە ، دارا ئەم شوێنەی زۆر بەدڵ بو هاوینان لێرە خەریکی راو و رابواردن دەبو و زستانان دەگەڕایەوە شاری (دارا) لە نزیکی (نەسێبین) • پاشان کە (ئەسکەندەری وێنانی) دارای شکاند و بو بە سەرداری ئازەربایجان و ئێران و توران ، لەم ماردینەدا گەلێك دێری گەورە گەورەی دروست کرد • لە زەمانی (یەحیا پێغەمبەر) دا بتخانەیێکی گەورەی (بەختونەسر) لە ناو ماردیندا هەبو ، ئەو بەختونەسرە بۆ داوای کوشتنی یەحیا لە ماردینەوە پێدا هات (حەڵەب) و (شام) و (بەیتولمەقدس) و (سەفەد) و (عەسقەلان) و خاکی میری هەمو کاول کرد و گەڕایەوە قەڵای ماردین • لەبەر ئەوە مەسیحیەکان زۆر بایەخ بەم شاری ماردینە دەدەن • لە سالی

١٧٩٥دا (تەیموور) سێ ساڵ ئێرەی گەمارۆ دا و هیچی بۆ نەکرا. ناچـار ڕووی کردە ولاتی ڕۆم • لە ٩٢٠ پاش سەرکەوتنەکەی (چاڵدێـران) ( سولتـان سەلیم خان ) بیقلێ پاشا و مەلا ئیدریسی عیمادێ بە سەد هەزار عەسکەرەوە ناردە سەر ئەم قەلایە ، دوای یازدە ڕۆژ وتوویژ کوردەکان ئەم قەلایـەیان بەبێ شەڕ بەدەستەوە دا و خۆیان چوون بۆ قەلای شەنگار★ • ساڵی ٩٤١ کە سولەیمانخان بۆ خەزای بەغدا دەچوو ، ئەم قەلای ماردینـەی کرد بـە سنجاق و پاتەختی بەگ ، بە پێی قانوون باجی میری دووسەد هەزار ئاقچەیـە و بیست هەزار قرۆش بە بەگ دەبڕێ ، بەلام ئەم ناوچەیە یەکێکی ئازا و بـە زاکوونێ پێویستە پیاوێ دڵنەرم و لەسەرخۆ بۆ ئێرە دەست نادا ، چونـکو لایێکی کوردە پرچنەکانن و لایێکی دی کوردەکانی (شقاقێ)و (ئاشدی)یە و دەشتەکانیشی خێڵی (کوچبوو)ی تورکمانی تێدایە ، نەختێ لەولاتر هۆزی عەرەبێ (تەی) کۆچەر هەن ، جا سەندنی مەڕانە و دەیـەك و پاوانانـەی لەوەڕگاکان یەکێکی زۆر توند و تۆڵی دەوێ •

ماردین سی و شەش زەعیم و ٤٦٥ تیماری هەیە ، بەگی ئالا و سەرۆکی چەرێ هەیە ، بە پێی قانوون بە جبە لەبەرەکانیەوە هەزار و حەفتا عەسکەری چەکداری هەیە کە لەگەڵ بەگدا بۆ شەڕ دەچن ، قازییەکەی سـێ هـەزار قرۆشی لە ناوچەکانەوە دەست دەکەوێ• مفتی و نەقیب و کوێخا و سەرۆکی یەنیچەرێ و دارۆخە و نایبی شار و شابەندەر و میراو و ئەمینداری قەپان و قەلادار و نەفەراتی تایبەتێ خۆی هەیە •

**دیمەنی قەلای ماردین :**

قەلایێکە لەسەر چیایێکی بەڕزورەنگ ، سەر لەئاسمانە و دوو قۆناخ لە دیجلەوە دوورە ؛ لە چۆلێکی جەزیرەدایە ، شتێکی وایە لە تاریف کـردن

نایێت بەڵام هەر چۆنێك بێ من بە پێی توانینی خۆم باسێـکی تنۆك لـە دەریای دەنوسم :

ئەم قەڵایە ئەوەندە بەرزە کە دیواری بورجـەکانی ژۆر هـەورەکان دەکەون ، بۆیە هەتا لای نیوەڕۆ کە هەورەکان نەڕەونەوە لە خوارەوەڕا لای ژورۆی نابیندرێ • من لە گەشتەکانی خۆمدا گەلێك قەڵای بەرز و گەورە و بە ناوبانگم دیوە بەڵام هیچیان ناگەنە ئەم قەڵای ماردینـە ، چونـکو لـە خوارەوە تا لوتکەی ژورۆی قەڵا دۆ فرسەقە ، لە بورجەکانی قەڵاوە هەتـا مەودای چوار قۆناخ بە هەر چوار لای خۆیدا دەبینـدرێ • لـەم قەڵایەوە قەڵاکانی نەسێبین و شەنگار و چیای شەنگار و دەشتە پان و بەرینـەکەی دیارە ، بە ئاشکرا دەتوانم بڵێم گرتنی ئەم قەڵایە لە توانینی بەشەردا نیـە مەگەر دانیشتوانی لەتاوی برسێتی خۆیان بەدەستەوە بدەن ، لەناو قـەڵادا گەلێك ئەشکەوت و کەلێن و قوژبنی هەیە و ئاویشی بەشی دە ساڵی خۆی تێدایە ، هەر بارانێك لە ئاسـمان بێتە خوارەوە ئاوی لای سەر بەرزایی و لوتکەکانی چۆرێـکی بە فێرۆ ناچێ هەمۆی بە جۆگا بەردینەکاندا دێتە ناو عەماراوەکانی ، ئەشکەوتەکانی لەو گەنمە شـامی و گاڵ و چەڵتوکانـەی شەشسەد حەوسەد ساڵ لەمەوپێش هەڵگیراون و ئەمڕۆ وا دەزانرێ تـازە لەسەر خەرمان هەڵگیراوە ، لە ئەشکەوتەکانی دیکەدا حەسـیر راخـراوە دانەوێڵەی گەنم و جۆ و نیسك و نۆکی لەسەر رۆ کراوە ، ئەم دانەوێڵانـە هەمۆ ساڵێ دابەش دەکرێن و هی تازە دەخرێتەوە جێیان • قەڵا ئەوەنـدەی جبەخانە تێدایە لە ژمارە نایێت ، بارۆتی رەش و گوللە تۆپ و چەك ئەوەندە زۆرە ئەگەر بیان نوسین کتێبێکی تایبەتی دەوێ ، دوندە هـەرە بەرزەکەی قەڵا کە سەری لەئاسمانە چەند شوێنەوارێکی پێوەیە ، ئێرە لە هیچ لایێکەوە خەندەکی نیە چۆنکو پێویست ناکا ، لە هەر لایێکەوە بڕوانیتـە خوارەوە سەرت دەسوڕێ ، هەمۆی دیواری گەلێ یەکپارچە و لوسە •

لەپاش گەڕان و تەماشا کردنی قەڵای ماردین کە بیستمان مستەفا پاشای فیراریّ لە قەڵای شەنگارە ، ئێمەش بەرەو شەنگار ڕێکەوتین •

لە ماردینەوە بەرەو باشور بە سێ سەعات هاتینە قەڵای ( گوللی ) کە گوندێکی پێنسەد ماڵی کوردە لە ناو چۆڵستانێکدا لێرەوە قەڵای ماردین جوان دیارە • (دارا)ی شای ئێران لێرەدا لەگەڵ ڕۆمەکان شەڕێکی قورسی کردوە و بە شکاویّ بەرەو (قەرە دارا)ی نزیك نەسێبین هەڵاتوە ، ئێستاش لەم دەشتی گوللی‌یەدا گردۆلکەی ئێسکی عەجەمە کوژراوەکانی ئەو ڕۆژە هەڵدراوەتەوە و ماوە ، لە لایێکی دیکەش ئێسکی وێنانە کوژراوەکان کەڵەکە کراوە • لێرەوە بە چۆڵیدا هاتینە گوندی ( قزل تەپە) کە سەر بە ماردینە و لەوێشەوە بۆ قەڵای ( خاتونیە ) •

**قەڵای خاتونیە :**

چونکو (زوبەیدە) خاتونی ژنی هارونە ڕەشید بنیاتی ناوە خاتونیەی پێدەڵێن ، بە قسەی خاوەنی شەرەفنامە ئێرە دایکی شای شەنگار دروستی کردوە و ناوی (سور خاتونیە)ی لێناوە ، لە ناوچە و هەرێمی خاکی ماردین لەو دەشتە پانەدا لەسەر گردێکی قوچ بە چەشنی چوار گۆشەی لاکێشیّ دروست کراوە ، لای باشوری دەروازەی هەیە ، هەموی بە بەردی تاشراو داندراوە و بینایەکی جوانە ، لە ناوەوە مزگەوتێك و حەفتا ماڵی تێدایە ، بازاڕ و قەیسەریّ نیە ، حەفتا نەفەر و بەشی خۆی جبەخانەی هەیە ، پانایی و درێژیّ قەڵاکەم نەزانی •

لێرەوە بەرەو باشور هاتینە شوێنێك (کەندیلی) ناوە و دوا سنوری ماردینە ، جێگایێکی نائەمینە ، کوردەکانی (ئاشدیّ) و (شقاقی) ڕێگریّ دەکەن • لە کێوێکی بلند ئاوا بوین و بەناو بیاباندا هاتین گەیشتینە قەڵای (شا شەنگار) • لە بەرەو خواری ئەم قەڵایەدا یەکەم ڕۆژی رەجەبی ١٠٦٥

بە خزمەت مستەفا پاشای فیراریێ والیێ دیاربەکر گەیشتم و نامەی مەلیـک ئـەحمەد پاشام دایێ • بە خوێندنەوەی شاد بێ.و گوتی « ئیشەڵلا سێ و حەوت کیسە قەرزەکەی مەلیك ئەحمەد پاشا دەدەینەوە و نزیکەی سـەد چادرێکیشی بۆ پەیدا دەکەم و بۆی دنێرم » بۆ منیش خێوەتێکی لە تەنیشت خۆیەوە رێکخست و کردمی بە میوانی خۆی • جا دەسـتم کرد بە گەڕان و تەماشای قەڵای شەنگار •

**دیمەنی قەڵای شەنگار :**

ئەو کاتەی کەشتیێ (نوح پێغەمبەر) بەسەر شەپۆلی تۆفانەوە گێـژی دەخوارد ، سوچێکی بەر ئەم چیای شەنگارە کەوت و کەمێك زیانی دی ، نوح زۆر نارەحەت بێ و شێست و حەوت کەسەکەی ناو کەشتیێ هاواریان لێ هەستا ، مارێك هاتە پێش و بە نوحی گوت «ئەگەر لە گۆشـتی ئادەمزاد تێرم کەی من کەشتیێیەکەت بۆ رزگار دەکەم » نوح گوتی « باشـە ، لـە گۆشتی ئادەمزاد تێرت دەکەم » ، لەسەر ئەم پەیمانە مار هات کلکی خستە ناو ئەو کونەی کەوتبوە کەشتیێ و لەسەر کونەکە پەپکەی خوارد و نـەی هێشت دلۆپێك ئاو بێتە ناوی ، خەڵکەکە شاد بێن و هەر ئاوێك هاتبـوە ناوەوە دەریاندا • جا کاتێ کەشتیێیەکەیان لەوێ دێر کەوتەوە ، نوح بـەو چیایەی گوت «هازا جەبەل سین جەور» واتا ئەم کێوە سینـە زوڵمی لـێ کردین ، لە پاشتردا سین جەور بە هەڵە کراوە بە (سنجار) ، لە راستیشـدا چونکێ رەوەزەکانی ئەم چیایە هەمێ ددانە ددانەیە و تیژن پێیان گوتـوە (جەبەل سن) و جاریشیان لێ زیاد کردوە بۆتە سـنجار •[8] ئەو رەوەزەی کەشتیێ نوحی کونکرد کەوتۆتە لای باکوری قەڵای شەنـگار و قـەڵای

---

(٨) وشـەی (ژەنگار)ی کوردیێ بە مانا رەنگین • ئەمڕۆ بۆتە شەنگار و شەنگال، عەردبەکان ئەم وشـەیەیان هەڵگێڕاوەتەوە و کردویانە بە (سـنجار) •

نەسێبینەوە ، گومانیش لەوەدا نیە کە کەشتی نوح بەر لوتکەی چیای شەنگار کەوتوە چونکو مێژوی مەقدیسی بە درێژی باسی کردوە ٠

کەشتی نوح لە پاش گەڕانێك بەسەر ئاودا دو قۆناخ لەلای باکوری شەنگار لە نێوان قەلای موسل و نەسێبیندا لە سەر کێوی (جودی) گیرسایەوە ، ئەوانەی تێیدا بون هاتنە دەر و سوپاسی خوایان کرد ، چێشتیان لێنا خواردیان و ئەو چێشتەیان ناونا (چێشتی عاشور) چونکو رۆژی دەیەی محەڕەم بو ، لە رۆژی تۆفانەوە تا هاتنە دنیای پێغەمبەری ئیسلام ٠ بە قسەی (محەمەد کوڕی ئیسحاق) ــ ٤٤٩٠ ساڵە و لە زەمانی باب ئادەمەوە تا هاتنی پێغەمبەر ٦٧٥٠ ساڵ تێپەڕیوە ٠ ئەم قسەیە هەمو مێژونوسەکان لە سەری یەکدیگیرن ٠

لە سەردەمی نوح پێغەمبەردا ئێرە بوبوە شارێکی گەورەی ئاوەدان و (کوردیم) ناوی ئۆمەتی نوح شای ئەم ناوە بوە ، ئەم کوردیم شایە زۆر ژیاوە و گەلێك کوڕ و نەوەی لێ کەوتۆتەوە ، زمانێکی تایبەتی بۆ خۆی رێکخست کە نە فارسییە و نە عەرەبییە ، ئەم زمانە لەو سەردەمەوە ماوە ، پاشان نوح پێغەمبەر لە جودییەوە سەری شەنگاری دا و دوعای بۆ کرد کە ئاوەدان بێ ٠

# ئەسپێ و کێچ و مێشوولە و مشك و دوپشك چۆن پەیدابوون ؟

دوای ئەوەی کەشتی نوح رزگار بوو ، مارەکە هاتە لای و پێی گوت « ئەی پێغەمبەر ، ئەو بەڵێنەی دابووت بە من کوا ؟ » نــوح دۆش دامــا و نەیدەزانی چ بکا ، (جوبراییل) هاتە خوار و پێی گوت « خوا سەلامــت لێدەکا و دەڵێ کەشتییەکەت من لــە گێژاو رزگارم کرد ، بۆچی بە ئازایی ماری دەزانی ؟ بێنە ئەو مارە باوێ ناو ئاگرەوە تا شتی سەیرت پیشان بدەم و ماریش لە گۆشتی ئادەمی تێر کەم » نوح گوتی « کاکە جوبراییل من چۆن دەتوانم مار فڕێدەمە ناو ئاگر؟ » جوبراییلی ئەمین گوتی : « تۆ هەقت نەبێ ئایەتی ( سلام على نوح في العالمين ) بخوێنە » نوحیش ئەم ئایەتەی خوێندەوە ( سلام على نوح في العالمين ) و دەستێکی لە مار دا ، مــار سەرخۆش بــوو خۆی هەڵدایە ناو ئاگر سووتا و بوو بە قەرەبرووت ! دیسان لەسەر ئامۆژگاری جوبراییل نوح خۆڵەمێشی ماری بــەبا کرد ، بایەکی توند هات ئەو تۆزەی بە سەر و چاوی ئۆمەتی نوحدا کرد ، خۆڵەمێشی پێستەکەی بوو بە ئەسپێ و هێ گۆشتەکەی بوو بە کێچ • بۆیە تا ئەمڕۆش کێچ و ئەسپێ لەسەر پەیمانی نوح پێغەمبەر خەڵك ناڕەحەت دەکەن ، خۆڵی ئێسکەکانی کەوتە سەر زەوی بوو بە مێش و هێ کەلاکەکەی بوو بــە دوپشك ، هێ پەراسووەکانی بوون بــە هەزارپێ و هێ جەرگی بوو بە سەرمازەڵە و هێ دڵی بە زەرگەتــە و چەنــد وردە دەعبای دی • هەر خوا دەتوانێ هەموو شتێك بکا •

بەڵام مێژوونووسانی عەجەم لەمەڕ ناولێنانی شەنگارەوە دەڵێن : یەکێك

له ژنانی شای ئێران (دارا) زگی پڕ بۆ ، ئەستێرەناسان گوتیان ئەگەر ئـەم ژنە لە سەعاتێکی پیرۆزدا بزێ منداڵەکەی شای دنیاگر دەبێ ، دارا فەرمانی دا کە بەچاکی ئاگاداری ئەو ژنە بن ، ژنەکە کوڕێکی زۆر جوانی هێنـایە دنیا بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو منداڵە سێسەد و چواردە رۆژ لە زگی دایکیدا مابۆوە ناویان نا (سنجار) • پاش مردنی دارا سنجـار بۆ بە فەرمـانڕەوای سەربەخۆ و بەگژ ئەو رۆمی‌یانەدا چۆ کە باوکی ناچار کرابۆ خەرج و باجیان بداتێ ، ئەم سنجارەش کە جێی هاتنە دنیای بوە باشی ئـاوەدان کردەوە و پەرەی پێدا • لە زەمانی تەیمۆری لەنگدا ئێرە گەمارۆ درا و پاش حەوت مانگ ئابلۆقەگیر و هەرچی شوێنەواری هەبۆ کاول کرا تەنیا قەڵا کۆنەکەی مـایەوە •

**قەڵای شەنگار :**

ئەو وەستایەی ئێرەی درۆستکردوە لە شێوەی قـەڵای مەعـەڕزەی نوعمانی داناوە ، قەڵاییێکە قورس و قایم لەسەر کێوێکی بڵند بە بێ خەرەند. پێنج گۆشەیە و یەك دەروازەی هەیە ، چواردەوری حەوت هەزار شەقاوە. تەنیا سێسەد خانوی بچۆکی قوڕی لە ناودایە ، دانیشتوانی کورد و عوربانن. ئێستا پاتەختی بەگە و سەر بە دیاربەکرە . بەگی ئاڵا و گەورەی چـەری و فەرماندەی یەنیچەری و قەڵادار و سەد عەسکەری هەیە ، فەرمان لە بـەگی ماردین وەردەگرن ، بەشی خۆی جبەخانە و وردە تۆپی شـاهی هەیە ، لـە مزگەوت و حوجرەییێك زیاتری تێدا نیە •

لەناو ئەو رەقەن و بەردەڵانەدا باخی وایان هەیە کە میوە خۆشەکانی هاوتای میوەی عەنتابن ، ترێی ، شیرین و ئاوداری هەیە ، قەڵاکە کەوتۆتـە ناوەڕاستی بیابانێکی فراوان کە خێلاتی عەرەب (بیلاد رەبیع)ی پێدەڵێن ، خێلەکانی (کیسی) و (تەی) عەرەبی تێدایە ، لە ناوەندی ئەو دەشتەدا قەڵاکە

حەواڵەی هیچ لایێکی بەسەرەوە نیە • خەڵکەکە نانی گەنمە شامێ دەخۆن ، هەنگوینێکی زۆر سپێ و خۆشی هەیە • ئەم قەڵایە کەوتۆتە باشوری قەڵای نەسێبین کە لێرەوە بە دوو ڕۆژی خێرا و سێ ڕۆژی بە کاوەخۆ دەگاتە (موسڵ) • لە ناو بەردەکانی دامێنی ئەم چیایە حەفتا هەشتا کانێ دێتە دەر کە ئاوەکەیان لە پاش پاراوکردنی بیلادی ڕەبیع بەرەو خۆراوا دەچێتەوە ناو زێی فورات • با کەمێك باسی ڕوبارەکانی ئێرە بکەم :

ئاوی هەرمای لە چیای نەسێبین دێتە دەر ، لقێکی لێ جیا دەبێتەوە ناوی ( سەرسار )ە ، ئەم سەرسارە دەچێتەوە (بەلەدول حەتیبە) و لە وێڕا بە دۆڵی شەنگاردا پاش پاراو کردنی زەوێ و زار لە نزیك تکریت تێکەڵاوی دیجلە دەبێ •

لقەکەی دیکەی هەرمای پاش ڕوێشتنێکی زۆر بەناو بیاباندا پێش ئەوەی ئاوی (خاپۆر) تیکەڵ بە (قرقیا) ببێ لەگەڵ خاپۆردا دەبنە یەك و لە نزیك ڕوباری قرقیا دەڕژێتە فوراتەوە • ئەمانە ڕوباری زل نین بەلام هەمویان دەچنەوە ناو فورات •

مستەفا پاشای فیرارێ کە بەخۆی و ئەم سوپاگرانەوە لە لایێکی قەڵای شەنگار هەڵیدابو ، چل و پێنج هەزار کوردی (یەزیدێ) و (بابڕێ) بێ ئەوەی ئەوەندەی پۆشکەیێك شەرمی لێ بکەن یا سام بیانگرێ تەنانەت یەك دیاری بچوکیشیان بۆ نەهێنابو • پاشا لەمە زۆر تورە و نارەحەت بو ، بە منی گوت « ئەرێ ئەولیا چەلەبێ بیستومە ئەو جارەی مەلیك ئەحمەد پاشا هاتبوە ئێرە دیسان ئەم پرچنانە ڕێزی ئەویشیان نەگرتبو ، کەچی دەرەقەتیان هات و تالانێکی باشی کردن • ئەوەم بۆ ناگێڕیتەوە ؟ » گوتم بە سەرچاو ، گوێ بگرە :

« ئەو کاتەی مەلیك ئەحمەد پاشا والی دیاربەکر بو ، (یەزیدێ)یەکانی ئەم چیای شەنگارە گوندەکانی ماردینیان تالان دەکرد و ڕێبوار و کاروانییان

رۆت دەکردەوە ، خەڵك هاتنە لای پاشا و شکاتیان کرد ، پاشا لەبەر چاوی خەڵك شکاتکەرەکانی دەرکرد و بە هەناسە ساردیٚ ناردنیەوە ، بـەڵام لــە دڵی خوێدا بڕیاری تۆڵە سەندنەوەی لە پرچنەکان دابۆ • رۆژێك نامەیێکی توانجاویٚ بۆ خانی بتلیس نارد خانیش وەڵامێکی توندی دایەوە ، مەلیــك پاشا بۆ بە ئاگر و سوێندی خوارد کە لەشکر دەکاتە ســەر خــانی بتلیس خێوەت و بارەگا و (تۆغ)ەکانی لە قەراخ زیٚ لە مەڵبــەندی (ســەعدیٚ) هەڵدا و پیاوی ناردە ســەر ئەیالەتی وان و هەمۆ کوردستان رۆژ بە رۆژ سوپای لە خۆی خڕ کردەوە • لە دیاربەکر حەفتا ئاڵا سەگوان و ساریجەی کۆکردەوە • سەگوان و ساریجە پیادەن • هەر ئاڵایە سەد قارەمانیان دەبیٚ لە ناودا بیٚ [٩] • »

« کاتێك سوپا گەیشتە قەڵای میافارقین ، عەبداڵ خانی بتلیس ( مەلا محەمەدی هەکاریٚ) و (مەلا جوبرابیلی زریقیٚ) و (عەلیاغــای مــۆدەکی) و ( عەلیاغای قۆناخ دەرە) و حەفتا کەڵە پیاوی بۆ رێك کەوتنــەوە نــارد • ئەوانە هاتنە لای پاشا هەشتا کیسەیان بۆ خەرجی رێی پاشا دانا و دە قەتار ئێستر و دە ئەسپی رەسەنی تەویلە و دە سەر خولام و جاریەیان دا ، بــۆ ئــاغا و دەسوپێوەندەکانیش ئەوەندەیان دیاریٚ هەڵڕشـــت کە هەمــۆیان دڵخۆش بۆن و شوکری خوایان کرد کە لە شەڕ رزگاربۆن • »

« ئەو شەوەی پاشا هەواڵی هەڵوەشانــەوەی شــەڕی راگەیــاند ،

---

(٩) سەگوان : (سەگبان ، سەگڤان) وشەیێکی کوردیٚیە ، بەو کەسە دەڵێــن کە لە دائیرەیێکی گەورەدا خزمەتی تولە و تانجیٚ راووشــکاری دەکرد و پێیان دەگوت (سەگبان باشیٚ) ؛ (ساریجە)ش بە دەستەسەربازێك دەوترا کە جلکی سەربازیان لــەبەر نەدەکرد . (باش بۆزوق) ، بــە مانایەکیش زەردەواڵــە کێویلــکە دەگەیەنــیٚ ؛ هەروەهــا بــە ســەرۆکی ســوپای یەنیچەریشیان دەگوت .

( محەمەدەمین پاشا کوڕی شەمس پاشا)ی کردە سەرداری هەزار عەسکەر و فەرمانێکی بە گوێدا چرپاند و ڕەوانەی زێی دیاربەکری کرد• نامەی دڵخۆش دانەوەی بۆ خانی بتلیس توسی و بە (ئەحمەداغای ئەرغەنەلی) و چەند پیاو ماقوڵدا بۆ خانی نارد ، تۆغەکانی بەرودوا گێڕایەوە و بە حەفتا هەزار عەسکەرەوە هاتە ڕۆخ زێی دیاربەکر ، (قەدە کوێخا) و (ڕەجەب ئاغا)ی دانا بە سەرداری سوپای قورس و خۆی بە پڕتاو هەر ئەو شەوە لە دەربەندی زەرزیوانەوە پەڕیەوە بۆ نزیکی نیوەڕۆ لەبەر قەڵای ماردین سوکە نانێکی خوارد و دیسان هەر بە غار هات لای ئێوارە بە چل هەزار عەسکەرەوە دەورەی چیای پرچنی دا ، لە کاتێکدا محەمەدەمین پاشا لەولاوە لەگەڵ کوردە پرچنەکان تەقەی دامەزراندبۆ هێزەکەی پاشاش لەخوار چیای شەنگار چونە ناو سەنگەرەوە ، لە دوای سێ ڕۆژ کە ئەو دەشتە پڕ بوبو لە خێوەت و سوپا ، وردە وردە بە سەر کوردەکاندا زاڵ بو • »

مستەفا پاشای فیراری کە ئەمەی بیست سەری سوڕما و گوتی «ئەرێ (ئەولیا ئەفەندی) چۆن چونە ناویان و چیتان کرد توانیتان سەر کەون و تۆڵە لەم کوردانە بکەنەوە ؟ من لەداخی ئەمانە دڵم پڕ بوە لەخوێن، تا ئێستا چەند نامەی تەوساویم لە سوڵتانەوە بۆ هاتوە بەڵام لای کەس نەمدرکاندوە • منیش هەر بە بیانوی خانی بتلیسەوە یەکدو جار لەشکرم کردو هاتمە ئێرە کەچی هیچم بۆ نەکرا ، تۆ پێم ناڵێی ئێوە چیتان کرد ؟ »

پێم گوت « جەنابی پاشا ، ئەوکاتە مەلیك ئەحمەد پاشا حەفتا ئاڵای سەگوان و ساریجە و دە هەزار ئاغا و بەردەستی هەبو ، هەمویان ئەبازە و چەرکەس و گورجی بون ، شەرمیان لە یەکتر دەکرد و لە کاتی شەڕدا گەڕانەوەیان نەدەزانی ، هەمویان لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت ئیشەڵڵا تۆڵەی هەڵاتنی (نسوح پاشا) و کوژرانی حەوت هەزار شەهیدەکانمان لێرە دەستێننەوە » •

به هیمەتی مەلیك ئەحمەد پاشـــا خەزاکەرەکانمان گەیشتنە سەر نوکی چیا و لە هەموو لاییکەوە شەڕێك قەوما کە تا ئێستا نەبوە و نەقەوماوە ، هەر لە یەکەم پێك هەڵپڕژانا حەوسەد قارەمانمان لێ شەهید کرا ، لە پرچنەکانیش سێ هەزار و حەفتا کەسیان لێ کوژرا ، ئەو رۆژە هەتا شەو شــەڕ درێژەی کێشا ، لە سێرەهەڵگیرانا شەڕ راوەستا و هەر لایە لە شوێنی خوێدا بــە ئامادەیی راوەستان و پاسەوانیان دانا •

**باسێکی کوردە پرچنەکان :**

لاییکی چیای شەنگار (چیای پرچن)ی پێدەڵێن چونکو دانیشتوانــی وەکو ئافرەت پرچ بەردەدەنەوە ، زۆر پیس و چڵکنن و سەریــان پڕە لــە ئەسپێ و مێشــولکە ، بوزوی رەنگاورەنــگ دەکەن بە شــال و شەپــك ، پشتێنی هەریر لە پشت دەبەستن و مێزەریان شەدە و هەریری رەنگاورەنگە ، پێلاویان کالە و یەمەنی و کالەی کلکدار و پوچلی و پێنەدی و ســەدێ و هەزاری و کەپکەپاییە ، چونکو شوێنەکەیان چیایە و رێــگای بەردەلان و سەختە ، چەکەکانیان بریتی‌یە لە شیر ، خەنجەر ، تفەنگ و جاب ــ جــاب شتێکە نیشانچییەکانی عەنتاب بۆ تیرهاویشتن لەبەر پشتی خۆیــانی قــایم دەکەن ــ ، لە تفەنگ هاویشتنا ئەوەندە دەست راســتن چــاوی کێــچ و ئەژنۆی وشتر دەپێکن ، تفەنگەکانیان ببینن بە پولێك نایکڕی کەچی زۆر بە وردی نیشان دەنگێون •

خەڵکەکە بە زۆری کورتە بالاً ، سەرخڕ و مل کورتن ، هەر دەڵێــی سەریان لەناو شانیان هاتوتە دەر ، بەلام شانیان بەرین ، سینگە پڕ قینەکەیان پان ، کەمەر باریك ، باسك و رانیان ئەستور و ناولنگیان فراوانــە ، زۆر ئازان بەلام سوارچاك نین ، چاویــان رەش و خڕە ، برۆیــان زۆر پــڕە ، کوردەکانی دیکە هەشت سمێڵیان پێدەڵێن ، ئەویش لەبــەر ئەوەی کە دو

سمێڵ ، دوو برۆ ، دوو قەفە مووسی درێژی کونەلووتیان ، لیسپەموەکانی هەردوو کونە کوێچکەیان درێژە • لەشیان لە تووکنیدا وەکوو لەشی بزنی رەش وایە ، زاریان یەك تاکە کاڵەی پێوە دەچێ و ددانیان وەکوو ددانی ئەسپە ، منداڵیان هەتا دەگاتە دە ساڵێ کۆرپە و ساوایە بەڵام کە لە دە ساڵی تێپەڕی خـۆی وەکوو پیاوی بیست ساڵی پیشان دەدا . هەتا بڵێی رەقن • ژنیان پرچی دەگاتە ئەژنۆ ، منداڵیان یەك ساڵ لە زگی دایکیـدا دەمێنێتـەوە جـا دەزێ ؛ کە منداڵیان بوو لەپێش هەموو شتێکدا شیری سەگی رەشی دەرخوارد دەدەن •

لەناو ئەمـانەدا هەر کەس بەرد بۆ سەگێـك راوەشـێنێ دەزبەجێ دەکوژرێ ، وردو درشتیان یەکی سەگێکیان هەیە ، کە هاتنە سـەر نـان خواردن لە پێشدا بۆ سەگەکەی دادەنێن کە ئەو تێر بوو جا خۆیان دەسـت پێدەکەن ، سەگەکانیان لەگەڵ خۆیان دەنوێنن . سەگێکی رەش بە هـەزار قرۆش و بە دە ئێستر سەودا دەکرێ •

ئەم کوردانە بۆ هەر کوێیەك بچن پیواز و نان و شیرێژیان لەبـەر پشتایە ، لەکن ئەوان هەر کەس بە مست پیوازێك پان کاتەوە سەری پـان دەکەنەوە ، سەیرتریش ئەوەیە کە یەکێ دەوڵەمەندیان بمرێ بە ئاوی پیواز دەیشۆن و قەبرەکەشی پڕ دەکەن لە پیواز• زۆر جـار هۆی ئەم شتەم لە دیلەکانیان پرسیوە خۆیان لە وەڵامدانەوە دەبوێرن ، تەنیا بە وشەی ( پیواز خۆشە) وەڵام دەدەنەوە • جگە لەمە قسەیێکی نەستەق هەیە دەڵێـن لـە کوردێکیان پرسی ئەگەر ببی بە شا چ دەخۆی ؟ گوتویـەتی چـوزەرەی پیواز ! بە راستی پیوازیان زۆر پێ خۆشە •

شتێکی سەیری دیکە : ئەگەر جغزێك بە دەوری کوردێکدا بکێشی بیشمرێ لەو جغزە نایێتە دەرێ هەتا یەکێك نەیێ لایێـکی جغزەکەی بـۆ تێك بدا ! •

لەم ولاتەدا سەگ بترەکێ شایێ بۆ دەکەن ، سەگی رەش بتۆپێ بە ئاوی پیواز دەیشۆن و کفنی دەکەن و بە شیوەن و گریان دەیبەنە گۆڕستانی سەگان ، پاشانیش بۆ رۆحانەتی سەگە مردوەکە کەباب بە سەر سەگەکانی دیکەدا دەبەشنەوە • بەراستێ سەگی وایان هەیە بە قەدەر شێرێکە ، بۆیە لەم ناوەدا هیچ گورگ نیە •

سەیر ئەوەیە هەرچەندە (شەنگار) یەکێکە لە ناوچە پیرۆزەکان ، خەلکی وا بێدینی تێدابێ ، بەلێ شامیش کە ناوچەیێکی پیرۆزە لە چیاکانیدا تیرەی (ئەقلێ) و (قزللێ) و (مەروانێ) و (شێمانێ) و (نەسیرێ) هەیە کە هیچ ئایینێکی راست و رەوانیان نیە •

ئەم کوردە پرچنانە داهاتیان زۆرە ، گەزۆیان هەیە ، جۆرە بالندەیێك دێتە ناویان و راوی دەکەن (سەلوا)ی پێدەلێن ، هەنگوین و ترێیان تا بلێی خۆشە و لە دنیادا بێ وێنەیە ، مێوژیان بە بازرگانێ دەگاتە بەغدا و بەسراو لەحسا ، دارتوی زۆرە بۆیە ئاوریشمیشیان هێجگار زۆرە ، تەنانەت ئەو کوتالە هەریرانەی لە قەلای ماردین دەچندرێن لە ئاوریشمی ئێرەیە • لەبەر ئەوەی چیای شەنگار ئاو و هەوای خۆشە زەوی و زارەکەی زۆر بەپیتە ، بەلام دەشتەکەی بە دەست عارەبانەوەیە •

بۆ رۆژی دوایێ لەبارەی کێشەی پرچنەکانەوە کۆبونەوەیێکی گەورە لە بارەگای مستەفا پاشادا کرا ، نامەیێکیان بۆ نوسرا کە ( سەر بۆ سولتانی عوسمانی دانەوێنن ، باخانە و مەڕانە و هەموو باجە دیارکراوەکان بدەن ) ، ئەم نامەیە درا بە پیاو ماقولانی ماردین و چەند ردێن سپێ دیکە کە بەگی شەنگار هەلیبژاردن ، منیش کرام بە نوێنەری مستەفا پاشا و سەرکەوتین ،

له قوچایێ سەرێ بردیانینە (گوندی باپیر) ، ئێمە کە سێسەد کەسێك بوین میوانی ماڵی ئەو ( باپیر )ەی ســەرکردەیان بوین ، نامەکەمان دایێ ، وەکو هیچ نەبێ ئەوەندەی قاقەزی حەڵواچییێکیش بایەخی نەدایێ ، لەبەر چاوی گەورە کانیان خوێندرایەوە و ماردینیەکان بۆیان کردن بە کوردێ. لەوەڵامدا گوتیان « ئێمە بە ڕوداوەکەی مەلیك ئەحمەد پاشا مەترسێنن ، پیاوی وەك ئەو نایێتەوە ، بیستومانە دەچێتە وان ، ئەمڕۆش بکرێتەوە بە والی دیاربەکر هەموومان سەری بۆ دادەنەوێنین . بۆ ئەم مستەفا پاشایەش باری دە ئێستری سور ئاوریشمی دەدەینێ و هیچی دی ! » ئەو دە بار ئاوریشمەیان نارد و بۆ ریش‌سپییەکانی هاتبون یەکی پێنج قیە ئاوریشمیان دانێ ، بۆ منیش کە وا دیارە ناسیبویانم باری ئێسترێك ئاوریشم و باری ئێسترێك هەنجیری وشك و مێوژ و ئەم جۆرە شتەیان دانا . ئەو شەوە میوانیان بوین ، لە نیوەڕۆوە تا تاریك داهات هەر گەڕاین و تەماشامان کرد . پازدە ساڵ بەسەر شەڕەکەی مەلیك ئەحمەد پاشادا تێپەڕیبو ، کاولکارییەکان چاك کرابونەوە . ڕۆڵەی لاوی وایان پێگەیشتبو کە لە تاریف کردن نایێن .

سەر لەبەیانێ سوار بوین بە دیارییەکانەوە هاتینەوە لای مستەفا پاشای فیراریێ و ئاوریشمەکانمان دایێ . زۆر توڕە بو و کەفی چاند و هەڕەشـــەی کرد «من هەر دەچمە سەریان» ، پاشان نامەی بۆ گشت ناوچەکانی دیاربەکر نوسی و داوای لەشکری لێ کردن .

# له دیاربەکرەوە بۆ وان

بۆ پەڕینەوە لە شەت سواری کەڵەك بوین ، ئەم کەڵەکانە وەکو کەشتی بەژە و مافقوریان لەسەر راخراوە ، بار و بارخانەییکی زۆری لێ بار دەکرێ ، ئەسپ و وڵاخ لە جێی تایبەتیدا دەبەسترێنەوە و نەفەرەکان پاڵی لێ دەدەنەوە خەریکی شەترنج و نەردێن دەبن و بە تەماشا و سەیر کردنی ئەمبەر و ئەوبەر رادەبوێرن ، لە کاتی ژەمەکاندا لە چێشتخانەی سەر کەڵەك خواردنیان بۆ لێدەندرێ و دێتە پێشیان ، بەم جۆرە بە سەر ئاودا دەڕۆن تا دەگەنە (بەغدا)و (بەسرا) زۆر بە رەحەتی • ئەم جۆرە کەشتییەش وەستای تایبەتی خۆیان هەیە • هەمیشە لە خوار پردی دیاربەکر چەند دانەییك لەم کەڵەکانە راوەستاون و ئامادەی رۆیشتنن •

دوای پەڕینەوە لە نێوان باکور و خۆرهەڵاتا بە سەعاتێك هاتینە گوندی سەعدێ ، گوندێکی ئاوەدان و پڕ باخ و باخاتی مەسیحییەکانە بەڵام دزی زۆرە ، ئەو شەوە خێوەتێکیان لێ دزین بەڵام دوانمان لێ کوشتن و خێوەتەکەمان پێ بەجێ هێشتن •

بۆ سبەینێ دیسان بەرەو خۆرهەڵات بە ناو چیمەنێکی خۆشدا گەیشتینە (چۆل تەپە) ، گردێکی جوانە لە ناوەڕاستی ئەم دەشتەدا و گەلێك ئاوەدانی لە دەور و پشتە ، یەك سمەکانی والی دیاربەکر لەم ناوەدا دەلەوەڕێن ، ئەم چیمەنە وێنجە و سێوەڕە و سەوزەگیای بە ناوبانگە ،

ئێرەش رەشــە دزی زۆرە ، چونکو مــەڵبەندی کوردەکانی ( خاڵتێ )و (چەکوانێ)و (زەنادێ)یە پیاو ناوێرێ بە دڵنیایێ بنوێ • لێرەوە بەرەو باکور هاتینە میافارقین •

**قــەڵای میــافارقین :**

ئەم قەڵایە کەوتۆتە نێوان دیجلە و رۆباری (بەتمان) و ئاوی دۆ رۆبار لێك جودا دەکاتەوە بۆیــە پێی دەڵێن ( ماء فارقین ) ، پاشــان بە هەڵە بۆتە میافارقین • عەجەم بێرە دەڵێن (میان فەرق) کە بەمانا کەمەر باریکە ، جاران شارێکی گەورە و قەڵاییێکی کۆن بوە . یەکەم بنیاتنەری (حاندیك) شا ناوێك بوە لە ئۆمەتی (جەرجس پێغەمبەر) ، بەڵام خەڵکەکە نەك هەر بڕوایان بــە جەرجیس نەهێنا بەڵکو چل جاریان ســوتاند و خۆڵەکەیان بەبا کرد ، بــە فەرمانی خوا خۆڵەکەی خڕ دەبۆوە و زیندۆ دەکرایەوە ، ئەم بەسەرهاتە لــە زۆر کتێبی بەنرخدا تۆمار کراوە ، ئێستاش لە تۆقە سەری ئەو چیایەی خۆڵی جرجیس پێغەمبەری لێ بەبا کراوە گیا نارۆێ• جا جەرجیس دوعای خراپی لەو خەڵکە کرد ، هەژدیهایەك لە کێوی سوبحانی قەراخ دەریای وان هاتە دەر و هەمو خەڵکەکەی قوت دا و قەڵاکەیان بە بەرەڵلایێ مایەوە • پاشان (بەختونەسر) هات و قەڵاکەشی رۆخاند ، دوایێ کەوتە دەستی عەباسییەکان تازەیان کردەوە ، ( هەلاکۆ ) هات دیسان خەڵکەکەی کوشت و قەڵاکەی تێکدا • پاشان ( سەیفوددەولــە )ی کوڕی حەمــدانێ [10] وای ئاوەدان کردەوە کوردستانی پێ رازاندەوە ، ئەمجارە بە جۆرێکی وا ئاوەدان بۆوە کە حەفتا هەزار سواری قارەمانی لێ دەر دەچۆ و عەسکەری پیادەش مەگەر خوا بیزانێ ، زۆرێتێ ئەو عەسکەرانە بەوەدا دەر دەکەوێ کە هەمۆ رۆژێ

---

(١٠) ئەم وشەیە دۆ هەڵەی تێکەوتوە ؛ یەکەم ئەولیا چەلەبێ (سەیفوددەولە)ی بنەماڵەی حەمدانێ بە کوڕی حەمدانێ تێگەیشتــوە ؛ دوەم لە چــاپدا ( حەمدانێ ) بە (صەمەدانێ) نوسراوە .

له چێشتخانه‌کانیدا باری چل وشتر خوێ کار ده‌کرا • ئێســتاش بناخه‌ی سه‌رای ( سه‌یفودده‌وله ) هه‌ر ماوه ، پاشان ( ته‌یموری له‌نگ ) هات و تێکی دا ، ئه‌مڕۆش شوێنه‌واری کۆن و که‌له‌به‌ری ئه‌و کاره‌ســاته به دیواره‌کانی قه‌ڵاوه ماوه •

له ساڵی ۱۹۲۰دا کاتێ ( سوڵتان سه‌لیم خان ) له خه‌زای ( چاڵدێران ) گه‌ڕایه‌وه و (بیقلێ پاشا)ی کرده سه‌رداری گرتنی دیاربه‌کر ، ئه‌م قه‌ڵایه به‌بێ شه‌ڕ خۆی دا به ده‌سته‌وه ، له‌سه‌ر فه‌رمانی سوله‌یمانخان کرا بــه پاته‌ختی به‌گی سنجاق له خاکی ( قه‌رد ئامێد )دا ، به‌گه‌که‌ی ساڵانه ده کیسه‌ی ده‌ست ده‌که‌وێ و قه‌زاکه‌ی سه‌د و په‌نجا ئاقچه‌یه ، قازییه‌که‌ی ساڵی سێ کیســـه‌ی هه‌یه ، به‌گی ئاڵا و سه‌رۆکی چه‌رێ و دارۆخه‌ی هه‌یه ، مفتێ و نه‌قیب و کوێخای سوپا و فه‌رمانده‌ی یه‌نیچه‌رێ و قــه‌ڵاداری هه‌یــه ، نه‌فه‌رات و جبه‌خانه‌ی نیه ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ناوه‌ڕاستی خێڵاته ئه‌م شتانه‌ی ناوێ ، له لایه‌ن میر لیواوه چه‌ند تۆپێك خراوه‌ته ناو قه‌ڵاکه رۆژانی جه‌ژن و سه‌ری مانگی ره‌مه‌زانان ده‌یان ته‌قێنن و دێهاته‌کان ئاگادار ده‌که‌ن •

**باری قه‌ڵای میافارقین :**

مێژوونوسانی رۆم له‌مه‌ڕ ئه‌م قه‌ڵایه‌وه ده‌ڵێن « جه‌زیره‌یێکی گه‌وره‌یه له نێوان دیجله‌و فوراتدا » به‌ڵام ئه‌م قسه‌یه‌یان هه‌ڵه‌یه ، من خۆم ده ساڵ له‌م ناوه‌دا گه‌ڕاوم و بست به‌بستی شاره‌زام • ( رووباری مراد ) و (زێی فورات) له نزیك مه‌لاتیه به ته‌نیشت خانی ره‌ژودا ده‌ڕوا پــاش چل قۆناخ لــه نزیك قه‌ڵای (قوڕنه ) تێکه‌ڵ به (دیجله) ده‌بێ و هه‌ر دوکیان ده‌بنــه ( شــه‌تول عه‌ره‌ب) • دیجله‌ش لــه دامێنی ( قرقیا )ی ( دیــار به‌کر ) دێته‌خوار بــه (حه‌سه‌نکێف) و (جه‌زره)و (موسڵ)و (به‌غدا)دا دێ له بن قورنه تێکه‌ڵ بــه فورات ده‌بێ • کاتێ له پردی دیاربه‌کر ده‌په‌ڕێته‌وه به‌ره‌و باکور به دوو رۆژ

دەگاتە ئەم میافارقینە ، کەواتە ئەم قەلایە چۆن دەبێتە دوزگەیێك لە نێوان دیجلە و فوراتدا ؟ من لە پاش وردبونەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم قەلایە لـە نێوانی دیجلەو روباری بەتماندایە و ئەم دو ئاوەی لێك جودا کردۆتەوە •

بناخەی ئەم قەلایە لە داوێنی کێوی میافارقیندا بە ماوەی تۆپ هاوێژێك بەرەو خۆرهەلات لە مێرگێکی گۆزدا لە بەردی تاشراو بە چوار گۆشەیی دروست کراوە ، بیناکەی کۆنە بەلام بەردەکانی دیواری یەکی ئەوەندەی فیلێك زلن ، دیوارەکانی لە بیســت گەز بلندتر نـین و پازدە گەز پانن ، ( تەیموری لەنگ ) ویستی بیرۆخێنێ زۆری لەگەل خەریــك بو پێی نەرۆخا ناچار وازی لێ هێنا ، هەر چوار دەورەی یازدە هەزار شەقاوە ، خەندەکی دەوری بە لم و خۆل پڕ بۆتەوە ، بە شێوەی چوارگۆشە لـە باکورەوە بۆ باشور درێژ بۆتەوە ، هەرچەندە قەلایێکی گەورەیە خانوبەرەی قەبەی کەمە، هەزار خانوێکی قوزی دو نهۆمی باخچەداری هەیــە ، بینا بەناوبانگەکانی سەرای بەگ و سەرای سجایە ، بازاڕ و قەیسەری کەمە •

لە هەمو لایێکی ئەم قەلایە کانیاو هەلدەقولێ کە یەك لەوانە (کانی حەوز )ی ناوە ، ئەسکەندەری گەورە ئاوی لێ خواردۆتەوەو پێی خۆش بوە حەوزێکی گەورەی بۆ کردوە • بە ڕاستی دەلێی ئاوی حەیاتە و ئەوەندەی بلوری بێ گەرد رون و پاکە ، لە پــاش پاراوکردنی بــاخ و باخچەکان لـە خوارەوە دەچێتەوە ناو روبار • هەر لە خاکی ئـەم قەلایەدا روبارێك هەیە بەناوی (باسنفا) کەمێك لە قەلاوە دورە ، ئـەویش دوای ئاودانی چەنـد ئاوایی و زەوی و زار بە سەر جەزیرەی ئیبنوعومەردا بـەرەو خۆرهەلات بە پێنج فرسەق دەگاتە دیجلە • دیسان لە چیاکانی میافارقیندا چــەند کانی دیکەش هەن کە یەك دەگرنەوە و دەڕۆن لە قەلای حەسەنکێف و جەزیرە و موسل تێ دەپەڕن و دەڕژێنەوە دیجلە •

ئاووهەوای ئەم قەلایە سازگارە بۆیە جوانێ کوردەکانی بە ناوبانگە، ترێی چاکی هەیە ، لای باکوری قەلا کێوە و لەسەر کێوەکانیش رەز و باخ هەیە ، خەلکەکەی لەشساخ و بە گوڕن •

لای قیبلەی قەلا هەتا دەگاتە حەسەنکێف بیابانە • لای خۆرهەلات لە پردی بەتمان دەپەڕێنەوە بە یەك رۆژ دەگاتە قەلای (خوسـرەویە)و بەرەو قیبلە بە یەك رۆژی خێرا رۆیشتن دەگاتە ( جەزیرە ) •

**زیارەتگاکانی :**

لەناو قەلادا قسنی (شێخ نەجمەدینی حۆرانێ) و (سەیفوددەولە کوڕی حەمدانێ) کە ئەم قەلایەی تازەکردۆتەوە هەیە •

بە قسەی (مەقدیسی) مێژوتوس لە دوای تۆفانی (نوح) یەکەم شوێن شاری (جودێ) ئاوەدان کراوەتەوە • دوای ئەو قەلای (شەنگار)و سێیەم ئەم میافارقینە • بەلام خاوەنی شاری جودێ کە (کوردوم) شایە و ئۆمەتی (نوح) بوە شەشسەد سال ژیاوە و بەناو هەمو کوردستاندا گەراوە ، کە گەیشتۆتە میافارقین ئاووهەواکەی زۆر چۆتە دلیەوە و تێیدا نیشتەجێ بوە ، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی زۆر بون ، ئەم خەلکە لە خۆیانەوە زمانێکیان داهێنا کە نە عەرەبێ و نە فارسێ و عیبرێ و نە دەرێیە ، ئەمڕۆ بەو زمانە دەلێن کوردێ و لە کوردستاندا بەکار دەهێنرێ • بەلام زمانی کوردیش دوازدە شێوەیە کە وشەکانیان لە یەکتر ناچێ و بۆ لە یەکتر گەیشتنی تەرجومانیان پێویستە •

ئەم ولاتە سەری لای باکوری دەگاتە ( ئەرزەرۆم )و لە وانیشدا (هەکارێ) و (جەزیرە) و (ئامێدێ ــ عمادیە) و (موسل) و ( شارەزور ) و (هەریر) و (ئاردەلان) و (بەغدا) و (درنە) و (دەرتەنگ) تا دەگاتە (بەسرە) خاکێکی حەفتا قۆناخێ بە کوردستان و بەردەلان دەژمێردرێ کە لە نێوان

عیراقی عەرەب و وڵاتی غمانی دا بە چیا و شارەکانیەوە شەش هەزار هۆز و خێڵی کوردی تێدایە ، خوا یاربێ لەکاتی خوێدا ئەم عەشیرەتانە و میرەکانیان بە درێژێ باس دەکەم • بەڵام پانایێ کوردستان بە قەدەر درێژاتیەکەی نیە • لای خۆرهەڵاتی سنوری عەجەمە و لە هەریر و ئەردەڵانەوە تا خاکی شام و حەلەب بیست ــ بیست و پێنج قۆناخە ، بەشی هەرە تەسـکی ئەم پانایتیە پێنج قۆناخە ، لەناو ئـەم ئیقلیمەدا پێنسەد هەزار تفەنگچیـان هەیـە و هەمۆشیان شافعین ، تێکڕا حەوسەد و حەفتا قەڵایان هەیە کە هەمۆیان ساز و ئاوەدانن •

لە ناویاندا گەلێك شـێوەی جیاواز هەیـە وەکو (زازا) ، (لۆلۆ) ، (هەکارێ) ، (عونیکێ) ، (مەحمۆدێ) ، (شیروانی) ، (جەزیرێ) ، (پسانێ) ، (شەنگارێ) ، (هەریرێ) ، (ئەردەڵانێ) ، (سۆرانێ) ، (خالتێ) ، (چەکوانێ) و (رۆژەکێ) • ئەوا لە خوارەوە شێوە هەرە رەوانەکەیان دەنۆسێن :

**زمانی کوردی سۆران :**

ژمارەیان ــ یەك ، دۆ ، سێ ، چار ، پێنج ، شەش •••

**« نۆسینە کوردێیەکەی ناوکتێبەکە » (١١)**

تۆ کرمانجێ وەرە رۆنێ ، سەلامەت هاتە ، حالتە چیە ، خۆش قلاوی ،

---

(١١) وەکۆ دانـەری کتێب ئەولیـا چەلەبێ ئـەم نۆسینـانەی سـەرەوەی وەرگێڕاوەتە سەر تورکێ ، ئێمەش وا تورکێیەکەی ئەو بە بێ دەسکارێ دەکەینەوە کوردێ . ئەم نمۆنەیە جگە لەوەی هەڵەی نۆسێنی تێدایە ، ماناکانیشی هەڵەیان تێدا هەیە . وا دەر دەکەوێ ئەولیا چەلەبێ وەکۆ گەڕۆکێك تـەنیا ئەو ڕستانەی پرسـیوەو نوسیونێ کە بێگانەیێك لـە وڵاتێکدا بۆ هەڵسوڕاندنی پێویستێیەکانی دەیەوێ بیانزانێ وەکۆ (وەرە، بڕۆ ، مریشك ، نان و بەچەند ...) ، لـە دواییشدا پارچەی لاوکێـکی کوردێ بە شەقوشڕێ تیکەڵاو کردوە »

**« وەرگێڕ »**

هەڕە شوغلێ خۆ ، حەسپی سوار بە ، وەرە ڕۆنە ، وەرە خوار ، هەڕە ژۆر ، هەڕە بین ، هەیە نان ، هەیە ، چ هەیە بین ، مرشك هەیە بین ، نزانم مرشك ، تۆ درۆ دکە ، هەیە چەندن ، نەزانم هەڕە بین ، رادبم سەرێتە چار تانکم ، بسرێ خانێتە ، وەرە ڕۆنێ کرمانج ، بسری میرێتە ، وەرە ، هەڕە ، رابە ، زانم ، نزانم ، نان ، ئاو ، گۆشـــت ، هنگوی ، دبس ، تراماله ، زبـــش ، هەژیر ، پەز ، بزن ، سێو ، اسکرك ، مێوز ، جویز ، شاپك هەیە ، فروش ، فروشم بە چەند فروش ، چاریك ، گوپاڵ ، لکان ، تاخوك ، خێوەت ، چومە جەزیرێ کەلەك بەردانێ ، بوچی کلندر تاخورە ، ئیرۆ دۆ رۆژە مکان دۆرە ، خان عالیشانە ، ئی شەو چ شەوە شـــەوەکە داری باران دباری شـــەوی حاجیان ، بەژنێك زراو خال خالتە گوهرە د گۆهان •

**« وەرگەڕاوی ئەو رستانەی سەرەوە بە پێی مانا تورکی‌یەکان »**

« کوردە وەرەدانیشە ، بەخێر هاتی ، حالت چۆنە ، چاکە باشم ، بڕۆ بۆ کاری خۆت ، سواری ئەسپ بە ، وەرە دانیشە ، وەرە خوار ، بڕۆ ژۆر • بچۆ بێنە ، نان هەیە ، هەیە ، چ هەیە بێنە ، مریشك هەیە بێنە ، مریشـــك نازانم ، تۆ درۆ دەکەی، هەیە بفرۆشی ، نازانم ، بڕۆ بێنە هەڵدەستم سەرت لە چوار لاوە دەشکێنم ، بە ســـەری خانی تۆ ، کوردە وەرە دانیشـــە ، بە سەری میری تۆ ، وەرە ، بڕۆ، هەستە، دەزانم، نازانم، نان، ئاو، گۆشـــت ، هەنگوین، دۆشاو، ترێ، شۆتی، هەنجیر، مەڕ، بزن، سێو، هەرمێ مێوژ ، گوێز، چۆخە هەیە، هەیە، دەفرۆشی، دەفرۆشم، بە چەند دەفرۆشی، پشتێن، گۆچان ، پێڵاو، تاخوك ، خێوەت ، چومە جەزیرێ کەڵەکیان بەرداوەتێ ، بۆچی وات لەمن کرد ، ئەمرۆ دۆ رۆژە کە خانی پایـــە بەرز ، ئەمشـــەو چ شەوێکە ، شەوێکی تارێکە ، باران دەبارێ ، شەوی حاجیان ، بەژنێ باریك، خاڵ خاڵی تۆیە ، گوارە لە گوێ‌یاندا • »

**پردی بەتمان :**

لە قەلاّی میافارقینەوە راست بەرەو باکوّر روّیشتین لە «پردی بەتمان» پەڕینەوە ، لە شوێنی ئەم پردەدا ئاوی روبار ئەوەندە بە خوڕێ و بەتیژی دەڕوا گرمەگرمی گوێی پیاو کەڕ دەکا ، ئێرە سەرەڕێی دیاربەکر و میافارقین و حەزوّ و بتلیس و وان و شوێنەکانی دیکەی کوردستانە ، پیاوێکی خێرەومەند لە نەتەوەی عەباسییەکان بە ماڵی حەلالّی خوّی سێ هەزار کیسەی خەرج کردوە و لە هەمو لایێکەوە وەستای لێهاتوی هێناوە ئەم پردەی پێ دروست کردون • ئەم پردە بە گەورەیێ و بەرزێ و قایمی لە هەمو پردەکانی (ئەنەدوّڵ) گەورەترە ، لەم شوێنەدا روبار لایێکی چیایە و لایێکی لمە ، وەستا وای بەباش زانیوە کە پردەکە یەك کڵ بێ ، لە هەر دولاوە بناخەی قوڵ و قایمی بوّ داڕشتوە و ناو قەدەکەی بە قەدەر تاقی کیسرا بەرز کردوّتەوە کە زوّر لە دوررا دیارە ، لەمسەری پردەکە تا ئەو سەری سەد و حەفتا و سێ شەقاوی تەواوە ، پردی (موستار)یش لە ولاّتی ( هەرسك )دا یەك چاوە بەلاّم هیچ پردێك لەجوانێ و رێکێ و قایمیدا ناگاتە ئێرە • جا براخوێنەرەکانم من کە هەمو ژیانی خوّم بە گەشت و گەڕان رابواردوە ، خوا دەزانێ هێشتا توشی دەربەندی وا پڕ مەترسێ نەهاتوم • پێم وایە ئەو کەسانەی عیلمی هەیئەت و حیکمەتیان خوێندوە قەت ناوێرن بەسەر ئەم پردەدا بپەڕنەوە • باری قورس و قەبە دەبێ لە خوارەوە بە کەلەك بپەڕێندرێتەوە ، چونکو وەستاکەی بوّ ئەوەی باری قورسی پێدا نەڕوا ناوەڕاستەکەی زوّر تەسك کردوّتەوە ، پیاو لەسەرەوە زات ناکا تەماشای خوارەوە بکا ، بەلاّم ئەملاولاکانی زوّر بەرینە و لە هەردو سەرەوە دەروازەی ئاسنی تێخراوە ، لە تەنیشت هەردو دەروازەکانەوە خان هەیە کە رێبواریان تێدا بحەسێتەوە •

لە ژێر قەدی پردەکەدا زوّر ژوریان کردوە پەنجەرە و شانشینی تێدایە

که ڕێبوار تێیاندا دەمێنێتەوە بۆ دەمەتەقێ یا کاروباری گومرگ یا ماستی‌گرتن • هەر ئاسنێکی لەم پردەدا کار کراوە هەموی پۆڵای (نەخچەوان)ە ، وەستای ئاسنگەریش هەمو هونەری خۆی تێدا بەکار هێناوە و بە جۆرێك تەلبەندەکانی نەخشاندوە کە شیاوی ئافەرینە •

سەرێکی پردەکە پیاوانی بەگی حەزۆی لێ ڕاوەستاون هەرچی لەولاوە بێ باجی لێ دەستێنن ، لەو سەریش پیاوی بەگی میافارقینی لێیە هەرچی تێپەڕێ هەقی خۆیانی لێ وەر دەگرن • جگە لەو خان و ژورانەی باسمان کردن هیچ خانوی دیکەی لێ نیە • لە دەشتی حەسەنی قەڵای ئەرزەڕۆمدا پردی (چوپان)یش زۆر گەورەیە بەڵام ناگاتە ئەمە • لەسەر ڕوباری (ئیرگانەسی) کە لە چیاکانی ڕەهانەوە دێتە شاری (پروسە) ، ویستویانە پردێکی وەکو پردی بەتمانی لەسەر دروست کەن بەڵام ئەم لەکوێ و ئەو لەکوێ ؟ بە ڕاستی وەستا موهەندیسەکەی چی لەبارا بوە خستویەتە ڕو و درێخی نەکردوە •

لە بناخەی بنەوە تا دەگاتە لوتکەی سەرێ هەموی بە بەردی قەڵای دیاربەکر هەڵچنراوە کە لە ڕەقیدا (بەردەستێ)ی ناگاتێ • ئەو پلەکانانەی حەوسەد ساڵە داندراون دەڵێی ئەمڕۆ لە ژێر دەستی وەستا هاتوتە دەر ، من نەموێرا بە سواری بە سەریدا بڕۆم دابەزیم و بە سەلامەتی پەڕیمەوە ، ئیدی هەر چەندێك لەبارەی ئەم پردەوە بنوسم هێشتا کەمە ، خوا هەر بیهێڵێ ، ئامین •

لێرەوە بە قەراخ ڕوباری بەتماندا بەرەو خۆرهەڵات هاتینە ( خاس چایەر) و حەساینەوە ، هاوڕێکانم خێوەتیان هەڵدا و خێوەت و کەلوپەلی پاشایان لە لایێك لەسەر دانا و ئێسترەکانمان لای خۆمان بەستەوە و نوبەچی‌مان لە چوار لای خۆمان دانا و ئەو شەوە خەو نەچوە چاومانەوە ،

چونکو لەم ناوەدا دزەکانی (تەرجێل) و (ئەتـاق) و (مـەهرانێ) خۆیـان داگرتوە، پەنا بەخوا کل لە چاو و وشە لەدەم دەفرێنن، ئەوەندەی شەڕکەر و ئازان ئەوەندەش لە دزیدا بێ وێنەن•شوێنەکەیان بە خاکی حەزۆ دەژمێردێ• لێرەوە چۆینە قەڵای ( حەزۆ ) •

**قەڵای حەزۆ :**

لە باکوری ئەم قەڵایە کێوێکی گەورە هەیە چیای ( زۆ )ی پێدەڵێن ، لە پێش دروستکرانی ئەم قەڵایەدا (قەرە وێسف خانی قەرەقۆینلۆ) لەگەڵ هۆزی قەرەزۆدا لەم کێوانە بۆن بۆیە ئەم ناوەی بەسەردا بڕاوە ، پاشـان شارێکیان لێرە دروستکردوە ناوی شاری زۆیان لێ ناوە و لە پاشتردا بوە بە قەڵای زۆ • ( حەسەن شا )ی ئازەربایجانی ئێرەی داگـیرکردوە ، پاشـان (تەیمۆری لەنگ) گرتویەتی و کاولی کردوە ، دواتر کەوتۆتە دەست یەکێ لە باپیرانی (عەبداڵ خان) فەرمـانڕەوای بتـلیس و ئەو قـەڵاکەی نـوێ کردۆتـەوە •

ساڵی ٩٢٠ کە ( سەلیم خان ) لە خەزای (چاڵدێران) گەڕایەوە و خانی بتلیس سەری بۆ دانەواند ئەم قەڵایەش خۆی دا بەدەستەوە ، جا لەسـەر فەرمان و دەسخەتی سەلیم خان حکومەتەکەی درایەوە دەست خانی بتلیس• پێش ئەو فەرمانەی سوڵەیمان خان ئێرە یەکێك لەو پێنـج حکومەتـانەی دیاربەکر بوە کە لە لایەن سوڵتانەوە بە نازناوی (جەناب •••) نامەیان بـۆ دەنوسرا •

بەگی ئاڵا و فەرماندەی چەرێ هەیە و قەزاکەی سەد و پەنجا ئاقچەیە ، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردستانە گەلێ جار کارەساتی ئاسمانێ لێ ڕوو دەدا ، کوێخای سوپا و سەرداری یەنیچەرێ و مفتێ و نەقیبی نیە ، هەمو شتێکی

بە دەست فەرماندەی قەڵایە ، تەنانەت قەڵا و جبەخانە و قەڵادار و نەفەرەکانیشی بە دەست فەرماندەیە •

**دیمەنی قەڵای حەزۆ :**

قەڵایێکی بچوك لە سەر ددانە بەردێکی دامێنی چیای زۆ ، چوار دەوری هەزار و شەشسەد شەقاوە ، لای خۆرهەڵاتی حەواڵەی رەوەزی چیای بە سەرەوەیە ، لای قیبلەی بیابانە و دەروازەییێکی ئاسنی تێدایە ، رێگاکەی تا بڵێی سەختە ، زۆر بە نارەحەتی پیاو لە سەرەوە دەگاتە خوارێ ، لە ناو قەڵادا سەد و پەنجا خانوی قوڕی بێ باخ و باخچەی هەیە ، نیوەی راستی قەڵاکە سەرای فەرماندەکەی (مورتەزا بەگ) داگیری کردوە کە هەموی ژوور لەسەر ژورە ، ئەم مورتەزا بەگە زاوای عەبدالخانی بتلیسە و هەتا بڵێی پیاوێکی نەجیب و خانەدان و قسەزان و سەخییە ، زۆر دەست و دڵپاك و چاو نەترس و لەسەرخۆ و قارەمان و مەردی مەیدانە ، شەوێك لە سەراکەیدا میوانی بوم ، لە ناو سەرادا عەمباراوی هەیە • لە ناو قەڵادا مزگەوتێك هەیە • خانوەکانی دیکە هەموی لە خوار قەڵادان •

**شاری حەزۆ :**

لە دامێنی قەڵا رو بە قیبلە لە سەر پارچە زەوییەکی بەریندا هەزار ماڵێکە ، خانوەکانی بە قوڕ سواخ دراون ، لە ناو بازاڕدا مزگەوتی شەرەف خان بەناوبانگە ، گەرماوێکی پیسی بچوك و سێ دوکانی تێدایە ، ئەم فەرمانڕەوایەی ئێستا (مورتەزا بەگ) خانێکی دروست کردوە دەڵێی قەڵایە، لەبەر ئەوەی ئێرە رەقەن و بەردەڵانە باخاتی باشی نابێ ، خەڵکەکەی ئازا و بەجەرگن و سوار و پیادەیان ناودارن ، لە شیر وەشاندنی شێخانێ و مەقراوێ و زوزەکیدا و لەنیشان پێکانێ تیر هاویشتندا بێ هاوتان ، نوێژکەر و شافعین ، هەر چەندە کوردەکانی (خالتێ) و (چەکوانێ) و (زیباری)

دێنه کوێستانه‌کانی ئێره به‌ڵام ئه‌مان زۆر خۆیان تێ ناگه‌یێنن • له‌پاش چاوپێکه‌وتنی ئێره مورته‌زا به‌گ پیاوی له‌گه‌ڵ ناردم چۆم لای خواره‌وه‌ش گه‌ڕام ، هه‌مو‌ی به‌رد و چیا و دۆڵ و ره‌قه‌نه و له‌ژێر فه‌رمانی به‌گی حه‌زۆدایه •

سوپاس بۆ خوا لێره‌دا چاوم به مه‌لیك ئه‌حمه‌د پاشا که‌وته‌وه و پاش ده‌ست ماچکردنی نامه‌کانی مسته‌فا پاشای فیراریم دایێ و ئه‌و که‌لوپه‌لانه‌ی نوسرابون گه‌یاندم ، پاشا زۆری پێ خۆش بو ، خێوه‌ته‌کانی به‌سه‌ر ده‌ستو پێوه‌ندا دابه‌ش کرد و سێ و حه‌وت کیسه هه‌قی ئالیکی دا به عه‌سکه‌ره‌کان • خوا ره‌حمی کرد منیش ئه‌رکی ئاگاداریێ ئه‌و که‌لوپه‌لانه‌م له‌کۆڵ بۆوه •

بۆ سبه‌ینێ ئه‌و هه‌مو سوپا زۆره به ناو به‌رده‌لانێکی سه‌ختا هاتین له‌ قسنی (سوڵتان وه‌یس) قۆناخمان گرت که سه‌ر به‌خاکی حه‌زۆیه ، مه‌رقه‌دێکی زله له ناو گردێکی به‌ریندا به ته‌نیشت کانیاوێکه‌وه ، ئه‌م وه‌یسه ( وه‌یسی قه‌ره‌نی) نیه، ئه‌و له قرزی یه‌مه‌ندا نێژراوه، ئه‌میان له نه‌ته‌وه‌ی عه‌باسییه‌کانه و به شایه‌تی دنیا ده‌ستی هه‌ڵگرتو و بوه به شای ته‌ریقه‌ت ، منیش چومه زیاره‌تی یاسینێکم بۆ خوێند و زۆر پاڕامه‌وه ، شیعرێکیشم له دیواره‌که‌ی نوسی •

لێره‌وه هه‌ر به‌ناو کوچك و کوڵۆ و به‌رده‌لانێدا روه‌و خۆرهه‌ڵات هاتینه قه‌ڵای ( کفندر ) •

**شاری (جالندر) یا قه‌ڵای (کفندر) :**

ئێره‌ش خاکی کوردستانه • له ساڵی ٩٢٠دا که مامۆستای مێژونوسان (شه‌ره‌فخان) سه‌ری بۆ (سوڵتان سه‌لیم) دانه‌واند ، سوڵتان ئه‌م قه‌ڵایه‌ی پێشکێش کرد و خستیه سه‌ر حکومه‌ته‌که‌ی ، ئێستا سه‌ر به بتلیس و له ژێر ده‌ستی خانی بتلیسدایه و جێگای میراوه •

قەڵاكە لە ناو دۆڵێكدا لە قەراخ رۆبار لەسەر پارچە رەوەزێكی سەوز رەنگ بنیات نراوە ، بچكۆلەیە و خەرەندی نیە ، یەك دەروازەی هەیە ، لە ناوەوە مزگەوتێك و حەفتا هەشتا ماڵێكی تێدایە و هیچی دی ، قەڵا دار و نەفەراتی لە لایەن خانەوە دیار دەكرێ ، ئێرەش هەر بە وان دەژمێردرێ • لە دەرەوەی قەڵاش حەفتا هەشتا خانوی قوڕی لێیە و بێ دوكان و بازاڕە •

لەم قەڵای كفندرەوە بەرەو باشور لە ژۆر چیا بەرزەكانەوە قـەڵای (زریقێ) دەبیندرێ • بەگی ئێرە زۆر دیاری بۆ پاشا هێنا و پاشا خـەڵاتی كرد و گەڕایەوە• ئێمەش لەگەڵ پاشا بارمان كرد و بەرەو خۆرهەڵات دیسان بە رێبازێكی زۆر سەخت و ناخۆش بە قەراخ رۆباری بتلیسدا هاتینە دەشتی (چەمەندرێ) كە بەشێكە لە چیاكانی زریقێ • لەم شوێنەدا رۆباری بتلیس بەناو دۆڵێكی زلدا دەڕواتە خوار و لەولای قەڵای حەسەنكێف تێكەڵ بە دیجلە دەبێ •

## چاوپێکەوتنی مەلیك ئەحمەد پاشا و خانی پایەبەرزی بتلیس و میوانداری گەورە

لەناو ئەو بەردەلانییەدا عەسکەری ( عەبدال خان ) دەرکەوت ، کە گەیشتنە پێشەوە خان لە ئەسپ دابەزی و بەرەو پاشا هات، پاشاش دابەزێ و باوەشیان پێکدا کرد ، پاش ماچکردن و چاکوچۆنێ خان گوتی « فەرمۆن سوار ببنەوە و لەم نزیکانە بەرقەلیاتێك بخۆن » ، پاشا سوار بۆوە و ئەو سوپا گەورەیە کەوتەوە رێ و هەشت قات تەپڵ لێدرا ، کاتێکمان زانی لە ناو ئەو مێرگەدا بە شێوەی عەجەمێ و کوردێو تورکمانێ سەرانسەری ئەو دەشتە بە ئۆبەی تورکمانێ و خێوەتی عوسمانلێ و رەشماڵی کوردێ رازاوەتەوە .

پاشا دابەزی و چوە ناو ئەو بارەگایەی بۆی رێکخرابو ، هەر دەزبەجێ سفرەیێکی محەمەدێ رازێنرایەوە ، لەنگەری زێڕ و زیو و بەلەم و قاپی فەخفورێ ریزکران ، سێ هەزار عەسکەری پاشا و سێ هەزار نۆکەر و خزمەتکاری خان و هەمو ئەو پیاو ماقولانەی هاتبونە پێشواز و تەواوی ئەو حەشامەتە کوردە لەو نان و خوانە تێریان خوارد و هێشتا خواردنێکی زۆریش لەو ناوەدا مابۆوە ، لە کاتی هەستانماندا خانی پایەبەرز سەری بۆ پاشا دانەواند و دوازدە کوڕی خۆی و حەفتا بەگی سەرەك عەشیرەتی کوردی

له خزمه‌تیا راگرت و پێی گوت «گه‌وره‌م ، ئه‌و حه‌وت خه‌یمه و خه‌رگایه‌ی تێیدا حه‌سانه‌وه له‌گه‌ڵ په‌نجا قاپی زیو و سه‌دی فه‌خفوری و هه‌مو فه‌رش و به‌ڕه و حاجه‌ته‌کانی دیکه ، تکام وایه لێم قبوڵ بفه‌رمون . هه‌روه‌ها چوار چه‌رکه‌س و چوار ئه‌بازه و چوار گورجی که خولامی تایبه‌تین پێشکێشتانه» .
پاشا خه‌نجه‌ره تیژه‌که‌ی قه‌دی خۆی که هی سولتان مراد خانه هه‌ڵی‌کێشا و له‌به‌ر پشتی خانی چه‌قاند ، سمۆرێك بۆ خان و سێ که‌وڵ بۆ کوڕه‌کانی و سه‌د و حه‌فتا پشتێنی زێڕدرو و چه‌ند خه‌ڵاتی گرانبایی دیکه بۆ ده‌ستوپێوه‌ندی خان دابه‌شکرا .

پاشا سوار بوه‌وه و ته‌پڵ لێدرا ، به ناو ئه‌و دۆڵ و گردانه‌دا رومان کرده شاری بتلیس . له‌و کاته‌دا دیتم که هاوده‌مه‌کانی خان له‌ده‌وری کابرایێك کۆ بونه‌ته‌وه و قاقا پێده‌که‌نن . پێم سه‌یر بو که ئه‌م گاڵته بێ‌تامه ده‌بێ چی بێ و لێ‌یان چومه پێش .

**دیمه‌نێکی سه‌مه‌ره :**

کابرایێکی کوردی عاجباتی ، مێزه‌رێکی به قه‌ده‌رایی هێلانه له‌گله‌گ له‌سه‌ر ، ریشێکی سور و سپی و زه‌رد و شین تێکه‌ڵ و درێژ تا ناوقه‌دی که ته‌نیا به که‌ڵکی تۆپی ره‌مه‌زانان دێ ، سواری ئه‌سپێك بوه چ ئه‌سپ ، په‌لی بۆ پێشه‌وه داوێ پاشوی ده‌گه‌ڕێته‌وه دواوه ، لیکاو به چاو و لوت و زاریدا دێته خوار ، روناکی له چاویدا نه‌ماوه ، له‌شی وه‌کو جۆلانه‌ی شه‌ق و شڕه په‌راسو و ئێسکه‌کانی له‌شی به جوانی دیارن ، وه‌کو سه‌رخۆش ده‌له‌رزێ و به‌ملاو لادا له‌تر ده‌با ، خورجێنێکی زلی به پشتیدا شۆڕ کردۆته‌وه و مارێکی زیندوی کردوه به قه‌مچی . به‌م حاڵه‌شه‌وه هه‌ر داده‌به‌زێ و سوار ده‌بێته‌وه و ئه‌و عاله‌مه پێی پێده‌که‌نن .

**خزمه‌تکارێکی خان که ناوی (قوربان عه‌لی) بو لیره‌یێکی دایێ و پێی**

گوت «گیانەکەم (مەلا محەمەد) غارێك بەم کەهێلەیەت بـکە ، » منیـش گوتم «کوڕە غاری چی ، ئەم کلۆڵە هەر بجوڵێتەوە بەغار دەگاتە ئەو دنیا » هەر من وام گوت کابرا لاقی لە پەراسوی بارگیرەکەی توند کرد و مارێکی لێ راکێشا دیمەنێکی باوەڕنەکراوم چاو پێکەوت ، ولاخ خۆی خڕکردەوە و هەر وەکو بروسکە بە تەنیشت پاشا و خاندا بە ناو ئـەو بەرد و کەنـد و کلۆیەدا فڕکەی کرد ، ئێمە واقمان وڕ مابو کەچی عەسـکەرەکانی خـان پێدەکەنین و دەیانگوت پێتان سەیر نـەبێ ! کابرا لەو سـەرەوە دیسـان بەرداوبەرد هەروا بە گورجی گەڕایەوە و هاتەوە ناو عەسـکەری خـان ٠ چومە لایەوە بزانم ئاوێك شتێك دەدا بە بارگیرەکەی بەڵام هیچ هەروەکو پێشو چاوەکانی بێ روناکین و لیکاوی پێدا دێتە خوار ٠٠٠ خوایە ئەمـە چییە ؟ کابرا تەماشایێکی کردم و بە بزەیێکەوە گوتی « ها کابرا ، بۆ وا تێم هەڵدەڕوانی ، دەیکرێ ؟ ئەم ئەسپە میراتی باپیرە گەورەمە ، ئەم پاشایەت داوام لێ بکا نایدەمێ ، هەرچی دنیا هەیە بیخەنە بەر دەمم پێی ناگۆڕمەوە» گەلێك فشەی لەم بابەتەی کرد ٠

سەرقەننەداری خان مستەفا گوتی « (ئەولیا چەلەبی) تۆ پێت وایە ئەم ئەسپە تۆپیوە چی بێ باشە ؟ ئەمە کۆلکەدارێکی کۆنی ناو تونی ماڵی خانە، خان ئەسپێکی نەدا بەم مەلایە سوار بێ گوتی تۆ بۆ ناو سوپا دەست نادەی ئابڕومان دەچێ ئەویش چو ئەم کۆلکەدارەی کرد بە ئەسپ و سواری بو و ئەوا ئەم بەزمەی کرد کە چاوت پێکەوت ، بەڵام خان لەمە زۆر تورەیـە ، دەڵێ نەوەکو پاشا وا تێبگا کە خان جادوباز و کیمیاگەر رادەگرێ ٠ » من بە بیستنی ئەمە هۆش لە سەرما نەما گوتم « کوڕە لاچۆ قەننەدارباشی ، تو زاتی خوا ئەمەت بەراستە ؟ » گوتی بە گیانی پاکی سوڵتـان ئەوحەدوڵـلا سوێندت بۆ دەخۆم کەم و زیادی نیە ، ئەم مەلایە پیاوی گاڵتە و گەپ نیە، جاری وا هەیە سواری کوتە ئاسنێك دەبێ یا تەختەیێك ، یا کوندەیێك فـو

دەکا و سواری دەبێ دەکەوێتە ڕێ ، هەندێ جاریش سواری پشیلە و مەڕ و سەگ و ئەم جۆرە گیانلەبەرانە دەبێت و وەکو دوڵدوڵی (ئیمامی عەلی) غارغارێنیان پێدەکا .» من کە باوەڕم بەم جۆرە شتانە نیە تکام لە قەنەدار باشێ کرد کارێکی وا بکا بە چاوی خۆم ببینم ، ئەویش گوتی قەیدی نیە وەرە لەگەڵما . پێکەوە شوێن (مەلا محەمەد) کەوتین دیمان کە لە دەرگای ئەولاوە چوە ناو باخ و یەکسەر ڕوی کردە تونخانە ، ئێمەش دابەزین و بێ هەست شوێنی کەوتین ، من خۆم و سێ نۆکەرم دیتمان کە لە ئەسپەکەی دابەزی مارەکەی دەستی خستە ناو خورجێنەکەی و پەڕۆیێکی لەو خورجێنە دەرهێنا زاری ئەسپەکەی پێ بەست و یەك بە خۆی قیژاندی ، هەر ئەوەندەمان زانی دنیا تاریك داهات و چاوم هیچی نەدی ، کە ڕوناك بۆوە کۆلکەییکم چاو پێکەوت لە جێی ئەسپەکە داندراوە ! .

قەنەدار باشێ پێی گوت « ها مەلا ، ئەسپە خۆشبەزەکەت لەم تونخانەیەدا بە ستۆتەوە ؟ » مەلاش بەبێ حاشا کردن گوتی «داوام لە خان کرد ئەسپێکی خراپۆکەی نەدامێ سواری بم ، منیش وام کرد ، وەڵلاهی هەق وابو سواری ( بەخدۆ )ی سەرەك فەڕاش سەرا بومایە ، بەڵام لەشکری عوسمانلی هات و پێم نەکرا ، ناچار سواری ئەمە بوم . » پاشان لێی پرسی ئەمانە کێن ؟ پێی گوت ئەمە هاودەمی پاشایە و پیاوێکی موسڵمان و قورعان خوێنە ، مەلا کەیفی خۆش بو و لەگەڵمان بو بە برادەر ، خوا یاربێ لە شوێنێیکی دیکەدا باسی کردەوە سەرسوڕێنەرەکانی دەکەم .

مەلیك ئەحمەد پاشا بە سوپای گەورەوە بە ناو شاری بتلیسدا هات و خەڵك لە ڕاست و چەپی ڕێبازەکانی ڕاوەستابون بەخێرهاتنیان دەکرد ، ئەویش ئەوەندەی زێڕ و دراوی وردە بەسەردا هەڵدان کە لە ژمارە نایێت . جا چونە باخی خانی پایەبەرز میوان بوین و فەرمان درا بۆ ماوەی دە ڕۆژ

لێرە دەحەسێنەوە • ئێمەش دەستمان کرد بە گەڕان و تەماشای شاری بتلیس •

**شارە کۆنی بتلیس :**

لە مێژوونوسانی رۆم و عەجەم (مەقدیسی)و خاوەنی شەرەفنامە (سولتان شەرەفەددین) دەڵێن کە (ئەسکەندەر) دو پارچە زێدە گۆشتی لەملاو لەولای سەریەوە دەرچو بون وەکو دو شاخ وابون، بۆیە پێیان گوتوە (زولقەرنەین) واتا خاوەنی دو شاخ ، هەندێکی دیکە پێیان وایە کە هەمو سێ و دو سالێك قەڕنێکە ، ئەسکەندەریش دو سێ و دو سالی فەرمانڕەوایی کردوە بۆیە وای پێدەڵێن •

کاتێ (ئەسکەندەر) ئێرە دەگرێ دێتە قەراخ زێ و لەم ئاوە دەخواتەوە دەبینێ بۆ چارەکردنی ئازاری لەش زۆر بەکەڵکە ، دێتە دیاربەکر و لەوێوە بە رۆخی بەتساندا دەگاتە خوار قەڵای ( کفندر ) ، لەو ئاوە دەخواتەوە کە لە کانیاوی چیاکانی بتلیس دێنە خوار ، چاوی رون دەبێتەوە ، کە دەگاتە بتلیس دەبینێ کە روبارەکەی دەبێتە دو کەرت ، لە ئاوی ئەو کاتییە دەخواتەوە کە لە دۆڵی (ئۆیخ)ڕا دێ هیچ کەڵکی لێ دەست ناکەوێ بەڵام بە خواردنەوەی ئاوی چیاکانی لای راستی بتلیس خەوێکی خۆشی لێدەکەوێ • حەوت رۆژ دەمێنێتەوە و لەسەر خواردنەوەی ئەو ئاوە دەڕوا هەر نەخۆشییێکی لە لەشدا دەبێ دەیپەڕێنێ ، بانگ دەکا « دا بدلیسی خزمەتکارم بۆ بانگ کەن» کە دێ (ئەسکەندەر) پێی دەڵێ « نۆکەرە دڵسۆزەکەم ، لە ماڵی من چەند هەزار کیسەت دەوێ خەرجکە و لەم شوێنە قەڵایێکی وام بۆ بنیات بنێ کە لەوسەر گەڕامەوە بە هەمو هێز و تەقەلای خۆم نەتوانم بیگرم •» جا لەسەر ئەو فەرمانە بدلیس هەرچی وەستا و زانای ئەندازیار هەیە خڕیان دەکاتەوە و دەست دەکرێ بە دروست کردنی قەڵا •

(ئەسکەندەر) ٨٨٢ ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەر مردوە • قەڵاکە تەواو دەبێ و ئەسکەندەریش لە شەڕی (چەماپۆر) دەگەڕێتەوە و گەمارۆی قەڵا دەدا بۆی ناگیرێ ، داوا لە بدلیس دەکا بێتە دەرێ نایێ • بڕوا دەکا کە نۆکەرەکەی لێی یاخی بوە ، بە هەمو سوپا و لەشکریەوە شەبەیخون دەکاتە سەری سودی نابێ • نامەیێك بۆ بدلیس دەنێرێ کەوا بەخشیمی بەسیەتی وەرە دەر ، بدلیس گوێ ناداتێ و لە قەڵاوە بە تیر و بەردی مەنجەنیق بەر دەبێتە گیانی لەشکری ئەسکەندەر و زۆریان لێ دەکوژێ ، ئەم حاڵە چل رۆژ دەخایەنێ ، رۆژی چل و یەکەم لە کونی ئەشکەوتێکی ژێر قەڵاوە ژەنگە سورە بە هەزاران دێنە دەر کە یەکی ئەوەندەی پاساریێك دەبن ، دەکەونە ناو سوپای ئەسکەندەر و ئیدی زەلام و وڵاخ لەو ناوە خۆی ناگرێ و بڵاوەی لێ دەکەن ، ئەسکەندەریش کە لە تاو ژانی زگی ئارامی لێ هەڵگیراوە رو دەکاتە بیابانی ( موش ) •

پاشان بدلیس بە شەڕکەر و خەزینەکانیەوە لە قەڵا دەردەچێ و کلیلەکانی قەڵا دەخاتە سەر قاپێکی زێڕ و دەیباتە بەردەمی ئەسکەندەر و کڕنوشی بۆ دەبا ، ئەسکەندەر دەڵێ «هەی بێدین ، ئەوە بۆچ لێم یاخی بویت و ئەو هەمو سەربازەت لێ قڕ کردم ؟ » بدلیس دەڵێ « بۆچی قوربان لە بیرت چو خۆت فەرمانت دامێ قەڵایێکی وا بنیات بنێم خۆشت نەتوانی بیگری ؟ » ئەسکەندەر دەیبەخشێ و فەرمانڕەوایی قەڵا دەداتەوە بە خۆی ، جا قەڵای بدلیس بە هەڵە کراوە بە بتلیس • لەبەر ئەوەی یەکەمین بنیاتی بە دەستی ئەسکەندەر بوە مێژونوسانی عەجەم ناوی (تەختگای ئەسکەندەر)ی لێدەنێن ، وینانەکان بەم شارە دەڵێن (پزگار مگال ئالەکساندرە) واتا قەڵا گەورەکەی ئەسکەندەر • ئێستاش لە زۆر لایەوە شوێنە واری دەسکردی رۆمی پێوە دیارە ، خوا یار بێ لە کاتی خۆیدا دەینوسین •

ئەم قەڵایەی کوردستان لە چەند شاوە بۆ شایەکانی دوای خۆیان

ماوەتەوە ، فەرمانڕەواکانی ئازەربایجـان وەکو (وێسفی قـەرە قوێنلی) و ( حەسەنە درێژی ئاق قویونلی ) گرتویانە و تییدا ماونەوە • یەکەمجار لـە سەردەمی عەباسییەکاندا ( سولتـان ئەوحەدوللا ) لـە دەسـت رۆمییـە مەسیحتییەکانی دەرهێنا ، پاشـان ( حەسەنە درێژ ) لە وانی سەنـد و سالی هەشسەد و شێست و هەشت ئەو حەسەنە لە دەشتی تورجاندا شکا و ئێـرە کەوتەوە دەست بنەماڵەی (سولتان ئەوحەدوللا)• پاشتر لە سالی ١٩٢٠دا کە خانی بتلیس سەری بۆ سەلیم خان دانەواند ئێرە کرایەوە بە حکومـەت و بە سەربەخۆیی درایەوە دەست خۆیان • لە فەرمانەکانی سولتانیدا نازناوی (خانی عالیشان ــ خانی پایە بەرز)یان بۆ دەنوسرێ •

**شێوە و زەوییەکەی قەلای بتلیس :**

لەسەر بەردەلاتێکی پانی نێوان کێوی ( دیوان ) و کێوی (ئۆیخ) دا کە لای راستی شوێنی تێکەڵبوونی دوو روباره و لای چـەپی دۆلی ئۆیخـە رەوەزێکی بەرزی وا هەیە کە لوتی لە هەورانە ئەم قەلایەی لە سەر دروست کراوە ، بەردی بیناکە یەکی ئەوەندەی لەشی فیلێکە ، لە خوارەوە بۆ سەرێ شەشسەد شەقاوە و رێگاکەی زۆر سەختە ، لە چەشنی لاکێشی هەلکەوتوە لە خۆرهەلات وە بـۆ خۆراوا • بورجی لای خوڕهەلاتی هێجگار بەرزە و دۆلی خوارەوەی وەك شیوی دۆزەخ قوڵە ، چالاوێك لە ناو ئەو بورجەدا هەیە کە هەتا خواری خوارەوەیە ، ئەو کەسـانەی فەرمانی کوژرانیان دەر دەچی دەیانهاوێنە ئـەم چـالاوە و ئیدی تا دەگەنە خوارەوە هەپروون بە هەپروون دەبن ، بۆیە بەم بورجە دەلێن ( قوللەی خوێناوی ) •

لە سـوچی لای خۆراوای قوللەکەی دیکەدا لە نزیك سـەرای خان جبەخانە داندراوە ، تێگڕا شـەشسەد و حەفتا ددانە و بەدەنەی هەیـە کە هەمویان کون و مەتەرێزیان بۆ کراوە و لە خوار ئەوانیشەوە دیسان کونی

تیر و گولله هاویشتن هەیە ، دیوارەکانی بە جۆرێك توێ توێ کراون کە لاقەدی قوللەکان لە یەکتر دیارن ، هەمو قوللەکان ماڵی دیدەوانیان تێدایە ، لە خوارەوەڕا رێگای چونە شار هەیە ، سێ قات دەروازەی ئاسنی بۆ کراوە کە لە نێوانی ئەو دەروازانەدا زۆر جۆرە چەك ئامادە کراوە ، دیدەوانەکانی شەو و رۆژ وریان ، هیچ ژن یا پیاوێك رێگا نادرێ بچێتە ژورەوە •

لەبەر ئەوەی هەر چوار لای قەڵا گەلێ قوڵی وایە لە چاڵاوی بابل قوڵترە پێویستی بە خەرەند نیە ، هەمو لایەکانی رەوەزی بەردی یەکپارچە و لوسە کە سەری گەیوەتە هەوران ، چواردەورەی دو هەزار و نۆسەد شەقاوە ، بەڵام لای سەرا لەبەر ئەوەی ماڵی خانی لێیە نەمتوانی بیپێوم ، ئەویش لە هەزار شەقاو پترە ، بەو پێیە دەوراندەوری چوار هەزار شەقاو دەبێ ، دیوارەکانی بەرزایی هەشتا و پانایی دە گەزە ، ناو قەڵا سێسەد ماڵی لێیە ، نیوەی ئەو ناوە سەرای خان گرتویەتی کە نهۆم نهۆم لەسەر شێوەی رۆم و عەجەم ژوری خۆش و هۆڵی جوانی بۆ کراوە ، هەر خانێك هاتوە بەشی خۆی دەسکاری کردوە ، بە تایبەتی ( عەبداڵ خان ) کە چەند خەزێنەی تێدا خەرج کردوە و سەراییێکی لەسەر وێنەی سەرای (فیداقا) رێك خستوە• هەمو پەنجەرە و شانشینی‌یەکانی لە سەر بورج و دیوارەکانن و لە شاری بتلیسەوە چیای (دێوان) دیارە • ناو رەوەزەکانی ئەشکەوتی زۆری تێدایە کە پڕ کراون لە دەخڵ و دانەوێڵە ، لە نێوان ئەم ئەشکەوتانەدا رێگای چونە خوارەوە بۆ سەر ئاو هەیە ، جگە لە مزگەوت و مەدرەسەیێك خانوبەرەی گەورەی لێ نیە •

**ئەیالەت و حکومەتی بتلیس :**

حکومەتێکی سەربەخۆیە لە ئەیالەتی واندا ، داهاتەکەی بە فەرمانی سوڵتان بۆ خانە • هەمو رۆژێ لە داهاتی ئەم ئەیالەتە یەك کێلە ئاقچە بە خان

دەبڕێ ، لە روتبەدا پایەی وەکو پایەی ئەیالەتی وان وایە ، بە دوو هەزار عەسکەرەوە حکومەت دەکا ، شەڕێك بقەومێ یا بۆ ئاوەدان و تازە کردنەوەی وان بانگ بکرێ لەگەڵ سەرداری وان هاوشانن • ئەو کاروانانەی دێنە ناو شار باج و گومرگیان بۆ خانە و رەعیەکانی عەرەب و یەعقوبیەکانی نـاو شار جزیە دەدەن بە خان • ساڵە و ساڵ لە وانەوە ئاغایێك دێ بەشە خەرجی خۆی دەدرێتێ تا لەو بەشە مەعاشی پیاوەکانیبدا • خەرج و باجی دەشتی (مۆش) لەسەر فەرمانی سوڵتان دراوە بە خان و هی خۆیەتی ، خانیش لەو خەرجە مەعاشی قەڵادار و دووسەد نەفەری نـاو قەڵاکە دەدا ، کلیلی قەڵای ئێرە شەو و رۆژ لە کن خان خۆیەتی • حکومەتێکی ئە ئاوا سەربەست و بەر بڵاوی هەیە •

**سنووری ئەیالەتی بتلیس :**

لای خۆرهەڵاتی دەگاتە ( تەحتی وان) کە شوێنی سەر میراوەتی قەراخ دەریای وانە ، هەر لەلای خۆرهەڵات قەڵای (وەستان)ی هەکاریش هەیە ، لای باکوری (شیروان)ە و لای قیبلە هاوسنووری (هێزان)ە ، دیسـان هەر لەلای قیبلە قۆناخێك دوور دەگاتە سـنووری بەگی (زرقی) ، لای خۆراوا بە سێ قۆناخ دەگاتە بەگی (حەزۆ)ی سەر بە دیاربەکر، هەروەها بە سێ قۆناخ ئەولاتر روەو باکور لەگەڵ بەگی (تەرجیل) و بە چوار قۆناخ لەگەڵ بەگی (چپاقچور)دا هاوسێیە ، لای ئەستێرەی دەشتی (مۆش) و خاکی (نامرودان)ی ئەرزەرۆمە ، لە لای باکورەوە بە سێ رۆژ دەگاتە (مەلازگرد)ی سـەر بـە ئەرزەرۆم ، لای باکوری خۆرهەڵاتی سنجاقێکی وان بەگی (ئەخلات)ە لە رۆخی دەریا • تەنیا لای خۆرهەڵاتی بێ پەیوەندتیە کە ئەویش دەریای وانە•

خان حەفتا هۆز و عەشیرەتی لە ژێر دەستایە ، یەك لە وان عەلی بەگی هۆزی (مودەکی)یە کە ، تەنیا خۆی حەو سەد تفەنگ بە دەستی هەیە ، هەر

سەعاتێ خان ئارەزو بکا دەتوانێ لەمانە حەفتا هەزار شەڕکەر کۆکاتەوە ، شاری بتلیس چل هەزار کەسی تێدایە کە هۆزی (ڕۆژەکی)یان پێدەڵێن •

ئەمانە وەکو کوردەکانی دیکە ئازاو شەڕکەر نین ، دەستوپێ سپی و ردێن بەخەنە و چاو بە کلن ، پاك و خاوێن و قسە خۆش ، بە پێی دەفتەری خان لە بتلیسدا چل و سێ هەزار رعیەتی مەسیحی هەیە ، نیوەی سەرانەی ئەمان هێز وەری دەگرێ و نیوەی بە عەبداڵ خان دەبڕێ • ئەم ئەیالەتە ١٣ زەعامەت و ٢١٤ تیمارە ، بەگی ئالآ و گەورەی چەری و ویزباشی هەیە ، بە پێی قانون خاوەنی سێ هەزار عەسکەری جبەلەبەرە کە لە ژێر فەرمانی خاندا لەگەڵ ئۆردوی وان بۆ شەڕ دەچن • روتبەی قەزای بتلیس سەد و پەنجا ئاقچەیە ، حەڤدە ناحیەی لە ژێر قەزادا هەیــە کە ناودارەکانیان مردەکی ، ستورپ ، کوار ، کواش و زەردە خانن ، قازتیەکەی ساڵانە هەشتا کیسەی پێ دەبڕێ و ئەگەر لەگەڵ خاندا رێك بکەوێ زیاتریش دەسکەوتی دەبێ ، مفتی و نەقیبی شافعی و قەڵادار و باجدار و شابەندەری هەیە کە هەمویان لە لایەن خانەوە دادەندرێن ، تەنیا ئاغای خەرج و سەرداری یەنیچەری لە لایەن سوڵتانەوە دیار دەکرێن • هەروەها دارۆخە و قەپاندار و ئەمینداری بۆیەی هەیە •

**مزگەوتە گەورەکانی بتلیس :**

سەد و دە میحرابی هەیە ، هەرە گەورەکەیان مزگەوتی قەدیمی سوڵتان شەرەفەددینە ، ئــەم مزگەوتە لە قەراخ کانی ئەســکەندەر لەسەر پردەکە دروست کراوە و چاك رازاوەتەوە ، گومبەز و تاقەکانی قایمن ، منارەیێکی راست و بڵندی هەیە کە نەك هەر لە بتلیسدا بەڵکو لــە هەمو کوردستاندا وێنەی نیە ، لە قــەڵای ژورو مزگەوتی (بدلیس) هەیە کە بنیاتنەری شــار (بدلیس) دروستی کردوە ، لە پێشدا دێر بوە و دوایی (سوڵتان ئەوحەدوڵڵا)

کردۆیەتیە مزگەوت . مزگەوتێکی کۆنی بێ حەوشە و بێ منارەیە ، مزگەوتی (سەراج خانە) لـە وارشی خوارەوەیەو خەڵکێـکی زۆر ڕۆی تێدەکەن ، ئەمیش بێ حەوشە و منارەیە • مزگەوتی ( شەرەف خان) لە مەیدانی جلیت بازێدایە زۆر جوان و نوێیە • مزگەوتە گەورەکانی ئەمانە بـوون کە ناومان هێنان •

خۆشـی ئەوەیە تەواوی ئـەو مزگەوتانە مافورەی عـەجەم و لبادی ئیسفەهانیان تێدا ڕاخراوە و سۆبەی گەورەشی تێدا داندراوە کە بە پارەی وەقف ئاگری تێـدا دەکرێتەوە ، زسـتانان دەرك و پەنجەرەکانیان کونبڕ دەکەن و ژوورێ وەکو گەرماوی لێدێ • جا فەقێ و مەلا خەریکی لێکوڵینەوە دەبن و زانیاری خۆیان زیاد دەکەن، تەنانەت ئاوی حەوز و ئاودەستەکانیشیان گەرم دەکرێ • ئەوانەی لە دەرس خوێندن دەبنـەوە لەلاییەکەوە خەریکی یاری شەترەنج دەبن ، بە مەزەبی شـافعی شەترنج کردن حەڵاڵە ، بـەڵام هەندێ جار هەرای لەسەر پەیدا دەبێ و گوایا جارێکیان پیاوێکیشی لەسەر کوژراوە و دوای ئەوە یاساخ کراوە، بەڵام وا دیسان دەستیان پێ کردۆتەوە• مەلای کوردەکان هەمویان بە خەنجەرەوە دەگەڕێن •

مزگەوتەکانی دیـکە : مزگەوتی قوڕیشـی ، مزگەوتی عەلەمدار ، مزگەوتی مەمی دەدە ، مزگەوتی شێخی عارەب ، مزگەوتی شێخ ئیبراهیم ، مزگەوتی عـەینول برۆد ، مزگەوتی کوڕی ئەفسـەل کە لە قەراخ ڕوباری حسولدایە ، مزگەوتی شێخ حەسەن ، مزگەوتی کوێـخا عومەر ، مزگەوتی خسرەو پاشا ، مزگەوتی موغارە ، مزگەوتی زەیدان و مزگەوتی مەلا قاسم• ئەم مزگەوتانەش وەکو گەرماوەکان ئاوی سارد و گەرمیان هەیە •

**مەدرەسە ـ حوجرە ـ کانی :**

مەدرەسەی سولتان شەرەف ، مەدرەسەی کوتەك مەیدان ، مەدرەسەی

وەرسنکی حاجی بەگ و مەدرەسەی خەتیبییە • مزگەوتەکەکانی جومعە و مەدرەسەکان هەر یەکی یەك مودەڕیس و یــەك یا دوو مامۆستای دەرســی گشتی یان هەیە، خەلکەکەی هەتا بلێی زیرەك و تێگەیشتوون و لەم مەدرەسانەدا خەریکی فێربوونی عیلمی حەدیس و تەفسیری قورعانن •

**قوتابخانەکانی :**

بتلیس حەفتــا قوتابخانەی تێدایە ، هەرە بــاشەکانیان قوتــابخانەی شەرەفخان و قوتابخانەی خسرەو پاشا و قوتابخانەی خاتونیە و قوتابخانەی بازاڕ و قوتابخانەی بەشارەت ئاغان •

ــ حەفتا کانی و چل و یەك سەبیلاوی هەیە ، سەبیلی خسرەو پاشا و سەراج خانە و زێڕنگەران بە ناوبانگن •

ــ نزیکەی بیست تەکیەی نەخشبەندی و گوڵشەنی و بەکتاشی تێدایە•

**گەڕەکەکانــی :**

گەڕەکی خســرەو پاشا ، شام ، زینــدان ، چورقوم ، چینەدار ، قزل مەسجید ، شێخ حەسەن ، جیرك ، کەچور ، کوتــەك مەیدان ، کۆمۆس ، تەقلەبان ، نەخشود ، پردی عارەب ، مەیدانی ئۆول ، قەرەدەرە ، ئــاوێخ ، دەگرمان و باخی خان • یازدە گەڕەکی عارەب و مەسیحی تێدایە ، بەڵام لەم شارەدا جوولەکە و فەڕەنگ و وێنانی نیە • مەسیحیەکانی ئێرە بازرگانی زۆر قورس و دەوڵەمەندن •

**سەراکانی :**

سەرای خان ، سەرای بەشارەت ئاغا ، سەرای لالە مستەفا ئاغا ، سەرای قەرە محەمەد ئاغا ، سەرای بەگی ئالا کوێخا حەیدەر ، ســەرای چاکراغا و سەرای خەلیل ئاغا •

**خانەکانی :**

نۆ خانی هەیە ، خانی مەتافان ، خانی شا ، خانی خاتونیە ، خانی خسرەو پاشا • خانی شەرەفخان و خانی گەورە لە سەر پرد •

**بازاڕ و قەیسەری :**

بە هەمویەوە هەزار و دوسەد دوکانی هەیە ، لە هەمویـان پەرداختر بازاڕی خسرەو پاشایە لە وارشی خوارەوە • ئەم قەیسەرتیە ئەمسەر و ئەو سەری دەرگای ئاسنی تێخراوە ، ناوەکەی سـپیکارە و زۆر ڕێکوپێکە ، هەرکەس چاوی پێدەکەوێ وا دەزانێ بازاڕی کەلیجەکی پروسەیە • جگە لەمە گوزەری زێڕنگەرانیشی زۆر ڕازاوەیە، لە دو جێگا دەباخخانەی هەیە ، ئەو چەرم و سەختیانـانەی لە بتلیسدا دەکرێن لە دنیـادا هاوتـای نیـە ، ڕەنگرێژەکانی لە وەستاییدا بێ وێنەن نەخشی بۆیەی ئەسـپەر ، تایبەتی ئێرەیە • ( بۆیەخانە )کانی هەمویان ملکی خانن و کەس هەقی بەسەریانەوە نیـە •

**بازاڕی قەپان :**

قەپانی میری لە جێگایەکە ، هەرچی ئاوریشـم و هەریر و کوتاڵ و شتومەکی خواردن و خواردنەوە هەیە دێتە ئەو جیگایە لە قەپان دەدرێ و دەیەکی میری لێ دەسەنرێ جا دەفرۆشرێ• کەسیش ناتوانێ لە نرخی دیارکراو شت بە گرانتر بفرۆشێ •

**پردەکانی :**

لەسەر حەقدە شیوی ناو شاری بتلیس یازدە پردی زۆر قایم و جوان دروست کراوە • پردی خاتونیە لە بن قەڵادا ، ئـاوە خۆشەکانی هەر دو کانیاوی ئەسکەندەر و ئۆیخ بەو شیوەدا دەڕوا کە ئەو پردەی لەسـەرە ،

پردی ڕوباری حسۆل ، پردی عەینـۆلبرۆت ، پردی باخی دەخال ، پردی گەڕەکی قەرە دەرە ، پردی گەڕەکی عەرەبەکان لە نزیك مسکێنان ، پردی گەڕەکی دەگرمان •

لە ڕاستو چەپی ئەم شێوانەدا خانۆبەرەی بڵند و گەورە هەن کە باخ و باخچەیان لەناودایە •

**خانۆبەرە و خانەدان :**

بە قەڵای ژۆرۆو قەڵای ناووارش پێنـج هەزار خانـوی خـۆش و ئاوەدان لە حەڤدە گەڕەکدا کۆبۆتەوە ، خانوەکان بە قوڕ سـواخ دراون ، زۆریان حەواڵەیان بە سەر یەکەوە هەیە ، هەندێکیان کەوتونە سەر بەرزایی و هەوایان خۆشە ، وارشی خوارێ خانوەکانی بە دەورەی قەڵاوە نین ، قەڵای خوارێ تەنیا بازاڕ و قەیسەرێ و گوزەری زێڕنگەران و چەند سەد ماڵێکی لێیە، هەمو حەوشەی ماڵەکانی دار و درەختی تێدایە، لەبەر ئەوەی خانوەکانی لەسەر گرد و شیوەکان دروستکراون دیمەنێکی زۆر جوانی هەیە کە بۆتە نەخش و بەهەشتی کوردسـتان ، قەڵای خوارەوەی زۆر قایم نیە ڕەنـگە پاشماوەی سەردەمی عەباسییەکان بێ کە دیوارەکانی ئەوەندە ئەسـتورە • دیواری لای باشوری لە ناو ئاوی ڕوباردایە و ئەو ئاوەی لێ بۆتە خەرەند، دەروازەکانی یەکیان بەرەو خۆرهەڵات دەکرێتەوە و یەکیان ڕوەو خۆراوا •

**خەلکەکەی :**

ئێرە پیرەمێردی ئەوەنـدە بە عومری تێدایە پیـاو وا تێدەگا هێزی ئاخاوتنی نەماوە کەچی دەبینی سواری ئەسـپ دەبێ و شیر دەوەشێنێ و دەچێتە سەفەری بازرگانێتی و ڕاویش دەکا • تەمەنی ئاسـاییان دەگاتە شێست و حەفتا و بە عومرەکانیان دەگەنە سـەد ، کەچی ڕەنگیان سور و سپی و لەشیان ساخە ، لەبەر ئەوەی نەتەوەی کورد مۆدارن ، کوڕەکانیـان

له تەمەنی دە ساڵییەوە متویان لێ دێ و دەبنە پیاو ، نازانم رێگا دەدەن ئافرەتیان بێتە بازاڕ یا نا ؟ بەڵام ژنیان زۆر بە نامۆس و جوان و نازەنینن •

**مەلاکانی :**

مەلای وایان هەیە لە چەرخی خۆیدا بێهاوتایە ، ئەوانەی من زانیبێتم ئەمانەن : (مەلا حەسەن ئەفەندێ یەك چاو) ، (مەلا زێندین) ، (مەلا زادە) ، (مەلا ئەبوبەکر) ئیمامی شەرقیە ، (مەلا عەلێ ئەفەندێ میحراب زادە ) ، (مەلا جوبراییل) ، (مەلا مۆسای هەکارێ) ، (مەلا ئیسرافیل )، (مەلای بۆتانێ ) •

**حەکیم و پزیشکەکانی :**

**مەلا میسێ ، مەلا رەمەزان ، قەرە سجاهـ ، گەنجالێ و ساریلێ** زادە) حەکیمی چاکن • چونکو ئێرە کوردستانە و بێ قڕە و هەرا نابێ برینکارێ چاکیشی هەیە ، لەوانە ( وەستا حەیدەر ، کوڕی بەشارەت ) • (سۆفێ قولێ ) و (سەیف عەلێ) زۆر وەستان •

**پیاوە خوایێیەکان :**

نزیکەی دۆ هەزار کەسی بەدین و خۆپارێز و دنیانەویستی تێدایە کە دەستیان بەرماڵی حەرام نەکەوتوە و نازانن کەیف و بەزم چیە ، لەوانە (شێخ حەسەبێ زادە) بە ناوبانگە •

**شاعیرەکانی :**

لەم ماوەیەدا کە لێرە بۆم حەوت شاعیرم ناسی کە دیوانی شیعریان هەیە ، لەوانە ( کاتب چەلەبێ ) نوسەری دیوانی خان ، (مەلا رەمەزان چەلەبێ) ، (جەنەتێ چەلەبێ) و (گەنجێ چەلەبێ)، ئەم دواییناەکەیان دیوانێکی ئەوەندەی دیوانی خەمسەی نیزامێ هەیە •

**ئەو برادەرانەی ناسیمن و بۆینە برا :**

(عەرەب خەلیل ئاغا) ، (چاکرئاغا) ، (خەتیبی شەرەفخان) برای کوێخا حەیدەری کوژراو ، (ئیسلام ئاغا) ، (سەلمانئاغا)و (مامەش ئاغا) •

**دەروێش و دێوانەکانی :**

( دێوانە پۆشق ) لە بازاڕی خسرەو پاشا ، (کەلخانێ مەمۆ) ، ( مەلا عورۆز ) • ئەمانە لەوانەن کە کەرامەتیان لێ بینراوە •

**جلك و بەرگ :**

ئەگەرچێ ئێرە کوردستانە ، بەڵام لەناو نۆکەرانی خان و پیاوماقوڵاندا کەوڵی سمۆر لەبەر زۆرە ، ناوەنجییەکانیان لەو (شیاق)ە لەبەر دەکەن کە لە شاری مەعدەنی نزیك شیروان دروست دەکرێ ، گەلێکیان چۆقەی سمۆر و کەنتۆش لەبەر دەکەن ، جلکی دەستکورتەکانیان (بوغاس)ە • وەکو لە برادەرانم بیستوە ئافرەتانی ئێرە جلکی سپێ لەبەر دەکەن پەچە دەگرنەوە و تاسکلاوی زێڕ و زیو لەسەر دەنێن و بەرگیان هەمتوی ئاوریشمە •

**ناوی پیاویان :**

حەیدەر ئاغا ، بەشارەت ئاغا ، چەندەدان ئاغا ، ساڵحان ئاغا ، زەجرێ ئاغا ، سەیفێ ئاغا ، شەرەف بەگ ، زیادین بەگ ، بەدر بەگ ، شەمسەدین بەگ ، عالەمشا بەگ ، کەرار قوڵی بەگ •

نەموێرا ناوی ژنان بپرسم • ژنی خان کچی ( زاڵ پاشا )ی وەزیری سۆلەیمانخانە کە (خانم سوڵتان)ی پێدەڵێن و سەد کەنیزی هەیە •

کۆیلەکانیان زوربەیان گورجین چونکو گورجستان کەوتۆتە لای باکور و لێیەوە نزیکە • ناوەکانیان : سیاوەش ، ڕۆستەم ، کازم ، چاکر ،

خەندان ، قەینان ، ئولان پاردێ ، سەلمان ، دەوڵەت ، خانێ وێردێ ، زۆراب، شاسوار •

کەنیزەکانیان نایێنــە بازاڕ و دەرەوە ، نــاویان : دڵدار ، تابنــدە ، ئەگلەنجە ، چاو ڕەش ، گەوهەر ، شەماسە ، دلارام ، ســورەیا ، گوللێ ، کەوکەبان ، تورەبان و باخ جینان •

بتلیس لە شوێنێکی بەردەلانیدایە و هەواییــکی خۆشی هەیە و هەمێ بەیانیان شنەبای سەحەرێ دەشنێ •

**گەرمــاوەکانی :**

لەناو قەلادا گەرماوی سەرای خان ، گەرماوی بداخ بەگ ، گەرماوی شەرەف خان ، گەرماوی پەلەکان لــە دەبــاخخانە ، لە قــەلای خوارەوەش گەرماوی خسرەو پاشا جێتەیە ، ئاو و هەوا و حەوزەکەی خۆشە ، بە قسەی بەشارەت ئاغای برادەرم شەشسەد ماڵ گەرماوی تایبــەتێ خۆیانیان هەیە چونکو حەز ناکەن ژنیان بچێتە گەرماوی دەرەوە ، لــەناو بازاڕدا ئافرەت ببیندرێ لێی تورە دەبن •

**شوێنە سەیرەکان :**

١ــ لە پشت قەلاوە کێوی بە ناوبانگی (دێوان) هەیە ، لە لوتکەی ئەو چیا بەرزەدا شوێنەواری سەکۆیێك هەیە کە لە وێڕا دەریا و قەلای وان و دەشتی راهۆلێ و چیمەنی مێش و دۆڵی چیای (دەلیکلێ ــ کوتێ) دیارە، لەبەر کێوە بلندەکان نەبوایە گشت دێهات و ئاوایییەکانیش دەبیندران • بە ئاشکرا دیارە کە لەســەر ئەم کێوە تەلەســمی شاراوە هەیە ، بەلام خەڵك نایزانن •

٢ــ لە گەڕەکی تەقلەبان پشت باخی حەرەمی (عەبداڵ خان) لە نێوانی

دۆ کێودا بەنداوێك کراوە ئەو ناوەی کردۆتە دەریاچەیێکی دەسـکردی خۆش •

٣ـ لەبن قەڵای ناو شار لەناو ئەو خانەدا کە لەسەر پردی خاتونیەیە ئەشکەوتێکی سەیر هەیە ، دەمەکەی ئەوەندەی بەژنی سێ کەس بەرزە ، لە ژورەوە دەنـگەدەنگێکی لێ دێ بـەڵام کەس نـازانێ چیە ، بـە قسەی (مەقدیسێ) ئەمە ئەو ئەشکەوتەیە کە ژەنگەسورەی لێ هاتە دەر و پەلاماری سوپای ئەسکەندەریان دا •

لەگەڵ دۆ برادەری خۆم (میهمان قوّلی)و (سەیفالێ) چۆین بۆ تەماشای ئەم ئەشکەوتە ، بە رێـکەوت کەلاکی سـەگێکی تۆپیو لەوێ کەوتبۆ ، سەیفالێ گوتی ئەم کەلاکە لێرە بۆگەن دەکا ، بە پیاوێکی خۆی گوت فڕێی دایە ناو ئەشکەوتەکە ، هەر ئەوەندەم زانی کەلاکی سـەگ بە لەتوکوت و پارچە پارچەیێ لە ئەشکەوتەوە فڕێ درایەوە دەرەوە ، من لە ترسان زراوم چۆ و بە پەلە لەوێ ڕامکرد •

٤ـ ئەو خانەی باسمان کرد بنیاتەکەی (هۆما خاتۆن) کچی سوڵتان ئەوحەدوڵڵا دایناوە ، جگە لەم خانە گەلێك بنیاتی خێرەومەندانەی دیکەش لە شاری بتلیسدا هەیە • یەکێکی دی لە کارە چاکەکانی ئەم خاتونە ئەوەیە کە ڕێگای شاری بتلیس لە باشۆری **خۆراوادا** بەرەو خوار بۆ قەڵای کفندڕ بە سـەر هەزار بەهەزارێکدا بوە ( بەردە کوێ )ی پێ دەڵێن ، هـەرچی کاروانێ و بازرگان و ڕێبوار هەیە دەبوایە بە سەر ئـەم لغاوەگیرە هەزار بەهەزارەدا تێپەڕن ، شاخەکەشی بەردەستێیێکە کوتکی پۆڵا تەڵەزمێکی لێ هەڵناکا • جا ئەو خاتونە پارەیێکی زۆری خەرج کردوە وەستای هێناوە و کوتێکی گەورەی کردۆتە ئەو بەردە ، تا خەڵك هاتوچۆی پێدا بکەن و ناچار نەبن بچنەوە سەر لوتکەی کێو و لەوێوە سەرەو خوار بینەوە •

بە راستی ئەو کارەی کراوە ئەوەندە ستەم و سەر سوڕێنەرە لە کاری دێو و درنج دەچێ ! لە بەردەمی کونەکەدا بە دەنگی بەرز یەك (ها) بکەیت لە هەمو چیاکانی دەور و پشت وا بە گرمە دەنگدەداتەوە پیاو شێت دەکا • کەس لێرەوە زات ناکا تەماشـــای خوارێ بکا ئەوەندە قوڵو دورە ســـەر دەسوڕێنێ •

**روبار و کانیاوەکانی :**

بە شیوی ئاودار و جۆگەلەوە بیست کانیاوی هەیە ، جگە لەمانە لە هەمو دۆڵ و شیوەکانیشی کانی هەڵدەقوڵێن ، ئەم کانیانە زۆر گەورە نین، بۆیە من تەنیا باسی ڕوبارەکانی دەکەم :

(کانی ئەسکەندەر) لە گۆڕاییەکی لای خۆرهەڵاتی قەڵا دێتـــەدەر •

(کانی ئۆیخ) لە چیای دێوان دەردەچێ و لە ژێر پردی خاتونیەی بەر قەڵادا تێکەڵ بە کانی ئەسکەندەر دەبێ •

عەینول بروتیش دێتەوە ناو کانی ئەسکەندەر •

(ڕوباری حسول) کە ئاوێکی خۆشـــی هەیە و دەچێتەوە نـــاو کانی ئەسکەندەر ، چونکو لە بەرەو ژوورژا دێ زۆر خوڕێنە •

( کانی تەقلەبان ) ئەو ئاوەیە کە (عەبداڵ خان) کردویەتـــە دەریاچە • شیوی نەکشوت ئاوێکی جوانی هەیە • قەرە دەرە ئاوەکەی کەمێك سوێرە بەڵام سودی هەیە •

( شیوی ئاش ) ئاوەکەی بەلای حەکیمانەوە بە کەڵکە و هەر کەس چل ڕۆژ لەسەر یەك لێی بخواتەوە زەردویی و کۆخە و تەنگەنەفـــەسی لەکۆڵ دەکەوێ ، ئاوێـــکی ڕەوانە • ئەم ئاوە لە کێوەکانی تەنیشـــت بتلیس دێتە خوار و پاش ئەوەی باخ و باخچەکانی شار و ماڵەکان و مزگەوت و خان و

گەرماوەکان پاراو دەکا بەناو شـــاردا دەگاتە دەباخ خانـــە و بەرەو خوار دەکشێ • ئەوەی هەمیشە لەم ئاوە بخواتەوە ئەوەندە قەڵەو دەبێ مەپرسە ، بۆیە ئەسپ و ئاژەڵی ئێرە هەمۆ قەبە و قەڵەون •

ئەم رۆبارانە پاشـــ پاراو کردنـــە پێویســـتەکان بـــەرەو خـــۆراوا یەکدەگرنەوە و بەناو بەرد و دۆڵ و دەرەدا بەگرمە و هاژە دەخزێ ، پێش ئەوەی بگاتە (قەڵای کفندڕ) بەرەو باشۆر دەگەڕێتەوە دەچێتە ناو دۆڵێکی گەورە و پاش دۆ رۆژ لەبەر قەڵای (حەسەنکێف) لەپـــەنا پردی بەتماندا لەگەڵ رۆباری بەتمان خۆ لێکدەدەن •

خوا یاربێ هەر کاتێ کتێبی هەیئەتی زەوێ پالیامۆنتەم وەرگێڕایە سەر تورکێ ئەمەی تێدا باس دەکەم •

**شێوەزمانی کوردەکانی رۆژەکێ :**

ئەمانە هەرچەندە لە کوردە کۆنەکانن ، بەڵام لـــەناو خۆیاندا زۆر بە ناسکێ و رەوانێ دەئاخەون ، جۆرە وشەیان هەیە کە کوردەکانی دیکە تێی ناگەن ، کەچێ ئەمان هەر دوازدە شێوەی کوردێ بە باشێ دەزانن •

سەروەری گەورەمان جەنابی (عەبداڵ خان) پیاوێکی شاعیر و قســـە رەوان و نۆسەر و زانا و لە هەمۆ هونەرێکدا وەســـتایە ، قەسیدەیێکی بە تورکێ و شێوەی رۆژەکی داناوە کە لێرە دا دەینۆسم ، هەواکەی لە سەر مەقامی سێگا دەگوترێ (★) :

---

(★) « دانەر لێرەدا حەوت پێنج خشـــتەکێ نۆســـیوە کە لەباری کێش و قافیەوە نازێکە و جگە لـــە تورکێ و تورکمانێ وشـــەی کوردێ تێدا نیە سەرەڕای ئەمەشـــ هەڵەی چاپی زۆر تێدایە ، پێم وابۆ شـــکڵ نۆس کردنەوەی سۆدێك نابەخشێ بۆیە نەمنۆسێ •

— وەرگێڕ — »

**باخەکانی بتلیس :**

به پێی دەفتەری میراوی خان ، بتلیس دە هەزار باخی هەیە ، خەڵکی ئێرە بە گەورە و پیاو ماقوڵ و ورد و درشتەوە ساڵێ هەشـت مانگ لە ناو باخەکاندا دەژین ، هـەمو باخێك حەوز و فیتچقە و پلوسـك و خانوێکی خنجیلەی تێدایە • باخاتەکە ولاتێکی داگیرکردوە و لێکتـر بلاون ، باخە هەرە خۆشەکانی بە دەست مەسـیحییە یاقوبتییەکانەوەیە کە دیواری بڵند و قوللەیان بۆ کراوە و هەر یەکەی نیمچە قەلاییێکە • باخی وایان هەیە ساڵی دوو هەزار قرۆش داهاتیەتی •

باخە بەناوبانگەکانیان بریتـین لە بـاخی شێرەك ، باخی بەغدۆ ، باخی عەرەبلێ ، باخی حەیدەر و باخی قەرە مراد •

جاری وا هەیە خان خۆی دێتە ناو ئەم باخانە بۆ رابواردن • هەر کاتێ رۆ دەکەیتە خانوەکانی ئەم ناوە کە (خاتوی هاوینە)یان پێدەڵێن سەرت سوڕ دەمێنێ ، هەر دەچیە ژورێ، لوتت پڕ لە بۆنی خۆش دەبێ و بە چاوپێکەوتنی ئەم ژورە رازاوانە دڵت دەکرێتەوە• درەختی باخەکان لەسەر شێوەی شەترنج نێژراون • ئەو راڕەوانەی ( خیابانی رەز ) یان ناوە لە هەر دو لاوە داری مێو خراونەتە سـەر قایمەی کەپر و هێشوی تریێان پێدا شـۆڕ بۆتەوە ، رۆیشتن بە ژێریاندا دڵی پیاو خۆش دەکا •

**باخەکەی خـانی پـایەبەرز :**

ئەم باخە بەهەشت ئاسایە کەوتۆتە خۆراوای بتلیس‌و دامێنی ( چیای تەقلەبان ) ، باشور و خۆرهەلاتی گەلێیەو شیوەکەی ئاوی پێدا دەڕوا ، لە دامێنەوە تا سەری سەرێ هەندێکی خۆڕسك و هەندێکی بە دەسکرد تەخت کراوە ، ئەم گۆڕاییتیە لە دو لاوە دیواری وەکو قەلای بۆ کراوە بە پەرژین کە تەنیا بۆرج و قوللەی کەمە ، خوڕهەلات و باشوری پارچە رەوەزێکی

سەر لە ئاسمانە ، لەسەر ئەم دۆلا دیوارە بەرز و قایمە سـەرا گەورەکەی خان و هۆڵەکانی و ئەو هەمۆ دیوەخانانەی لەسەر ریز بوە و بە پەنجەرە و شانشینێ رازاوەتەوە ، لای خۆرهەڵاتی بە سـەر شیوی ئاشیدا دەڕوانێ •

ئێرە حەو سەد ژۆری عەسکەرەکانی خانی لێیە ژێری ژۆرەکان تەویلەیە، چوار دەروازەی هەیە ، یەکیان بە رێگای شیوی ئاشیدا بۆ شار دەچێ زۆر سەخت و بەردەڵانە ، یەکیان بـەرەو خۆراوا دەکرێتەوە ، ئـەوە دەرگای کفندڕە ، دەروازەیێکی دیکەیان دەڕوانێتە خۆراوا ناوی دەرگای چیایە ، دەرگای چـوارەم رۆی لـە باکورەو بەرەو شـیوی گەڕەکی تەقلەبان دەکرێتەوە •

لەم سەرای دەرەوەیەڕا تا دەگاتە مەیدانی ناوەڕاست زۆر بەرین و بەر فراوانەو یەك بەردیشی تێدا نیە ، لمێـکی وردیان لێ رۆ کردوە سەربازەکان مەشقی لێ دەکەن • چێ رمبازو هۆقە بازو ئاگر بازو پاڵەوان باز و شیشە بـاز و چەمبەر باز و ئـەم جۆرە بازانە هـەن لێرە هونەرەکانی خـۆیان دەردەخـەن و خەڵات لە خـان وەردەگرن ، پشتـی ئـەم مەیدانە خانۆی سەربازەکانی خانە و پەنجەرەکانیان بەسەر ئەم مەیدانەدا دەڕوانێ ، سەرۆی ئەم خانوانە نهۆم نهۆم ژۆرەکانی حـەرەمی خـانە کە بـە کاشێ چینـێ رازێندراونەتەوە و وەکو سەدی ئەسکەندەر قایمە ، ئەویش دەرگای ئاسنی هەیە و شەو و رۆژ چل پەنجا تەواشێ و ئاغای پڕ چەك پاسی لێ دەکەن • ژۆری حەرەم چونکو مەبەستم نەبۆ نەمزانی چێ لێیە ، بەڵام وەکو بیستم ئەویش ناوەڕاستی مەیدانێکە و چوارلاکەی نزیکەی سێسەد خانۆی لێیە • لە ناو حەرەمدا چل پەنجا دوکانی خانی لێیە ، ئەم دوکانانە پڕن لە شتومەك، ئەو شتانەی لەم دوکانانەدا هەن لە دوکانی دیکەدا دەست ناکەون •

# عەبداڵخانی هونەرمەند

یەکەم شت لە فەلسەفە و زانیارێ سەیر و عەجایبدا و لە کیمیا و سیمیا شارەزایە ، لە سەر فەرمایشتی پێغەمبەر کە دەڵێ (زانیارێ دوانن ، زانیارێ لەش و زانیاری دین) خۆی کردوە بە پزیشکێك کە (جالینۆس) و (بوقرات)و (سوقرات)و (فیلوس)ی بەلاوە هیچە، چونکو ئەوان حەکیمی زەمانی خۆیان بۆن ، بەڵام (عەبداڵ خان) بە هۆی زۆربۆنی نەخـۆشێ و لاوازێ خەڵکی ئەم سەردەمە نەبزناس و دەرماندەر و خوێنگرێکی تەواوە، پیر و پەككەوتەی هەشتا سـاڵە یـا تلیاك كێشـێکی ماڵوێران بێتـە لای دەرمانی دەکا و دەیخاتە گەرماو هەتا چاکی دەکاتەوە ، ئەو نیوە مردوانە زیندۆ دەبنەوە و دەگۆڕێن بە پیاوێکی دیکەی رۆمەت سۆر و گورج و گۆڵ ، مەسیحایەتێ وای زۆرە • خۆ لە برینکاریدا هەر وێنەی نیە ، ئەوانەی سەرسم دەدەن یا دەکەونە خوار و لاقیان دەشکێ یا لەجێ دەچێ دەستی بیانگاتێ بە حەوت رۆژ دەیانخاتەوە سەر پێ و بە لاقی خۆیان دەڕۆن •

ئەوەندەش دەست راستە کە پێ دەخاتە سەر رکێف و دار تەقڵەی جلیت یا گۆچانی گۆیێن بەدەستەوە دەگرێ رۆستەمی زەمانی خۆیەتی •

بەیتاڵ نامەی خوێندۆتەوە و لە دەرد و ئازاری وڵاخان باش دەزانێ • راوکەر و نیشان ئەنگێوێکی بێ هاوتایە • لە ماڵی خۆیدا چەند بوزدۆغان ،

چاقر ، باڵەبان ، زەغنوس ، شەهێن ، سیفق ، سونقور ، طویفورەك ، قرقل، قرچینا ، کوچۆکزۆد ، لینکح ، قەرەقوش ، ئاتماجە و قـەرە کوك کە مەلی راوین مالی کردۆن •

ساڵێ یەکجار لە دۆڵەکانی بتلیسدا راوە کەو دەکرێ ، لە یەکێك لەو رۆژانەدا بە دەفتەر حەفتا هەزار کەو راو کراوە • شێوەی ئەم راوە کەوە لەسەر فەرمانی خان بەم جۆرەیە :

سێ رۆژ کوردەکان کێو و دۆڵـەکان دەتـەقێننەوە ، باڵندە و گیـان لەبەرەکان بەرەو لای راوگەکان دنە دەدەن ، لە رۆژی سێیـەمدا خـان و پیاوەکانی و خەڵکی دیکەش دەست بە راو دەکەن و بەلای کەمەوە چەند سەد هەزار کەو و مـەل راو دەکرێ • جا لەو رۆژەوە هەتا سـێ مانگ کـەو دەفرۆشرێ و خەڵك گۆشتی مەڕ و بەرخیان بۆ ناخورێ • خان بۆ ئەم جورە راو و شایێ و میهرەجانانە وەکۆ مەنوچیهر وایە ماندۆبۆن نازانێ • باڵنـدە راوکەرەکانی یەکیان بکەوێ یا بریندار ببێ خۆی دادەبەزێ تیماری دەکا و دەست دەکاتەوە بە راو ، هی وا هەیە سەرە تیر بـەر زگی کەوتوە یا باڵی شکاوە یا دندوکی ئازاری پێ گەیوە ، چۆنی پێویست بێ دەرمانی دەکا و چاك دەبنەوە • ئەگەر کەوتبێ و جێگاییکی خوێنی تێزابێ ئەو جێگایەی دۆ جار بە سرکە دەشوا ، وردەی قیومچێ و دەنکە کۆلەکەی سەراوی پێکەوە دەکوتێ و لەگەڵ گیای سیغیر دەیشێلێ و لەسەر ئازار دراوەکەی دادەنێ ، هەر خوێنێکی پیسی تێدا بێ لەیەك جێگا خڕ دەبێتەوە،جا بە گوێزان کەمێکی بریندار دەکا ئەو خوێنە پیسە دێتە دەر و چاك دەبێتەوە • ئەمە یەکێکە لـە تەجرەبەکانی خان •

لە دەرمانکردنی چاودا ئەوەندە شارەزایە ئەو کەسەی چل ساڵ لەمەو پێش چاوەکانی ئاوی رەشـی هێنابێ ، خان میلێکی زور باریك دەخاتە ژێر

چاوی ئاوە رەشەکەی لێ خاڵی دەکات و چاوی کابرا رۆن دەبێتەوە ، من بە چاوی خۆم دیم ئەو چاوانەی تانەیان هاتۆتە سەر دەهنەجی هیندێ و تێرکی شیاف بە میلێ تۆزی هێلکاوێ پێدا هێنا و پاشان پەردەییێکی وەکو توێکلە تەنکەکەی پیوازی لە سەر لابرد •

جگە لەمانە لە زانیاری بەننایبشدا شارەزایە ، زوربەی شوێنەکانی ئەم سەرا گەورەیە خۆی نەخشەی کێشاوە •

لە بەرگ تێگرتنی کتێب ، وێنە کێشان ، خەت خۆشیدا دەستێکی باڵای هەیە • لە شاعیریدا شیعرەکانی هاوتای شیعری ( حالەتی عەزمیزادە )ن ، ئەوەندە زانایە کتێبێکی عەرەبێ بە دەستەوە دەگرێ و چێ تێدایە بە فارسێ دەیلێتەوە ، لە تورکێ و فارسیدا خاوەن بەهرەیە • ئەو شیرەی خان بە دەستی خۆی دروستی دەکا قەت دەمی لە هەڵگەڕانەوە نایێ •

جارجار لە سورمەی باش سەرزین دەچنێ و دەینەخشێنێ یەکی بە دوو هەزار قرۆش دەفرۆشرێ ، ساڵی دوو دانەی لەمانە بە دیارێ بۆ سوڵتان دەنارد •

سەعاتسازێکێ بلیمەتە ، سەعاتی رۆژانە و مانگانە و ساڵانە و سەعاتی سەر بورج و سەعاتی ژمارە زێڕ و سەعاتی وریاکەرەوە خۆی دروستی دەکا بە جۆرێك کە دەسکردەکانی (جان پەترۆکشیر)یان ناگاتێ ، دەڵێن محەمەد خانی فاتیح سەعاتی لە نقێمی ئەنگوستیلەی دەستیدا بوە ، خانیش لەسەر نقێمی ئەنگوستیلەکەی سەعاتێکی ئەوندە ورد و جوانی داناوە کە زیاتر لە کاری جادوو دەچێ ، ئەنگوستیلەییێکی دیکەی ئەم جۆرەم لە قامکی ئەولیا بەگی مەحمودیدا دێ کە ئەویش زاوای خانە و خان بۆی دروست کردبوو • جگە لەمە مۆڕهەڵکەن و نەقاشیشە •

لە هونەری موسیقێ و گۆرانیدا هەر باسی ناکرێ ، مەقامی راست و

دۆگا زۆر باش دەزانێ و لە گوتنی زەجەل و زیکر و تەسنیف و مورەبەعات و وارسقێ و شەرقێ و سەرچیادا وەستاییەکە کەس نایگاتێ • هەر چەندە دەنگێ زۆر زلە بەلام کە دەست دەداتە ئامێرێکی مۆسیقێ و شیعری حافز بە بیست و چوار ئوسولەوە دەڵێ مەل بە ئاسمانەوە رادەگرێ •

لە جۆلاییشدا زۆر شارەزایە ، بەرماڵێکی دەسکردی خۆی پێشکێشی مەلیك ئەحمەد پاشا کرد کە وێنەی مەگەر لە میسر و ئیسفەهاندا دەست بکەوێ • خەڕاتیش باش دەزانێ ، کەوچکی خڕی ناو مەرەکەب ، داری قەڵەم لەسەر قرتاندن ، سێپای ژێ گر و کلچۆکی چاوی ئەوەندە ورد و بە نەخش دروست دەکا کە شارەوشار بە دیارێ دەنێردرێ • جۆرە تیری هەکۆ و پیشڕۆ و هێ دێ دروست دەکا کە لە کاری جادوو دەچێ ، تەنانەت لە سەدوپەنجا تەڵەزمی قامیش جۆرە تیرێك دروست دەکا کە لە توکەکەیەوە تا دەگاتە پەیکانی ناوەکەی هلولە •

لە تەپڵ لێدانا وەستاییەکە دەتوانێ لە نێوانی چوار تەپڵ دابنیشێ و دەستبگەیێنێتە هەر چواریان و بە شێوەیێکی رێكکارێ چوار تەپل کوت بەجێ بێنێ ، بە هۆی ئەم وەستاییەوە سوڵتان مرادی چوارەم خەرجی مۆشی پێ بەخشی • لەم تەپل کوتانەدا شارەزایێکی بێ هاوتای هەیە •

خوای گەورە ئەوەندەی هۆش و زیرەکێ و وریایێ و زانایێ و تێگەیشتن داوە بەم پیاوە کە لە سەدان پیشە و هونەر و وەستاییدا کەسی ناگاتێ ، جەمشیدێکە بۆ خۆی ، ئەگەر تەواوی زانیارییەکانی ئەو لێرەدا باس بکەین دەبێتە کتێبێکی زل •

چواردە کوڕی زرنگ و وریای هەیە ، ناویان (زیادین) ، (بەدرەدین) ، (نوروددەهر) ، (شەرەف) ، (ئیسماعیل) ، (شەمسەدین) ، (حەسەن) ، (حوسێن)و ئەوانی دیش •

جارێکیان کابرایێکی تەنافباز (تۆڕنا) ناو دێتــە بتلیس و لە بەردەمی خاندا لێهاتویی خۆی پیشان دەداو بە سەر تەنافدا دێت و دەچێ ، خان دەڵێ جا ئەمە چیە ، دێنێ کراسێکی تەســکی وەکو کابرا لەبــەر دەکا و دارە درێژەکەی ئەو بە دەستەوە دەگرێ و وەکو جالجالۆکە دەچێتە سەر تەناف و لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر دەڕوا و لەسەر ئەو تەنافەی (بێشــکەی مەرگ)ی پێدەڵێن هەڵدەبەزێ و دادەبەزێ کابرا چی کردبو ئەویش دەیکاتەوە ، بــە رێکەوت یەکێك لەو بزمارانەی تەنافەکەی پێوە بەستراوەتەوە دەردەپەڕێ و خان لەسەر تەناف هەڵدەداتە خوارێ ، لەو کاتەدا دێ بکەوێ هاوار دەکا « کوڕینە ئەوا لە ئاسمان هاتمەوە » و پێدەکەنێ ، کە دەگاتە زەوی دارەکەی دەستی دەچەقێنێ بەڵام دار خۆی لەبەر قورسایی خان راناگرێ ، دەشکێ و خان دەکەوێتە سەر زەوی و لاقێکی دەشکێ ، دەبێتە هەرا و هاوار و گریان، بەڵام خان خۆی لاقی خۆی دەرمان دەکا و پاش سێ رۆژ دێتە دەر و لە دیوە خان دادەنیشێ ، لەخۆشیان چەند هەزار قوربانی سەر دەبڕن و خێر و خێرات دەکەن ، خانیپایەبەرز ئەم بەسەرهاتەی خۆی بە جۆرێك بــۆ من و مەلیك ئەحمەد پاشا گێڕایەوە کە پیاو لەبەر پێکەنین خۆی بۆ نەدەگیرا • ئێستاش لەو رۆژەوە لاقێکی کەمێك دەلەنگێ• ئەمە بەڵگەیێکە بۆ ئازایەتی و زانایەتی خان •

ئەو دە رۆژەی لای خــان ماینەوە هەمو رۆژێ لــە بەیانی تا ئێوارە گۆرانی بێژ و وشکەڕن و یاریکەران دەهاتن هونەرەکانی خۆیانیان پیشان دەدا و خەڵاتیان لە پاشا و خان وەردەگرت •

خان زۆر رێزی مــەلایان و زانایــان دەگرێ ، ئەوانــەی بەخۆیاندا رادەپەرمون لە وڵاتانەوە دێنــە بتلیس و خان دەیاندوێنێ ، ئەگەر بــۆی دەرکەوێ کە بەڕاستی زانا و خوێندەوارن خانو و ماڵ و باخچە و کەنیز و خەڵاتیان دەداتێ و لای خۆی جێگایان دەکاتەوە ، هەر لەبەر ئەوەشە شیوی

بتلیس بۆته مەڵبەندی هەمو جۆرە زانین و هونەرێك و هەر کەس شتێکی مەبەست بێ یا گیر و گرفتێکی ببێ لە بتلیس رێگای چارەی خۆی دەدۆزێتەوە •

**خیابانی خانی پایەبەرز :**

ئەم باخە تیرهاوێژێك لەو لای سەرای خانەوەیە و ئەوەندە جێگاییێکی خۆشە کەس ناتوانێ تاریفی بکا • دارەمیوەکانی بە ریزی هەندەسەیێ چەقاون و بە دەم باوە دەهەژێن و بەملاو بەولادا لاردەبنەوە ، تەنیا دار خورما و جەمیز ومۆزی تێدا نیە دەنا هەر جۆرە دارێك ببێ لێرەدا هەیە ، لە ناو ئەم باخەدا چەند کۆشکێك کراوە هەر یەکەی خەزێنەییێکی لێ خەرج کراوە ، ئەوەندەش بە وەستایانە کراون کە هیچ کۆشکێکیان لەوی دێ ناچێ ، ئەو حەوز و فیچقانەی لێرە بەر چاو دەکەون لە ولاتی رۆمدا هاوتایان نیە ، لە قەراخی حەوزەکان وردە چەو و خیزی رەنگاو رەنگ بە نەخش رۆکراوە دەڵێی سەدەفکاری هیندستانە ، لە ناوەڕاستی ئەو حەوزانەدا باوەشێك ئاو لە دەمی شێر و لە لوتی دێو و لە زاری هەژدیها دەڕژێتە ناو حەوزەکانەوە ، هەندێ لە فیچقەکان بە تەوژم ئاو هەڵدەداتە بەرەو ژور و هەندێك کونی زۆری تێکراوە وەك ئاو پرژێن لە چل پەنجا کونەوە داوی ئاو وەکو تالی قژی نازداران پەرێشان دەبێ ، هەندێکیان سەرقاپی بۆ کراوە و چەرخێکیان لێ بەستوە ئاو بەر چەرخەکە دەکەوێ و دەیخولێنێتەوە• پلوسکی وا هەیە ئاوێکی باریکی لێ دێتە خوار و بەر کاسەییێکی پەل دەکەوێ دەنگێکی نەرمی بەسۆز بڵاو دەکاتەوە ، پلوسکێکی دیکە لە چەند تاسێك دەدا و لەو سەرەوە بە شێوەی باران هەڵدەڕژێ ، هەندێ لە ( فیتچقەکان تۆپێکی ناو هلولیان خراوەتە سەر کە بە هێزی ئاوەکە بەرز و نزم دەبێتەوە ناشکەوێ •

لەم باخەدا هەمو جۆرە گوڵی تەڕلا و سومبل و ریحان و وەنەوشە و ئەرخەوان و زینو و ملە وشتر و کافور و مێلاقە و میسکی رۆمی و مێخەك و زەمبەق و سوێسن و نێرگز و بخوری مریەم و یاسەمەن و گوڵاڵە و گوڵی هێرۆ و گەلێکی دیکە هەیە کە ئەو ناوەیان پڕ کردوە لە بۆنی خۆش •

بۆ میوەجاتیش باخەوانی لە ئیسفەهان و تەوریز و نەخچەوانڕا هێناوە و ئەم باخەی بە جۆرێك پێ رازاندۆنەوە کە وەختێ سوڵتان مرادی چـوارەم هاتوە و چاوی پێکەوتوە لە سەر سوڕمانا دەمی داچەقاندوە •

**دەریاچە دەسکردەکەی خان :**

لە پشت ئەم باخەوە بەرەو باکور کانیاوی تەقلەبان هەیە ، خان لای بەرەوەی ئەو شیوەی کردوە بە بەنداو و دەریاچەیێکی گەورەی لێ پێـك هێناوە ، ناوەکەی زۆر جۆرە ماسی تێدایە ، خان بە دەستی خۆی بەلەمـی جوانی دروستکردوە ، هەندێ جار ماڵ و منداڵی سوار دەکا و خۆی سەوڵ لێدەدا و بەسەر ئاودا دەگەڕێن ، جارێکیان گوایە ژنەکان باش دانانیشن بەلەم وەر دەگەڕێ و چەند ئافرەتێك دەخنکێن ، لەوساوە خان وازی لەوە هێناوە و تەنیا خۆی جارجارە بە بەلەم دەگەڕێ و راوە ماسی دەکا •

جارێك ئاوی چیکان هەڵدەستێ و لافاو لایێکی بەنداوەکە کـون دەکا و ئاو لە خوارەوە هەندێك ماڵی تەقلەبان دەبا ، کوردەکان دوعـای خراپ لە خان دەکەن ، ئەویش بە پارەی خۆی خانوەکانیـان بۆ دروسـت دەکاتەوە و زیانیان دەبژێرێ •

**گەرماوی باخ :**

ئەم گەرماوە خۆشەی خان لە (خەزێنە)یەوە بۆ (جامەخانە) دەچێ ، سێ لای رووی لە باخە و هەمو پەنجەرەکانی بەسـەر باخـدا دەڕوانـێ ،

پەنجەرەکانی شوشەی نەخشاویان تێ گیراوە ، چوار چێوەی پەنجەرەکان بە نەخش هەڵکەندراون و خانەکانی عەجەم لە تەورێزەوە بە دیاریێ بۆیـان ناردوە ، کەلێنی چوارچێوەکان بە عەمبەری خاو پڕ کراوەتەوە کە بای دەرەوە لێی دەدا بۆنی خۆش دێنێتە ژورە چوار دەوری ژوری جامەخانە ــ جێـی خۆ رووت کردنەوە ــ کاشیێ چینیێ و فەخفورییە ، بن میچی گومبەزەکەی و قەراخەکانی ژورۆی لەسەر کاشـیێ چینیێ بە دەسخـەتی محەمـەد رەزای تەورێزیێ قەسیدە بەناوبانگەکەی فزولیێ لەبارەی حەمامەوە نوسراوە •

ناوەڕاستی جامەخانە لە سێسەد لاوە بە پلوسك ئاو هەڵدەڕژێ ، بەردە مەڕمەڕەکانی تەختەکەی بە چەشنی فەرشی میریێ نەخشاون و هەر پارچەیەی لە رەنگێکە ، لە ناوەڕاستی حەوزەکەدا فیچقەیێك ئاو هەڵدەداتە بن میچـی سەرێ و لەوێوە دەڕژێتەوە خوارێ ، ئەو خزمەتکارانەی لەم جامەخانەیەدا خزمەت دەکەن خولامی چەرکەس و گورجین و وەکو مانگ دەبریسکێنەوە ، هەر یەکەیان بایێ هەزار قرۆش خەنجەر و چـەقۆی جەوهەرداریان لەبـەر پشتێنە ئاوریشمەکانیان چەقاندوە ، بە سۆلی سەدەفکارەوە دێن و دەچـن دەلێی تاوسی بەهەشتن ، ئەم خولامانە خاولیێ و پەشتەماڵی ئاوریشم و سۆلی سەدەفکار دەبەن بۆ خۆشۆرەکان •

کە لە جامەخانە چویە ئەو دیو ژورێکی گەورەیە بە ناوی ( ساردخانە )، گومبەزێکی گەورەی بە سەرەوەیە ، ئاوی حەوز و پلوسکەکەی ناوەراستی شلەتێنە ، تەواوی دیوارەکانی کاشیێ چینیێیـە و وردە مەڕمـەڕی تێـدا راخراوە و هەزاران چلچرای پێدا هاتوتە خوار • لێـرەوە دەچـیە ژوری گەرماو وادەزانی کەوتویە ناو دەریای رۆشناییەوە ، چونکو گومبەزەکەی ئەوەندە بەرزە سەری لەئاسمانە و هیچ دیوار و شتی دیار نیە ، دیوارەکانی لەسەر ئەو کۆلەکانەیە کە ناویان بە بلور و شوشەی ئەستور و قەندیـل و

چلچرا پڕ کراوە و سەرەوەشیان یەکپارچە شوشەیە ، ئەو شوشانە کاتێ لە سەرەوە هەتاویان لێدەدا ژورەوە دەبێتە ڕۆژی ڕوناك •

بەشی دەرەوەی گەرماو و جامەخانە باخە بەهەشتەکەیە کە هەزاران بولبول و مەلی خوشاواز دەنگیان لێ هەڵبڕیوە و لەسەر ئەو دارانە لقاولق دەکەن • حەوزێکی گەورە لە ناو گەرماوەکەدایە ڕوی ئاوەکەی پڕە لە گەڵای مێخەك و گوڵەباخ کە بونی خوش بڵاو دەکاتەوە ، لە هەمو ژورە بچکولەکاتیشدا قولەتێن هەیە ، جوڕنەکانی بەردی مەڕمەڕن و ئەوەندە وەستایانە تاشراون پیاو حەز دەکا تەماشای کا ، هەندێکیان لە شەوە و پیروزە و کارەبا و گوێ ماسێ و یاقیقێ یەمەنێ و بەردی سیلانین ، کوڵەکەکانی نێوان جامەخانەکەش لە بەردی سماق و مەڕمەڕن و بە جوڕێك تاشراون کە موڕ هەلکەنەکان زات ناکەن دەسکارێ بکەن یا کاری لێ بکەن، کەچێ وەستا پێشوەکانی ئاویان بە ناو ئەم کوڵەکانەدا ڕاکێشاوە • هەمو لولەکان و تاسێ ئاو بە خوداکردن زێڕ و زیون ، هەواکەی ئەوەندە سافە و ساخە پیاو لە دوای کەمێك دانیشتن هەست دەکا عومری تازە بوتەوە • زور شیعری خوش سەبارەت بە گەرماو گوتراو لە دامێنی گومبەزەکە بە خەتی خوش نوسراوە •

ئەو ناترە ناسك و نازدارانەی لەشی نەرم و شلیان بە فوتەی ئاوریشم داپوشیوە و کاکوڵیان پەرێشان کردوە ، بە کیسەی نەخشین و سابونی بونخوشەوە بە دەورتدا دێن و دەچن پیاو هوش لە کەللەیا نامێنێ • لە زور لاوە مەنقەلێ بخور و عود و عەمبەر دەسوتێ و بونی خوش بڵاو دەکاتەوە •

بە کورتێ بڵێم زمان و قەڵەم لە وێنە کێشانی ئەم سەرا گەورە و باخە بەهەشتە و گەرماوە بێ هاوتایەدا دەستەوستانە ، ئەو وردە کارێ و ناسکێ و زەریفییەی تیاندا بەخت کراوە وێنەی نیە • من خوم چل ساڵە خەریکی

گەشتم شتیوام لە هیچ کوێیەك نەدیوە ، وەستاکانی ئێرە دەستیان داوەتە هەر کارێك ناتەواویان تێدا نەهێشتۆتەوە ، جا ئەم هەمو شتە چەندی تێچوە هەر خوا خۆی دەیزانێ •

**کە ( سوڵتان مراد )ی داگیرکەری بەغدا هاتۆتە ئەم گەرماوە خۆی بشوا، دەبینێ ئاوە ساردەکەی بۆنی گوڵاوی لێدێ و ئاوە گەرمەکەی بۆنی بۆخۆڕ ، لە ژورێکدا پێنج خوڵامی چاو رەشی کاکۆڵ درێژ بۆ ناترێ و لە ژورێکی دیکەدا پێنج کیژی ناسکۆڵەی هێشتا نەپشکوتو ئامادەی خزمەتن ، ئەوەندە شاد دەبێ دەڵێ ((ئەرێ چ دەبو ئەستەموڵی منیش گەرماوێکی ئاوای تێدا بوایە ! )) ئێمەش کە لەگەڵ مەلیك ئەحمەد پاشادا هاتینە ئەم گەرماوە پاشا گوتی (( وێنەی ئەم گەرماوە لە هیچ کوێیێکی دنیادا نیە )) !**

**بانگ‌هێشتنی خان بۆ پاشا :**

کە پاشا لە گەرماو هاتە دەر ، لەسەر دەستوری خانی پایە بەرز سفرە ریز کرا ، دەوری زیوی پڕ لە خواردنی خۆش و بۆنخۆش داندران ، زوربەی خواردنەکان بریتی بون لە کۆکی پلاو ، زەعفەران پلاو ، چلاو پلاو ، بریان پلاو ، دەور پلاو ، شلە پلاو ، دەرمان پلاو ، عود پلاو ، عەمبەر پلاو ، کفتە پلاو ، فستق پلاو ، قاورمە پلاو ، بادام پلاو ، کشمش پلاو ، ماستیا چۆبەرە ، قرتی چۆبەرە ، لاکشە چۆبەرە و گەلێك چۆبەرەی دێ ، خۆ پلاوی گۆشتی کەو و هەنار پلاو و کەبابی هەمە جۆرە هەر باسی ناکرێ •

خوڵامەکانی خان کە بە سەد تەرزە رازابونەوە پەشتەماڵی سورمەداریان بەستبو و یەکی یەك سینێ بە دەستەوە دەیان هێنایە بەردەمی پاشا چۆکیان دادەدا و پێشکێشیان دەکرد ، ئەو خاولێ و کەوچکی نقێمدار و کاسە و قاپی چینییەی لێرە ریز کرابون من ناتوانم باسیان بکەم، پاشا و خان ، لە کوڕەکانی خانیش (زیادین)و (بەدرەدین)و (نورەدین)و (شەرەفەدین) لەملاو لەولای پاشا لەسەر ئەژنۆ دانیشتبون ، پاش نانخواردن مەسینە و لەگەنی زێڕ هات و بە سابونی بۆنخۆش دەست شۆرا ، دوا بەدوای ئەوە

سفرەییێکی دیکە راخرا ، کەوچکی سەدەف و دارگوێز و ئاسن و سیلان و یاقیق داندرا ، پەنجا خزمەتکاری ئێسك سوك پەنجا کاسە بەدەستەوە هاتنە ژوور ، پەنجا جۆرە خۆشاویان هێنا کە بە قەندی شام و نەباتی حەما گیرابونەوە ، لە پاش خورانەوەی ئەوەش مەسینە و لەگەنی دیکە هات کە لە فەخفوری و نقێمدار بون• جا لە فنجانی چینیدا قاوەی یەمەنی و سەحلەب و فڕنی و چای بادیان و پالوودە و شیر هات و خورایەوە •

هەمو رۆژێ بەیانیان چەند جۆرە شیرینی و مرەبا و دۆشاوی ڕێواس و کەبادی سوێرکراو و شەقاقیر و خەیار چەمبەر و ئەم جۆرە شتانە دەهات ، بۆ نیوەڕۆش ئەو بەزمە رێکدەخراوە کە باسمان کرد و شەوانەش هەروا • ئەو دە رۆژ و دە شەوەی پاشا میوانی خان بو بەم جۆرە خزمەت کرا ، سێ هەزار وشێست ئاغا و سەگوان و ساریجە تا دەگاتە مەیتەرەکانیش خواردنیان لە لایەن خانی پایە بەرزەوە بۆ دەهات و تەنانەت یەك بارگیریش ژەمێکی بێ تورەکە و ئالیك نەبوە • قاوەی ئەم عالەمەش هەر لەسەر خان بوە •

رۆژێك پاش نانخواردن بە پاشای گوت «ئێمە چەند پالەوان و تەڕدەستمان هەن ئەگەر ئارەزوت لەسەرە با بچینە کۆشکی خوارەوە کە بەسەر مەیداندا دەڕوانێ کەمێك تەماشای عیلمی سیمیا و ئەرز هێنانەوەیەك و شتی سەیر بکەین ، » پاشا گوتی « قەیدی چیە با بچین بیانبینین ، » چون لەو هەیوانە دانیشتن کە بەسەر مەیداندا دەڕوانێ و هەر چوار دەوری مەیدانیش حەشامەتێکی زۆری لێ کۆ بوبوەوە و چاوەڕوان بون •

## کارە سەیرەکانی پالەوانان

لە پێشەوە پالەوانێکی عەجەم بە ناوی ( زەنگوزەر ) کە بەرگێکی کودەری رەشی لەبەر کردبو هاتە بەردەمی پاشا و کڕنوشی بۆ برد ، ناوی پێغەمبەر و چوار یار و دوازدە ئیمامی هێنا ، دوعای بۆ سولتانی عوسمانی و

مەلیك ئەحمەد پاشا و خانی پایەبەرز و کوڕەکانیکرد و ئیجازەی خواست کە دەست پێ بکا ، سەرێك بە غار سەرانسەری مەیدان گەڕا و ئەوەندە خێرا ڕۆیی ئەسپی وێرغەی نە دەگەیشتێ ، جا کە هاتەوە بەردەمی پاشا یا ئەڵلای گوت و تاوی خوێدا لە هەواوە سێ جار خۆی هەلگێڕایەوە و کەوتەوە جێی خۆی ، دیسان کۆترانە خۆی هەڵدا و لە هەوا چوار خولی خوارد وا خولاوە هیچ کوێیێکی نەدەبیندرا ببۆ بە دانە تۆپێك ، ئەمجار بە سەر دەست و لاقدا وەکو پێچکەی عەرەبانە تل بۆوە و لەمسەرەوە گەیشتە ئەو سەر •

لە ناوەڕاستی مەیداندا پارچە قوماشێکی شازدە گەزییان بۆ ڕاخست ، سەرێکی ئەو قوماشەی گرت و وەکو برۆسکە خۆی فڕێ دایە ئەو سەری بێ ئەوەی بێڵێ قوماشەکە بجوڵێتەوە • ئەمجار لە دۆ جێی نزیك بە یەك سێ پەرداخی شوشەی لەسەر یەك دانا و بە یائەڵلایەك خۆی هەڵدا چوە سەر ئەو پەرداخانە راوەستا ، نە خۆی جوڵا و نە شوشەکان شکان ، جا دابەزی و هەر لایە سێ پەرداخی دیکەی خستە سەر ، بون بە شەش پەرداخ، ئەو شوشانەش ئەوەندە تەنك بون لەوانە بو بە فو برۆخێن کەچێ ئەم چل پەنجا شەقاو دور کەوتەوە و لەو سەر بەغار هات گەیشتە کن پەرداخەکان ، زیقاندی و خۆی هەڵدا هەر پێیەی چوە سەر ریزێك پەرداخ راوەستا خوا دەیزانێ نەخۆی و نە شوشەکان جوڵەیان نەکرد • هەر لە وێوە کڕنوشی بۆ پاشا برد و هاتە خوارەوە •

**دیمەنێکی سەمەرەی دیکە :**

لەمەوپێش باسی (مەلا محەمەد)م کردبو کە سواری ئەو بارگیرە لاتە بوبو و چێ کرد ، ئەمڕۆش بە هەمان سەر و گوێلاکی چلکن و دڕاو و مێزەری هێلانە لەگەڵ گێڕیەوە و بە جلە شڕۆڵەکانیەوە هاتە مەیدان ،

سەلامێکی لە پاشا کرد و بە کوردیی گوتی « ئەوە بۆچیی بۆ نانخواردن بانگم ناکەن و بۆ ئەم بەزمە لە دوّم دەنێرن ، دەتانەوێ شتی سەیرتان بۆ بکەن ؟ » خۆی تورە کرد و جنێوی دا و زماندرێژیی کرد ، پاشان گوتی «حەیە عەلەس‌سەلا ، وەجاخی خان هەر روّن بێ ، ئەم پاشایەش خۆش بێ ، گیانی (فیساگۆرس) و (ئەبو عەلیی سینا) و (ئەبو حارسی) برای شاد بێ » ، جەوالێکی لەسەر ئەو جغزە دانا کە پاڵەوان زەنگوزەر کێشا بوی و دەستی هەڵبری و گوتی : « خەڵکینە گوێتان لێ بێ ، ئەگەر ئێوە بە راستیی پیاوی خوا بن خۆتان لەبەر تەماشای من رادەگرن ، دەنا هەتا زوە بۆی دەرچن » ئەمجار هەرچیی شتێکی لەبەردابو دایکەند و خۆی روت و قوت کردەوە و بە ناو مەیداندا گەڕا و سوڕا و هاتەوە لای جەواڵەکەی و گوتی « خانی خۆم و ئەم پاشایەش ، وا بە روتیی گەڕانیی منتان بەلاوە بێ ئەدەبییە چونکو لاتان وایە من کێر و قونم هەیە ؟ نا کاکی خۆم وا نیە ، ها ، باش تێم فکرن، » بە بەر چاوی هەموّمانەوە کە بە بەر دەمماندا تێپەڕی پاش و پێشی ساف و لوس هیچیی پێوە نەبو لە پێستەکەی بەو لاوە ! هاتەوە لای جەواڵەکەی و یەك پەشتەماڵی عەدەنیی پڕ نەخش و نیگاری هێنایە دەر و لە پشتی خۆی بەست و کەوتە سەرمەقولات و خۆ هەڵدان و لەسەر دەست رۆیشتن لەم رۆیشتنەیدا هاواری دەکرد « ئەی ئاقڵینە ••• ئەی خافڵینە ••• ئەی ••• واوا لێکراوینە » یەکە یەکە ناوی خۆیان باب و باپیری پیاوەکانی پاشای دێنا و قسەی پێدەگوتن • ئەمجار هەستایەوە و لەبەر چاومان پەشتەماڵەکەی لە خۆی کردەوە و هاویشتیە سەر شانی ، کە دەبینین گەڵ و گونێکی پیاوانەی باشی لێ دەرکەوت • دیسان کەوتە هەڵبەزین و خۆ هەڵدان و فڕین ، لە کاتی بەرزبونەوەیدا کێری گرت بەدەستەوە و کەوتە میز پڕژێن کردنی ئەو خەڵکەی راوەستابون ، ئەوەی توانی بۆی دەرچو و ئەوانی دیکەی بە میز تەڕ کرد ، خەڵکەکە دەستیان بە بۆڵەبۆڵ کرد « ئەم

کابرایە تا ئێستا نەبوو کەچی ئەم هەموو بارانە نەحلەتییەی لەکوێ هێنا پیسی کردین ،» بەڵام کوردەکان کەوا دیارە شارەزای مەلا بوون دەستیان بۆ میزەکەی دەگرتەوە و لە دەمو چاوی خۆیانیان هەڵدەسو ، مەلا هەر بە هەڵبەزین و میزکردن خۆی گەیاندە جێگای پاشا و خان و لە پێشا خان و کوڕەکانی هەڵاتن ، پاشاش بە لاحەولەوالا گوتن هاتەوە ژوور ، ئەو دۆشەگە زێڕدروانەی ئەوانی لەسەر دانیشتبوون مەلا ئەوەندەی میز لەسەر کرد دەتگوت کەوتۆتە ژێر لافاو ، خان بەپێکەنینەوە گوتی « کوڕە گوللەیێکی لێدەن ئەم بێدینە » ، مەلا هاتەوە جێی خۆی ، کەچی دەبینین نە پەشتەمائی پێوەیە و نەکێر و نە میز ، جێگاکانیش هەمووی وشك و برنگ وەکوو هیچ نەبووبێ • پاشا هەر ئەوەی بۆ مابۆوە سوبحانەڵلا بڵێ و سەر بلەقێنێ • خان کەوڵە سمۆرەکەی بەری خۆی داکەند دای بە مەلا و گوتی « مەلا ، لەبەر خاتری من هەندێ کاری سەیر و مەترسی دارمان پیشان بدە » ، مەلاش گوتی « بەسەر چاو » •

مەلا گوتی «خان ، فەرمان بدە دەرگا و پلەکانەکانی ئەم مەیدانە داخەن تا شتی خۆشتان نیشان بدەم » ، خان فەرمانی دا دەرگا و پلەکانەکان داخران و مەیدان وەکوو قەڵاییێکی قایمی لێ هات ، مەلا لەجەواڵەکەی نەختێك پەڕۆ و لۆکە کۆنی دەرهێنا ، هەر کون و کەلەبەرێکی لە دەرگا و دیوارەکاندا هەبوو گرتی ، هاتەوە سەر جەواڵەکەی و پەرداخێکی دەرهێنا یەکدوو قوم ئاوی خواردەوە و پەرداخەکەی هاویشتەوە ناو جەواڵەکە ، ئەمجار کێری دەرهێنا و دەستی بە میز کردن کرد ، هەر ئەوەندەمان زانی ئەو مەیدانەدا ئاو هەستا و بەرز بۆوە و تا دەهات زیادی دەکرد و شەپۆلی دەدا ، خەڵك کە دیتیان ئاو لە ئەژنۆیان تێپەڕی کەوتنە هەرا و هاوار «کوڕە دەرگامان لێ بکەنەوە ، ئەی هاوار من مەلە نازانم ، کوڕە بۆ خاتری خوا••• » پاشا توڕە بوو بە خانی گوت «خان ئەمە چیە ، لە ناو ماڵی تۆدا

خەڵك بخنکێ؟» خان گوتی « پاشا ، مەترسە ، خنکانی تێدا نیە ، ئەمەش هونەرێکە ، نەختێك خۆت بگرە » ، خەڵکەکە زانیان نە خان و نە پاشا بە هاواریانەوە نایێن ، پەلەپەلیان پێکەوت ، دەستیان کرد بە خۆ ڕوت کردنەوە، هی وا هەبو بە ڕوت‌وقوتی مەلەی دەکرد ، هی وا هەبو لەبەر یەکێکی دیکە دەپاڕایەوە ڕزگاری بکا ، هەندێك دەچونە کۆڵی هاوڕێکانیان و هی واش هەبو شادە و ئیمانی دێنا و خۆی بۆ خنکان ساز کرد بو ، لەناو ئەو مەیدانە گەورەیەدا هەراو هوریا و قیڕ و هۆڕێك بو ئەو سەری دیار نەبێ ، ئەمجار (مەلا محەمەد) لە جەوالەکەی دو جامی دەرهێنا و دانیشت بە جامێك ئاوی هەڵدێنجا و دەیکردە جامەکەی دی ، ئەوەندەی بلێی یەك دو لافاو نیشتەوە و دلۆپێك ئاو نەما !... جا سەیری ئەو خەڵکی ناو مەیدانەکەت کردبا یەکێك خۆی بە شیشی پەنجەرە هەڵواسیوە ، یەکێك ڕوت و قوتە و جلکەکانی خۆی خستوتە سەر سەری ، یەك چوتە سەر دیوار و یەکێکی دیکە سواری کۆڵی برادەرەکەی بوە ، پاشا و خان ئەوەندە پێکەنین بورانەوە ، ئەو هەزاران ڕوت و قوتانەش لە تەریقی خۆیان دەشاردەوە و ڕویان کردبوە دیوار و نەیاندەزانی چ بکەن ، هەندێك دەپاڕانەوە « کوڕە جلکەکانم ... ئای خەنجەرەکەم ... » ، بەزمێك بو هەزار ساڵی دی بەزمی وا خۆش ڕێ ناکەوێتەوە .

( مەلا محەمەد ) هات و لە بەردەمی خان و پاشادا ڕاوەستا ، خان پێی گوت « مەلا تۆ سەری ئەم پاشایە توزێکی دیکەشمان پیشان بدە ئیدی داوای زیاترت لێ ناکەین ، » پاشا گوتی «خان پیاوی چابە ، ئەم جادوگەرە دەرکە زراوی پیاوەکانمی برد» ، خان گوتی « پاشا گوێ مەدەیە هیچ نیە ، » پاشا کە زانی خان حەزی لێدەکا ، ناچار گوتی « باشە بەلام با شتێکی خۆشمان پیشان بدا » .

( مەلا محەمەد ) هاتەوە کن جەواڵەکەی دەسرازەییێکی رەنگاوڕەنــگی دەرهێنا و خستیە ژێر پەشتەماڵەکەیەوە و کەمێك لەسەری دانیشت و دوایێ لە ناو جەواڵەکەی ناوە ، هەر ئەوەندەمان زانی خشەخش و جوڵەجوڵ لــە جەواڵی پەیدا بۆ و سەری مارێکی زۆر زلی لێ هاتە دەر ، مار وردە وردە لە جەواڵی دەرچۆ و لەبەر هەتاو لەسەر ئەو لە خۆی هــەڵخست و لەبــەر چاومان پۆچایەوە ، پاش نەختێك جۆلایــەوە ، چــاوەکانی وەکــۆ چــرا بریسکانەوە و ددانی وەکۆ ددانی فیل لە لالغاوەی سەری دەرهێنا و لەشی وەکۆ رێویێ تۆکی لێ هات ، نیو سەعاتێك مایەوە هەر دەهات و زل دەبــۆ هەتا ئەوەندەی فیلێکی لێ هات ، ئەمجا گەڕا و بە دەوری خۆیدا سۆڕایەوە و هاتەوە کن مەلا ، مەلا گوتی با تاوێك سواری ئەم داعبایە بم ، کە لێی نزیك کەوتەوە داعبا کلکێکی وای لە مەلا دا لنگەوقوچی خست ، ئەوانەی لــە مەیدانەکەدا بۆن گوتیان ئەم شتە وا لــە مەلا بکا ئێــمە چ لێــدەکا بــا هەڵێین ، هەر چۆنێك بۆ دەرگای لای چیایان شکاند و وەکۆ لافاو رایــان کردە دەرێ ، مەلا لە جەواڵەکەی خۆی دار تەپلێکی دەرهێنا و یەك دۆ جاری لە هەژدیها دا هەژدیها سەر و کلکی بەرز کردەوە و مەلا سواری بۆ بە ناو مەیداندا کەوتە گورگەلۆقە ، ئــاگر لە دەم و کونە لۆتی دەهاتە دەر و هەر چەند جارێ کلکی لە ئەرز دەدا کۆلێــك تەپ و تۆزی بــەرز دەکردەوە ، خەڵك خۆیان دەهاویشتە پەنای یەکتر و دەلەرزین ، زۆر کەس بۆرایەوە ، تەنانەت سەرنانەوا قوڕ بەسەرەکەمان فێی لێهات و لەو ناوەدا کەوت •

پاشا زۆر ناڕەحەت بۆ بانگی کرد « کوڕە مــەلا محەمەدی نەحلەتی ئەمەت لە بیر نەچێ ها ، باشە ؟ » (مەلا محەمەد) کە زانی پاشای تەواو تۆڕە کردوە بە سواری هەژدیها هاتە بەردەمی پاشا و پێی گوت «پاشا دوعــای خێرم بۆ بکە ، خوا حافیز» هەر بە سواریێ لە دەروازەی قەلا چوە دەرێ و

به بەر چاومانەوە ڕوی کردە چیـاکان و لەچاو ون بو • دیســان خەلکەکە لە مەیدان کۆبونەوە و بو بە خەلبەخەلبی باسی مەلا •

**ئامێرەکانی عیلمی سیمیای مەلا :**

ئەو جەوالەی (مەلا محەمەد) هەر لەو ناوەدا کەوتبو ، خان گازی کرد « ئادەی ئەو جەوالەی مەلامان بۆ بێنن با چاوێك بە دەزمایەکەیدا بخشێنین» پاشا حەزی نەدەکرد گوتی «تو خوا خان ئەم شتە نەحلەتییانە فڕێ دە ، » بەڵام خان گوتی « نا پاشا نا ، با کەمێکی تەماشا بکەین » •

زاری جەوالیان کردەوە و ئەم شتانەیان لێ دەرهێنا : داوە بەنی باریك لە خوریێ و بەرگن و توکی وشتر ، کەندڕ ، چەند دانــە قوتو کە دەرمان و شتی سەیریان تێدا بو ، دڕکی پەیکوڵ ، کافور ، مێوی هەنگوین ، قــیر ، عود ، عەمبەر ، قەتران ، پلیان ، زەقوم و شتی دیێ ، پارچە پەڕۆی جاو و چینیێ ڕەنگاوڕەنگ و مەخمەری کاشان و توتنی شام ، کە هەمویــان شڕ و چڵکن بون و یەك مانقڕیان نە دەهێنا ، لە ناو چەند قوتودا ڕۆن و مەڵحەم و نوقڵ و بەلەچەکی کالەك وشوتیێ و ئارد و کولەکە هەبو ، لە نــاو چەنــد قومقومەدا مەرەکەب و ئارەق و سرکە و شەراب و نەوت و ســەندەلوس • پارچەی سەلکی مەڕ و بــزن و پێچکەکانیان ، کەللــە ســەری شێرێــك ، ژمارەیێکی زۆر مار و دوپشك و هەزار پێی مردو ، سم و کەڵبەی کەر و ئێستر و ئەسپ و بەراز ، لە ناو چەند قوتویێکی دیکەدا گوێ ماسیلکە و کەللە سەرە کۆتێکی ئادەمزاد و چەند پارچەیێك لە کەللەی شێر و پڵنــگ ، پارچەی کەوڵی جانەوەران وەکو سمۆرە و دەڵەك و قاقوم و وشەك ••• کە بایێ پولێك نرخیان نەبو ، پاشا بە سەرسوڕمانەوە پرسیێ « گیانەکەم خان ، ئەم خرت و پرتە بێ سودانەی بۆ چیە ؟ • خۆ ئارەق و شەراب و سرکەش هەیە ! » خان گوتی « پاشام ، ئەم کابرایە سێ ساڵە لێرەیە ، بە درێژایێ ئەم

ماوەیە نە توتن و نە قاوەی تام نەکردوە ، رۆژ بە رۆژوە و شەو نوێژ دەکا ، تا ئێستا ئەوەی بە چەقۆ کوژرابێتەوە و خوێنی رژابێت و گیانی دەرچوبێ نەیخستۆتە زاری . هیچ نوێژێکی بە قەزا نەگێڕاوەتەوە . ئەم لـە شاری (مەرانکوش)ی مەغریب ئەم عیلمە فێر بوە و ئەمڕۆ بـۆ رابواردنی ئێـوە پیشانی دا . بەڵام با من پێتان بڵێم ئـەوەی دیمان هەمۆی خەیاڵە و هیچی زیانی بۆ کەس نیە، » پاشا گوتی «ئەدی ئەم گیانلەبەرە زیندوانەی گرتوە و ئەم کەولانەی خڕ کردۆتەوە بۆ چیەتی ؟ » خان گوتی «پرسیارەکەت بە جێیە، هەرچی شتێکی پێشانی داین بە هۆی ئـەو شتانەوەیە کە خوا دروسـتی کردۆن ، ئەمەش پێویستی بە تەڕدەستی و چالاکییە . بۆ نمونە : رۆنێکی لە خۆی هەڵسو لەبەر چاوی ئێمە ئالەتی پیاوەتی پێوە دیار نـەما ، هەندێك بۆن و دەرمانی بڵاو کردەوە لەبـەر چاومان وەك بفرێ وا دەبیندرا ، بـە قومقومە ئاوی دەپڕژاند خەڵك لایان وابو میزیان پێدا دەکا ، چۆرێك ئاوی رشتە سەر زەوی پێمان وابو لافاو هەستاوە خەڵك هاواریان لێ بەرز بۆوە و خۆیانیان رۆت دەکردەوە ، مارێکی لە جەواڵەکەی دەر هێنا لەبەر چاومان بو بە هەژدیها ، بەڵام ئەوا لە ترسی تۆ هەڵات و جەواڵەکەی لێ بەجێ ما ، هەرچی پارچە کەوڵێك لەم جەواڵەدایە دەتوانێ لەبەر چاوی بینەر بە زیندوی پیشان بدا ، ئەمانەی بۆیە هەڵگرتوە . » پاشا گوتی « جەواڵی ئەم جادوکارە لابەن ، من حەز لە یاری پاڵەوانی تەقلەباز دەکەم ، » دیسـان پـاڵەوان زەنگوزەریان گازکردەوە ، هات و تەپلەکەی خۆی لێدا .

سەربانی ماڵی خان لەلای خۆرهەڵات لە هەمو بانەکان بەرزترە و لای خوارەوەی یەکپارچە(١) گەلییە کە کەس ناوێرێ تەماشای خوارەوە بکا ، دو ئەوەندەی منارەی سلەیمانیە بەرزە ، یەك دو رۆژ پێشتر هاتبون بەردەکانی ئەم ناوەیان شکاند بو و تەختیان کردبو و لمیان لێ رۆ کردبو ، ئەم پاڵەوانە

دەیزانی لێرە یاریێ پێ دەکرێ ، ناردبوی یەك هۆڕ پەین و گڵی نەرمیان لـە سەربان بۆ دانا بو •

پاڵەوان هاتە بەردەمی پاشا کڕنوشی بۆ برد و گوتی «گەورەم مەلیك پاشا تکاییکم هەیە ئەگەر لێم قوبوڵ دەفـەرموی تەشریفـت بێتـە ئەو شانشینییەی بەسەر چیادا دەڕوانێ ، تا بزانم چیتان پیشان دەدەم ، » پاشا و خان و دەستوپێوەند گواستیانەوە ئەوێ •

تاقمی پاڵەوان دەستیان بەدەف لێدان و دەهۆڵ کوتان کرد ، پاڵەوانیش رۆیشتە سەربان هەندێ دوعای کرد و گوتی « خەڵکینە ئەمەی من دەیکەم هونەر نیە ئەمە خۆ فیدا کردنە ، لەبیرم مەکەن و دوعای خێرم بۆ بکەن ، دەی سەڵەوات لە پێغەمبەر بدەن و منیش خوا حافیز » ، ئەو زاڵمە هۆڕە پڕ لە پەین و خۆڵەکەی خستە ژێر قونی قایمی کرد و خۆی لەو بەرزاییێ دو منارەوە هەڵدایە خوارێ ، وەکو هەڵۆ بە فڕین هات پێش ئەوەی بگاتە زەویێ لەسەر جەواڵەکەی ژێر خۆی سەرمەقولاتێکی لێدا و بە ساخ و سەلامەتێ گەیشتە زەویێ و راست بۆوە ، ئەسپێك لەوێ ڕاگیرابو سواری بو و هاتەوە خزمەت پاشا ، پاشا یەك کیسە قرۆشی دایە و گەڕاینەوە بۆ کۆشکی سەر مەیدان •

دیسان دەسـتە و دایەرەی پاڵەوان تەپڵیان بـۆ لێدا ، پاڵەوان یەك چەکوچ و دو بزماری گوڵمێخێ لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی « ئەگەر خان ئیزنم بدا من بەم دیوارە هەشتا گەزییەدا هەڵدەگەڕێم » خان گوتی « ئیزنم دای سەرکەوتو بێ » ، پاڵەوان هاتە بن دیوار ، تۆزێ دوعای کرد و دەستی هەتا کوێ بڕی کرد یەکێك لە دو بزمارەکەی داکوتا ، چەکوچەکەی خستە بەر پشتی و خۆی هەڵدایە سەر ئەو بزمارە کـە درێژاییێیەکەی قولانج و نیوێك بو و سـێ قامك زیاتری چوبوە ناو دیوارەکەوە ، لەسـەر بزمار دانیشت و هەندێ جوڵە و یاریێ سەیری کرد و لەسەر ئەو بزمارە هەستایە

سەر پێ و بزمارەکەی دیکەشی لە بەرزترا داکوتا و خۆی هەڵدا چووە سەر ئەو ، وەکوو مارمێلکە خۆی لێ ئاڵاند و سـەر و لەشی بەرەو خوار شـۆڕ کردەوە و بە چەکوچ لە بزماری خوارەوەی دا تا شل بۆوە دەری کێشا و هەستایەوە سەر بزماری سەرێ ، بە پێ لەسەری راوەستا و دیسان بە چەکوچ بزمارەکەی لە ژوورووتر داکوتا و لەسەر ئەویش گەلێك هونەرکاریی کرد و ئیدی وەکوو ئەوی پێشوو بزماری خوارێی دەرهێنا و لـە ژوورتر دایکوتـا ، هەتا بەقەد باڵای نۆ پیاو بەرز بۆوە کیسە توتنەکەی لەبەر پشتی هێنایە دەر و خستیە سەر بزماری خوارەوە و خۆشی لاقی هەر لەسەر بزماری سەروو بـوو قەنەی تێکرد و سەری خستبوە سەر بزمار و لاقەکانی لای ژووروی دەلەقاند.

بە کورتی بڵێین چل و حەوت جار بزماری چەقاند و هەڵیکێشایەوە تا گەیشتە سەربان ، لەوێ بڕێك دوعای کرد ، بزمـار و چەکوچی لێـکدان و فڕێی دانە خوارەوە و هاواری کرد « موسڵمـانینە ، ئـامێری دەستی مـن چەکوچ و بزمار بون ، وا ئەوانیش نەمان ، جا من چۆن بێمە خوارێ ، چارم نیە خۆم بەردەدەمەوە . خوا خۆی ئاگادار بێ من گەردنی ئێوەم لە خوێنی خۆم ئازا کرد ، دوعای خێرم بۆ بکەن » ئەمەی گوت و لە گیرفانی جووتێك دەسکێشی دەرهێنا لە دەستی کرد و پاش بیسمیللا کردن خۆی هەڵداشت ، خەڵك هاواریـان لێ هەسـتا گووتیان پاڵەوان خـۆی کوشـت ، بـەڵام دەسکێشەکانی دەستی پاڵەوان لە ئاوریشم چندرابوون و هەر یەکی پەتێکی باریکی ئاوریشمیان پێوە بوو کە سەرێکیان لە سەربان بە دوو بزماری قایمەوە بەسترابوونەوە ، کە هات بگاتە زەوی لاقی لە دیوار توند کرد و بە گورجی هەردوو دەسکێشەکەی لە دەستی خۆی داماڵی و بە ئاسپایی نیشتەوە و قیت راوەستا . پاشا دوو لالەویچ زێری بۆ هەڵدا .

لە کاتێکدا ئێمە سەیری ئەم هونەرکارییەمان دەکرد ، خزمی یەکێك لە فەرمانڕەواکانی هەکاری کە ئەژنۆ بە ئەژنۆی خان دادەنیشت پیاوێکی

زانا و ماقوڵ و چەلەبێ بو ، ( مەلا عەلێ ) یان پێدەگوت . ئەم پیاوە لە شاخەوانیدا ناو بانگی هەیە ، کە ئەمەی دی رەگی کوردایەتێ بزوت ، بە خانی گوت «ئەرێ گەورەم، کابرایێکی بێگانەی دز بە بیاتوی کەمەندبازییەوە سەرکەوێتە سەربانی ماڵی تۆ ، گوایا شەو ناتوانێ بە هەمان رێگادا سەرکەوێت و کردەوەیێکی ناپیاوانەی لێ رو بدا ؟ تۆ بێ ئەوەی بیر لەوە بکەیتەوە چەپڵەی بۆ لێدەدەن و زێڕبارانی دەکەن ؟ من وەکو ئەم کابرایە نەمکردۆتە پیشە ، بەڵام فەرمون چاوم لێکەن »

ئەمەی گوت و چوە خوارێ ، لەبن دیوار کەوڵە سموڕەکەی خۆی داکەند و کەمێك بە پیاسە گەڕا و گوتی « ئەم پاڵەوانە بە چەکوچ و بزمار سەرکەوت ، چاو لە من کەن بزانن چۆن سەر دەکەوم ؟ ، هەر وا دەستی لە دیوارەکە خشاند تا پەنجەی لە درزی بەردێك گیر کرد ( یاحەی) گوت و خۆی هەڵبڕی قامکی لاقیشی گیر کرد و ئیدی هەروا وەکو مارمێلکە بە دیوارەوە نوسا و رۆیێ هەتا گەیشتە سەربان ، لەوێش دۆ سێ جار بەسەر دیواردا هاتوچۆی کرد و پاشان بە پلەکانی دیوی ناوەوەی کۆشکدا هاتە خوار و هاتە لای خان دانیشتەوە و داوای لێبوردنی لە پاشا کرد . پاشا گوتی « بەگم ، من لە لێهاتویێ تۆ قسەم نیە ، ساڵی پەنجاو سێ کە لە هەکارێیەوە هاتبوێتە دیاربەکر ناوبانگتم زانیبو ، پێخۆشحاڵم کە لێرەش دوبارە دەتبینمەوە ، » یەك کیسە قرۆش و قاتێك خەڵات و ئەسپێکی پێ بەخشی و نامەیێکی دۆستانەشی پێدا نارد بۆ خانی هەکارێ .

**پیشە و کارە دەستییەکانی شاری بتلیس :**

یەکەم کەس کە لە کاری دەستیدا دەبێ ناوی بێنین خانی پایەبەرزە کە لە حەوسەد هونەردا وەستایە و دیمەنی خۆشی سەیرە ، کورتە باڵا ، مل کورت ، رەشتاڵە ، لوت بەرانێ ، چاو شین ، قسە خۆش ، دەمۆچاو رون ،

گوێچکە بچوك ، سمێڵ پڕ و ردێنی تۆپە ، لەم کاتەدا کە تەمەنی گەیشتۆتە حەفتا هێشتا بە گوڕ و توند و تۆڵە ، دەنگ گەورە و ناوشان پان ، دەستی شێرانە و باسکی مەردانەیە ، ناوقەد باریك و لنگ درێژە ، هەڵسوکەوتی نەرم و بە ئاسپایییە •

ئەو جۆرە شیری شێخانیـ و مەقراویـ و تەوەرزینانەی ئاسنگەرانی بتلیس دروستیان دەکەن لە هیچ شارێکی دیکەدا وێنەی نیە • بەرگدروەکانی ئێرە هەر جلکێك بدرون جێگا تەقەڵیان نابیندرێ • دەباخ کارەکانی هەمو جۆرە چەرمی زەرد و پەمەییـ و هەڵوژەییـ و ئاسمانیـ و هەوریـ و گوڵڕەنگیـ و سور و ئاڵ و سەوزی تورنجیـ و بنەوشەییـ وایان لەژێر دەست دەردەچێ کە هەر دەڵێی قاقەزی خەتاییـ و ئەحمەداواییـیە ، تەنك و لوس و بریقەدارە ، ئەم پیشە کارێکی تایبەتیـ ئەم شارەیە ، کاروانیـ و رێبوارەکان بە دیاریـ بۆ شارانی دەبەن و بۆ فرۆشتن تا فەڕەنگستان دەڕوا و لەویـ زۆریان لەلا پەسندە ، چونکو ئەوان زیاتر چەرمی کودەریـ و تەلاتینیان هەیە و بابەتی وایان نیە • تیر و کەوانی بتلیسیش بە ناوبانگە •

**خەڵکەکەی :**

دە هەزار کەسی ئەم شارە نۆکەری خانی پایەبەرزن و مەعاشی لیـ وەر دەگرن ، شەو و رۆژ شیری شێخانیـ و مەقراویـیان لە پشتە و مەتاڵی حەڵەبیـیان بەشانەوە و گۆپاڵی سەرگیراو بەدەستەوە ، مێزەری زەرد و شین و رەش و سور و زەڕنیقی لەسەر دەنێن • جگە لەمانە پیاو ماقوڵ و خاوەن رێزیان هەیە مەعاشی تایبەتیـ وەر دەگرن •

بازرگانەکان هەتا ولاتی ( عەجەم )و ( گورجستان ) دەچن ماڵ دەبەن و کوتاڵ دێنن • هەشیانە خاوەنی کار و کاسبیـ خۆیانن •

**داهاتی :**

لەبەر ئەوەی ئێرە کەوتۆتە نێوانی چیــا بەرزەکانەوە و زەوی‌یەکەی بەردەلانە باخی باشیان هەیە و کێلگەیان کەمە ، گەنم و دانەوێڵەیان لە رێی ئەوەوە و مۆشرا بۆ دێ، دێهاتە کوردەکانی ناو چیا گەنمە شامی دەکەن بە نان، لە میوەکان پازدە جۆر هەرمێی هەیە کە بە باشی ناوبانگی رۆیشتوە •

**خواردن و خواردنەوەی :**

نانی سپی ، نانی لەواشە ، کولێرەی سپی وەکو گوڵ ، نانی ئاڵقە کە (کەمك)ی پێدەڵێن ، کاهی بە قەیماخ ، پاقلاوە ، کفتەی گۆشتی کــەو ، شۆرباي ماستاو ، چاجیفلی ، پەنــیری قجیل ، قەیماخ ، هەنگوینی شانە ، کەبابی کەو و پلاوی کەوی بە ناوبانگە •

شەربەتی کۆکەنار ، شەربەتی هەنار ، شەربەتی ئوشــتیلە ، شەربەتی رێواس ، شەربەتی موسەللەس ، خۆشاوی قەیسی و شەربەتی هەنگویناوی خۆش و ناوداره •

**خانوبەرەکانی :**

لە کۆنەوە خانوبەرەی شــەرەفخان و خانوبەرەی خاتونیە کاتێ کــە ئاوەدان بون نان و خواردنیان بەشی هەمو رێبــوار و غەریبە و هەژارێکی دەکرد ، بەلام ئێســتا وەقفەکانیان تێکچوە ، تەنیا لە مانــگی عاشــورا و شەوەکانی رەمەزاندا شۆربا دابەش دەکەن ، ئەو شۆربایەش کەس نایەوێ چونکو دەرگای ماڵی هەمو خانەدان و بنەماڵەکان بۆ رێبوار و پێداویستان لەسەر پشتە •

**سەیرانگاکانی :**

ئەو حەڤدە شیو و دوازدە هەزار باخانەی باســمان کردن هەر یەکە

سەیرانگاییکە بۆ خۆی ، لەوانە : باخی خان ، باخی میرەك ، باخی بەخدۆ و باخی ئۆیخ ناوبانگیان هەیە • یەکێکی دیّ لە سەیرانگاکان ( گۆلیّ خان )ە لە گەڕەکی تەقلەبان کە بەلەمی لەسەر دەگەڕێ • مەیدانی جلیتێن لە نزیك مزگەوتی شەرەفخان هەمو هەفتە سەرباز و پالەوان و شاسوارەکانی رۆژەکیّ لێی کۆدەبنەوە جلیت و گۆیێنیّ لیّ دەکەن •

**یاریّ گۆیێن :**

لە سەرێکی مەیدانەکەدا کۆلەکەییێکی بەردی یەکپارچە چەقاوە و لەو سەریش هەروا ، لە هەر دۆلا بە سەدان سوار رادەوەستن یەکی گۆپالێکی سەر خڕی لە زەرد گیراویان بە دەستەوەیە ، لە ناوەراستی مەیدانەکەدا تۆپێکی داری بە قەدەر سەلکی زەلامێك داندراوە ، لەپڕێکا دەهۆل و زوڕنا لێدەدریّ ، کە گرمەی دەهۆل گەرم بۆ لە هەر لاییّ سوارێك جیا دەبێتەوە و بە پڕتاو شالاو بۆ تۆپەکە دەبەن ، هەر کامیان زوتر بیگاتیّ گۆپالێکی تیّ دەسرەوێنیّ و گۆیەکە بەرەو کۆلەکەکەی لای خۆیان لێدەخوڕیّ و سوارەکەیّ خەتیمی بە هەمو هێزیەوە تەقەلا دەدا گۆیەکەی لیّ بستێنێتەوە و بۆ لای خۆیانی بگێڕێتەوە ، ئەوان بەگژ یەکدا دەچن و سوارەکانی هەر دۆ لا دەڕژێنە ناو مەیدان و دەبێتە هەرا ، ئەو تۆپە کلولە ئەوەندە گۆپالی بەر دەکەویّ جاری وا هەیە پارچە پارچە دەبیّ ، لە ئەنجامدا کام لایان توانی گۆیەکە بگەیێنێتە لای خۆیان دەیباتەوە ، لا دۆڕاوەکە دەبیّ بانگهێشتنێکی گەورە بۆ براوەکان بکا •

بە راستیّ ئەم یارییە شیاوی تەماشا کردنە ، زۆر جار لەم یارییەدا گۆپال بەر لاقی ئەسپەکان دەکەویّ و دەیشکێنیّ ، بەلام ئەم ئەسپانە ئەوەندەیان یاری پێکراوە فێر بۆن ، وەکو پشیلە لە هەر لاییێك بن چاویکیان هەر لە گۆیەکەیە ، چەند جارێك لەسەر ئەم گۆیێنە بوە بە شەڕ و خوێنی تێدا رژاوە،

بەڵام ئێستا لە پێش یارێدا بڕیار دەدەن هەر لایێ توانی پێنج جار یا دەجار تۆپەکە بگەیێنێتە لای خۆی براوەیە و لایەکەی دی دەبێ بانگهێشتنیان بکا • ئەم یارییە لە هەمو وڵاتانی کوردستان و خاکی عەجەمستاندا بە یاری قارەمانان ناسراوە •

هەر لەم مەیدانەدا ئەستونێکی چامی زۆر بڵند چەقاوە و جامێکی زیو لەسەر لوتکەکەی داکوتراوە ، کوردە سوار چاکەکان لەو سەری مەیدانێ‌ا بەتەقڵەکوت ئەسپە رەسەنەکانیان پڕ دەکەن و دێن تا دەگەنە ئاستی ئەو ئەستونە و لەگەرمەی غاردا تیرێك داوێژنە جامەکەی سەری ، هەر کەس بیئەنگێوێ لە لایەن خانەوە جامێکی زیوی دەدرێتێ •

کاتێ ئەسکەندەریش لە پشت قەڵا جێگا سەیراتێکە لەناو مێرگ و چیمەنێکی هێجگار خۆشدا و سەکۆی دانیشتنی بۆ دروست کراوە •

سەیرانگای کێوی دێوانیش کە ئەسکەندەر لە کاتی خۆیدا بۆ گرتنی بتلیس بەنداوێکی لێ دروست کردوە ، بەنداوەکە بچکۆلە و کەمە ، تەوقە سەری ئەم کێوە بە تەلەسم و فێڵی هەندەسەیێ وای لێکراوە کە ئەو دیوی کێوە بەرزەکانی وەکو چیای نەمرود و چیای مودەکێ و چیای موش و چیای کۆواری هەمو لێ دیارە ، سەیرانگایێکی خۆشە •

**زیارەتگاکانی شاری بتلیس :**

قەبری پیاوی گەورەی خوایێ و شێخی مەزنی زاهیر و باتین ( شێخ ئەبو تاهیر) کە هەزاران کەراماتی لێ بیندراوە لەناو مەدرەسەی وەرسنگێدایە، زیارەتی ( شێخول عەرەب )یش جێگایێکی پیرۆزە ، ( شێخ حەسەن قەناخێ) کە شارەزای تەفسیر و حەدیس بوە لە قولنچکێکی سەر پردی خاتونیەدا نێژراوە ، قسنی ( شێخ عەلەمدار )یش کە پیاوێکی گەورە بوە لێرەیە •

بەم چەشنە نۆسـەد و نۆ رۆژ لەگەڵ مەلیك ئەحمەد پاشا لـە شاری بتلیس بە کەیف و بەزم رامانبوارد ، منیش هەرچێ بەر چاوم کەوت و تێی گەیشتم نۆسیم ، پاشا رۆژی دەیەم خۆی بۆ رۆیشتنی بەرەو وان ساز کرد • ئەو دیارییانەی خانی پایەبەرز دای بە پاشا ئەمانە بۆن :

سێ کچی نەپشکوتو ، پێنج خولامی مۆلێنەهـاتو ، دە ئەسپی کەهێلە بە زین و لغاوی گەوهەردار و زنجیری زێڕەوە ، سـێ تفەنگی نقێمداری مازەندەرانی ، تەفسیری قازێ و بەغەوێ و کەشاف و قامۆسی ئەلبتولدان ، بیست بەرگ کتێبی شاهانە ، سێ مافوری ئـاوریشمی ئیسفەهان ، سـێ لبادی نەخچەوان ، چل شیری ئەلوەن ، دە قەتار وشتر و دە قەتار ئێستر •• پاش پێشکێش کردنی ئەم دیارییانە خان دەروێشایەتێ کرد و گوتی «تکایە ئەم پێشکێشانەم لێ قوبوڵ بفەرمۆن» • جگە لەمانە خان ئەسپێکی کەهێلەی بە زینی سۆرمە و ئەسپێکی یلکندز و قەتارێك ئێستری دا بە کوێخای پاشا، هەر وەها بۆ بیست و یەك کەس لە پایەدارەکانی پاشا یەکی یەك ئەسـپی کەهێلەی دانێ و بۆ لەوان خوارتریش حەفتا ئەسپی دا کە یەکی یەك کیسەیان دەهێنا •

پاشاش لە شوێنی مالآواییدا کەوڵێك سمۆری سپێ بە شانی خاندا دا کە لە سەرای تایبەتێ سوڵتان هاتبوە دەرەوە و وێنەی دەسـت ناکەوێ ، پشتێنەکەی پشتی خۆی کە بە گەواهێر رازابۆوە لەگەڵ خەنجەر و چەقۆکەی لە پشتی خان بەست ، بە چوار کوڕی خان و کوێخا چاکراغا یەکێ یەك کەوڵی سمۆری دانێ کە نرخیان لـە هەزار قرۆش پتر بۆ ، بۆ خێزانی خان ( خانم سوڵتان)یش سمۆرێك و تاجێکی بە گەوهەر و حەفتا پارچە قوماشی زۆر بە نرخی شـێب و بەزێر چنراو و چەند دانـە ئەڵماس و یاقۆت و زوبەرجەد و مرواری درشتی بە عەمبەراغادا نارد • بۆ نۆکەرەکانی خان و بۆ چێشتکەر و بۆ ئەو حەفتا سەرۆك هۆزانەی سەر بەخانن چەند جۆرە چۆقە و پشتێنی زۆر

باش و مامناوەندیٚ بە خەلاّت دانیٚ . خان زۆری پیٚ خۆش بۆ و خەلکی بتلیس دلشاد بۆن .

ئەو دە رۆژە لەناو خەلکی بتلیسدا مابۆینەوە جۆریٚك هۆگریٚ لە ناوماندا پەیدا بۆبۆ کە باسی ناکریٚ، پاشاو خانیش دۆستایەتیٚ و ریٚزی نیٚوان خۆیان ئەوەندە پتەو کردبۆ کردبۆیانە سەرای بەرمەکیان . (١٢)

( تۆغ )ەکانی پاشا و دوازدە هەزار سوپاکەی دەرکەوتن و چۆنە قۆناخی ریٚی ( ئووا ) ، رۆژی دوایی پاشا و خان مالاّوایی‌یان لە یەکتر کرد ، یەکتریان ماچکرد و سوار بۆنەوە شان بەشانی یەك بە شیوەکانی بتلیسدا بەرەو وان هاتنە قۆناخی‌ریٚی ئووا ، لەو میٚرگەدا چل پەنجا خیٚوەت هەلدرا بۆ ، خان پاشای لەو خیٚوەتانەدا دابەزاند و لیٚرەش نان و خوانیٚکی بۆ ساز کردبۆ کە هەر لەخۆی دەوەشیٚتەوە، پاش نان خواردن خانی پایە بەرز دەستی حەسەن و حوسیٚنی کوڕی خۆی گرت و هیٚنانیە کن پاشاو گوتی « بەخشینی هەر کەس لە قەدەر دەسڕۆیشتنیەتی ، من لەمانە بە نرختر شك نابەم کە هی خۆمن ، ئەوا هیٚناومنە خزمەتت پیٚشکیٚشتانی دەکەم بە خزمەتکاری خۆتیان قبول بفەرمۆ ، » حەسەن و حوسیٚنیش یەکی شەمامەییٚکی عەمبەری خاویان بە دەستەوە بۆ و سەر و قورئانیان لە باخەل دەرهیٚنا و دایان بە پاشا (١٣) .

(١٢) ئیشارەیە بۆ بەسەرهاتی بەرەی بەرمەکی‌یان لەگەل هارۆنەرەشیدی عەباسیٚ ، لە سەرەتاوە تەبایی و دۆستایەتی‌یان بە جۆریٚك چەسپاندبۆ کە خەلیفە ، جەعفەری بەرمەکیٚ دەبردەوە ناو مال و خیٚزانی خۆی و بەرامبەر بە عەباسەی خوشکی دایدەنا ، کەچیٚ لە پڕیٚکا لیٚیان هەلگەڕایەوە و قەلاچۆیٚکی وای تیٚخستن کە نیٚرەوەزی زیندۆی لەو بنەمالەیەدا نەهیٚشت .

(١٣) عەبدال خان کە پیرەپیاویٚکی هیٚجگار ژیرو دۆربین بۆ ، لە نیازی خراپ و ویستی دەرۆنیٚ ئەو پاشا چاوچنۆکە گەیشتبۆ دەیزانیٚ چەند ئیٚرۆییٚ بە ولاّت و دەم و دەزگاکەی دەبات و ئەم جیاوازی‌یە زۆر قولەی نیٚوان خۆی و ئەو لەمەڕ زانیاری و خویٚندەواریٚ خان و ئاوەدانیٚ و پیٚشکەوتوییٚ

پاشا ناوچەوانی مـاچ کردن و لەملاولای خـۆی دانـان و گوتی « خانی خۆشەویستم ، ئەستەخفیرۆڵڵا خزمەتکاری چیە ، ئەم دوو شازادەیە بوون بە رۆڵەی گیانی من و با لای خۆت بن پێیان بخوێنە و بیان ئاملێنە ، خوا یاربێ دەیانکەم بە دوو چرا [١٤] » پاشان پاشا و خان دوبەدوو چوونە ناو هۆبەیێکەوە زۆر پێکەوە ئاخاوتن • پاشا وای بە خان گوت :

**ئامۆژگاری مەلیك ئەحمەد پاشا بۆ خانی پایەبەرز : (١٥)**

« ئەی خانی برام ، ساڵی ١٠٤٥ کە ( سـوڵتان مراد خان ) لێرە لێت میوان بوو من هاودەم و سەلەحداری بووم ، ئەوسـاش وەکوو ئێستا زۆرمان نان و خوانی تۆ خوارد ، سوڵتان ئەوەندەی خۆش ویستی و چوو بوویە دڵیەوە کەخەراجی مووشی خستە سەر خەزێنەتان و بۆ هەتاهەتایە دایێ و کردیتی بە

---

بتلیس لە لایێك، لەگەڵ پاشایێکی کۆنە سەدری ئەعزەم و زاوای سوڵتانی ئەستەمووڵ کە لە هێز و دەسەڵات بەولاوە هۆی شانازییێك شك نابا ، لەسەر دڵی بوو بـە گرێ و هەرچەندە خزمەتی بـکا و دیاری بداتێ و دۆستایەتی لەگەڵدا بە تێن‌تر بکا ، تەمی ئیرۆیی لە دڵ نارەوێتەوە و هەتا دەسـتێکی ناپیاوانەی لێ نەوەشـێنێ گڕی ڕقە رەشـەکەی نـاخی دانامرکێتەوە . ئەوە بوو وەکو دوامین تەقەلا جوتـە کوڕی منداڵی خۆی یەکی بە قورعانێکەوە پێشکێش کرد بە هیوای شەڕ لەخۆ لادان کە بەڵکو هیچ نەبێ لە باری ئایینێ و ئینسانییەوە بەزەیی بچێتە دڵیەوە و گەڕی لێ لا بدا ، کەچێ وەکو لە پاشتردا بـۆمان دەردەکەوێ ئەمەش کەڵکی نەگرت و چزۆی دوژمنانەی خۆی هەر پێدا چزاند .

(١٤) لەناو عوسمانییەکاندا باو بوە کە دەست بەسەری یەکێکدا بێنن و بڵێن (ئەمە چرای داگیرساوی منە) ، ئەو کەسەی لەو کاتەوە دەکاتە پەروەردە و کەمەربەستەی خۆی .

(١٥) ئاشکرایە کە ئاخاوتنی پاشا و خان لە ناو خێوەتێـکی دوبەدوودا کـەس گوێی لێ‌نەبوە ، ئەمەی ئەولیا چەلەبی نووسیویەتی گێڕانەوەی قسـەی پاشایە ، ئەوەبوو پاش بڕانەوەی شەڕ و گیرانی بتلیس ، مەلیك ئەحمەد پاشا بە ئەولیا دەڵێ (من ئەم شەڕەم لەسەر دەسیەتی سوڵتان مرادخان کرد کە داوای لێکردم تۆڵە لە عەبداڵخان بستێنمەوە) .

چرای خۆی ، بەڵام ئەو سەردەمە تۆ الاو بوّیت ، ساڵی ١٠٤٨ کە مراد خان بەغدایْ گرتو گەڕایەوە دیاربەکر ، تۆ نەچوّی خەزا پیرۆزانەی لیّ بکەیت و چاوت پیّی بکەویّ ، ســولّتان لەمە زۆر تورّە بوّ بــە منی گوت « ئەحمەد توّلەی من لە (ویّسف) فەرمانڕەوای (مزووریّ) و عەبــدالّ خــانی بتلیــس بستیّنەوە » • ئەو کۆچی دوایێ کرد و نەما ، من بە والیّ دیاربەکر مامەوە ، سوپام کۆ کردەوە و چوّمە (ویّسف خــان) فەرمانــڕەوای (مزووریّ) لــە (عەمادییە) ، حەوسەد کەسم لیّ کوّشت و خوّیم گرت و بە دیــلیّ هیّنــامە دیاربەکر ، پاشان بەرەڵلاّم کرد و حکومەتەکەشیم دایەوە بە خۆی ، پیّــم وایە ئەوەت ئاگا لێیە ، پاشان لەسەر فەرمانی مراد خان سوپام خڕ کردەوە بیّمە سەرتۆ ، هەتا قەڵای میافارقینیش هاتم • ریش سپیّ کەوتنە نیّوانمان ، حەفتا کیسە و گەلیّك تالاّنی دیکەم لیّ وەرگرتن و چاوپۆشیم کرد و ئەو سوپا گرانەم بردە سەر کوردە پرچنەکانی (چیای شەنگار) ، نزیکەیّ دە هەزارم لیّ کوشتن و زۆرم بە دیل گرتن و تالاّنیّکی بیّ ژمــارم چنــگ کــەوت و گەڕامەوە دیاربەکر ، ئەمەشیان خۆت دەیزانی • برا گیانەم خان ، لە کاتیّکدا والیّ ئەرزەرۆم بوّم ، دیسان بە هۆی لاویّتیّ بە رەحەتیّ دانەنیشتی ، ئــەو کوردانەی لە ئەیالەتی ئەرزەرۆمەوە هاتبوّنە کویّستانی (هەزار گۆل) بــۆ هەوار و لەوەڕ ، تۆ بە ناوی دەیەك سەندن حەفتا هەزار سەر مەڕت لــیّ سەندن ، خاوەن مەڕەکان هاتنە لای من شکاتیان کرد ، منیش نامەییّــکی دۆستانەم بە دەستی کویّخای دەرکەوانی خۆمدا بۆ نــاردی ، لەوەڵامــدا گوتبوّت «من لە ئەیالەتی ئەودا نیم ، منیش خانیّکی پایە بەرزم ، مەلیــك ئــەحمەد پاشا چ پەیوەندیّکی بە منەوە هەیە ؟ » گوایا نامەکەمت دڕانــد بوّ و فەرمانت دابوّ کویّخاکەم بکوژن ، (عەلیاغای مۆدەکیّ) تکای کردبــوّ تا وازت لە کویّخا کەم هیّنا بوّ و هاتەوە ئەرزەرۆم ، لەشکرم ریّك خست بیّمە سەرت بەڵام (سولّتان ئیبراهیم خان) منی لە ئەیالەتی ئەرزەرۆم لابرد و تــۆ لە دەستم دەرچوّی •

ئێستاش هەرچی چۆ چۆ ، ئەو کاتانە تۆ تازەکار بۆی ، لە سایەی خواوە ئەوا جارێکی دیکەش بە یەك گەیشتینەوە و دیسان نان و نیعمەتی تۆمان خوارد و چاکەت لەگەڵ کردم ، جا خانی برام ، تکات لێدەکەم ئەوە بزانە کە من وەزیرێکی عوسمانیم و تەنیا موتەسەڕیفێکی ئەیالەتی وان نیم ، من زاوای سوڵتان مرادم ، تۆش لە ئەیالەتەکەی مندا حاکمێکی سەربەخۆیت و ئەم ئەیالەتەت بە خانەدانی هەتاهەتایە بە دەستەوەیە ، نەکەی بڵێی « من پاشام هێنایە ماڵی خۆم و ئەوەندە ڕێز و قەدرم گرت » بە قسەی درۆزن و شۆفاران دەماری کوردایەتی خۆت گرژ بکەیت و کارێکی خراپت لێ ڕو بدا ... لەگەڵ عەشیرەتەکانی دەورو پشتی خۆت بە خۆش و ئاشتی رابوێرە و ئەرکی سەرشانی خۆت بەرامبەر بە سوڵتانی عوسمانی بە تەواوەتی بەجێ بێنە ، دەنا قسەی ئەم برایەی خۆت راست و رەوانە ، ئەوەندەی تۆسقاڵێك لە جادەی راستی و ئایین و زانایی لابدەی خۆت تۆشی زیان دەبی ، پیاوەتیت بێ هەتا من لە وانم لەگەڵ خەڵکدا باش بە ، ئەگەر دەڵێی (ئیبشیر پاشا) مەلیك ئەحمەد پاشای هەڵداوە بۆ وان و تازە دەبێ چ قەدر و سەنگێکی مابێ ، منیش دەڵێم لەسەر دەسخەتی موبارەك من سەرداری گەورە و فەرمانڕەوای بێ سنور و دەستوری مۆکەڕەمم ! جا تۆش لەسەر خۆ بە و لە ڕێی راست لامەدە ، ئامۆژگاریەکانم بۆ تۆ ئەمانەن . »

کە پاشا لێ بۆوە خان گوتی « گەورەم زۆر جوانت فەرمۆ ، قسە لەمە باشتر و بەجێتر نابێ . » دیسان یەکتریان ماچکردەوە و پێش ئەوەی لێك جیا ببنەوە ، خان بە پاشای کوت «حەز دەکەم (ئەولیا چەلەبی) بۆ چەند رۆژێکی دیکەش لێرە بمێنێتەوە ، پاشان من خۆم بۆ وانی بەڕێ دەکەم . » پاشا ئیزنی دام و گوتی چەند رۆژێك بمێنەوە و پاشان زۆ وەرە لام بۆ وان . پاشا رۆیشت و من لەگەڵ خان گەڕامەوە بۆ بتلیس .

خان لە ناو خولاّمە تایبەتییەکانی خوێدا ژوورێکی بۆ دیار کردم ، شەو و رۆژ پێکەوە قسەی خۆش و گوتاری زانـایانەمان دەکرد ، رۆژێـك لـە ئێوانی قسە کردندا خان پێی گوتم «ئەولیا ئاگات لێیە ئەم پاشایەی تۆ کۆنە قینی وشترانەی لـ ە دڵدایە ؟ • لەنـاو خێوەتەکانی رێی ئوودادا بـە ناوی ئامۆژگارییەوە رابوردوی سێ ساڵەی هێنایەوە بیرم و بە چاویدا دامەوە ! پێویستە پیاو خۆی لە هێ وا بپارێزێ ، دەی ، با بزانین چۆن دەبێ ، » منیش گوتم « خانی گەورەم ، بە راستی پاشا شەرمەزاری تۆیە ، ئەو قسـانەی لە رووی خۆشەویستییەوە کردوە ، نەکا دڵت رەنجابێ ؟ ئێرە کوردستانـە نەتەوەی رۆژەکێ سەر بزێون ، ئەولات خاکی وانە ، نەوەکو کەسانی دووزوو و زمان شڕ بکەونە ئێوانتانەوە و دۆستایەتیتان بشێوێنن ، کە پاشا ویستویەتی چەند ئامۆژگاریێکت بکا دەبوایە تۆ پێت خۆش بێ ، ئەم پاشایە هەرچـی خەوش و قین و فیز و رق و دوژمنایەتێ هەیە نایزانێ ، هەتا بڵێی پیـاوێکی زیرەك و سەخییە •» بەم جۆرە گەلێکم مەتحی پاشا کرد ، خان بێدەنگ بوو•

بەم جۆرە سێ رۆژ لەگەڵ خان و پیاو ماقولاّنیدا ئەوەندەمان قسەی خۆش کرد ئەگەر هەموی بنوسمەوە دەبێتە کتێبێك ، لە چواردەمین رۆژی هاتنە بتلیسمدا خانی پایە بەرز بایەخێکی زۆری دامێ ، کەواییەکی پشت مل سمۆری چۆقەی شین بە پانتوڵ و کراسەوە کرد بە خەلاّتم ، یـەك کیسـە قرۆش و یەك ئەسپی کەهێلەی بە زین و رەختی سورمەی چندراوەوە بـە بەرەو لغاوی چاکەوە ، ئەسپێکی خۆشبەزی دی و بارگیرێك و خولاّمێکی گورجی بە بەرگ و چەکەوە پێ بەخشیم ، هەر چواردە کوڕەکانی خـان و چاکراغای کوێخا و حەیدەر ئاغا و عەرەب خەلیل ئاغا و هەمو پیاو ماقوڵ و ناودارەکان و سەرەك هۆزەکانی ئەوێ لە شیر و دەمانچە و تفەنگ و زرێ و مەتاڵ و کەمەربەند و خەنجەر و مێزەر و پارچەی هەریر و بۆهن و جەنقاوییان دامێ کە بۆ بە سێ سەوەتە جلك و حەوت ئەینی رەسەن ، خێزانی بەڕێزی

خان (سوڵتان خانم) کچی (زاڵ پاشا)ش لەیەك بوخچەی زێڕدرۆدا قاتێکی تەواو جلك و سێسەد قرۆشی بۆ ناردم • بە کورتی وایـان لێ کردم لــە هەمو شتێ تێر بۆم و هەمو ئاواتێکم هاتە دێ • جا ماڵاواییم لە خانی پـایە بەرز و هەمو بەگە سەرۆك عەشیرەتەکان و دۆستەکانی دیکەم کرد و ڕۆم کردە وڵاتی وان •

## چۆنم لە بتلیسەوە بۆ وان

یەکەم ڕۆژی مانگی شەعبان ساڵی ۱۰٦٥ لەگەڵ پیاوەکانم لە بتلیس دەرکەوتین بەرەو خۆرهەڵات • کە لە شیوی بتلیس دەرچوین بە دەشـتی ڕێی ئوادا بە چوار سەعات هاتینە قۆناخی (خانی خسرەو پاشا) •

**خانی خسرەو پاشا :**

خانێکی کۆنە بە دەست خانی بتلیسەوەیە ، هیچ ئاوایی لە کن نیـە ، (خسرەو پاشا) لەم خانەوە تا دەگاتە دەریای وان و لە بتلیسەوە تا دەگاتــە ئەم خانە لە ڕاست و چەپی ڕێگاکە ، ناو بەناو خانۆی دروستکردوە تا خەڵك هاوینان بە گەرما بێنە ژێر سێبەری و بە زستانان خۆیان لە کڕێوە و باران بپارێزن ، چونکو ئەو بەفر و بارانەی لێرە دەبارێ نە لە مـوش و نە لــە ئەرزەڕۆم و نە لە هیچ بیابانێکدا وێنەی نیە ، هەشت مانگی ڕەبــەق ئــەم ڕێگای ئوایە ئەوەندەی منارەیێك بــەفری تێدا دەمێنێتــەوە و ڕێــگای ئەملایەی بتلیس دەگیرێ • بۆیە ئەو پاشایە ئەو هەمو پارەیەی لێ خەرج کردوە ئەم خانە و خانوەکانی دیکەی سەر ڕێگای دروست کردوە کە ڕێبوار بە ڕەحەتی پێیدا بڕوا ، بەڵام وردە وردە ئەوقافەکەی کز بوە و ئەم شوێنە بۆتە بۆسەگا و مەکۆی کوردەکان و چەند لایێکیشی ڕوخاوە بەڵام شوێنــە واری هەر دیارە •

هەر بەم دەشتی رێگای ئوو‌ادا بە سێ سەعات روەو خۆرهەڵات هاتینە قەڵای (تەحتی وان) ، کوردەکان پێی دەڵێن (ئاتواڵ) ، لێرەڕا سنوری وانە، لە رۆخی دەریای وانەوە بە دەست پاشای وانەوەیە خراوەتە ژێر دەستی سەر میراو . کاتی خۆی لە زەمانی سولەیمانخاندا زاڵ پاشا لێرە قەڵایێکی بچۆکی دروست کردبۆ ، پاشان لە سەردەمی (شا تەهماسب)دا کە عەجەم گەیشتنە ئێرە و عادلجەواز و ئەخلاتیان گرت بۆ ئەوەی بێرەدا ئازوقە و یارمەتی بە کەشتی نەگاتە وان قەڵای تەحتی وانیان ئاغاکانی پاشا بە دۆ سەد کەسەوە فەرماندەی ئەم خانەیە ، ئاغایەکیش لە وانەوە گومرگی خۆی لەو کەشتییانە دەستێنێ کە دێن و دەڕۆن ، لە دەوروبەری ئەم خانەدا هەندێ ماڵە کورد هەن ، لە مزگەوتێك بەولاوە هیچ خانو و بازاڕی نیە . بەڵام ئێرە پێویستی بە بەندەرێکی ئاوەدان هەیە چونکو لەنگەرگایێکی باشی هەیە .

**دەریای وان و ئەو روبارانەی دێنە ناوی :**

لە قەڵای تەحتی وانەوە رێگاکە دەبێتە دوڕییان ، لای راستی کە دەکەوێتە باشوری دەریا سەخت و بەردەڵانە ، دەچێتەوە (دۆڵە جوان) و (کیاون) و (قەڵای سوڵتان) کە بەناو وڵاتی هەکاریدا لە رۆخی دەریاوە دەچێتە وان ، هەر لێرەوە دیسان بە قەراخی دەریادا بەرەو باکور پاش تێپەڕینی چەند قەڵا بە دە رۆژ رێگا دەگاتە (وان) ، من بیستم کە پاشا لەم رێگایەیانەوە بۆ وان رۆیشتوە ، منیش لەگەڵ هاوڕێکانم لە تەحتی وانەوە بەرەو باکوری رۆخی دەریا بەڕێکەوتین و دیمان کە ئەوسەری خۆرهەڵاتی تەحتی وان هەموی دەریایە .

**دیمەنی دەریای وان :**

مێژوی مەقدیسی دەڵێ ئەو کاتەی (نەمرود) داوای خوایەتی کرد بە دنیادا دەگەڕا خاکی وانی زۆر بلند هاتە بەر چاو ، هەرچی وەستا و

کێوهەڵکەن هەیە کۆی کردنەوە ، بە چل ساڵ بەنداوێکی نمرۆدی بنیات نا کە لە بناخەوە کرێکاران بە حەوت رۆژ بەردیان دەگەیاندە سەرێ ، ئەوەبۆ لە دواییـــدا (نمرۆد) لە خوا و لە ئیبراهیم یـــاخی بۆ ، خوا فەرمـــانیدا بـــە (جوبراییل) کە نوکە باڵێکی لەو چیا بەرزە دا بە هەمۆ کرێکار و وشترەوە بە ناخی زەویدا چۆنە خوار و ئەم دەریایە لە جێی ئەوان پەیدا بـۆ ، درێژایی چوار دەوری ئەم دەریاچەیە یازدە قۆناخە ، دەریاچەیێکە پەیوەندیَ بە هیچ دەریاییێکی دیکەوە نیە ، ئاوەکەی لە ژەهر تاڵترە ، لە خۆر هەڵاتـــەوە تـــا خۆراوا درێژایی شێست و هەشت میلە ، زستانان شەپۆلی زۆرە ، چـــوار دەوری تێکڕا پێنسەد میلە ، نۆ قەڵای لە دەورەیە و دۆ دوژگەی گەورەی لە ناودایە ، یەکیان دوژگەی (بەڵێنم هەیە)ی پێدەڵێن و ئەوی دیَ دوژگـــەی ( ئاختەمار )ە کە لەنگەرگاییێکی باشی هەیە ، ئـــەم دەریاچەیە لە ناوەڕاستا حەفتا دۆباڵیَ قۆڵە ، لـــە هەمۆ لاییێکییەوە ئاسنی بلندیان داکوتاوە بـــۆ خۆپیَگرتنەوە • ئەم دەریاچەیە لە هەمۆ لاکانەوە نزیکەی حەفتا ئاوی ورد و درشتی دێنەوە سەر •

لای باشـــوری ( دۆڵەجوان )ەکە لـــە ولاتی هەکاریدا دێ ، ( کانیَ کواش) لە خاکی (هەکاریَ) لە قەڵاکانی (جۆلەمێرگ) و وەستانڕا دێ و لـــە نزیك (قوسقۆن قڕان)دا تێکەڵ دەبیَ ، دیسان رۆبارێك لە باشۆرەوە لـــە بن کیانی قەڵای وەستاندا تێکەڵ دەبیَ •

رۆباری (خۆشاب) کە خۆیان (خۆش ئاف)ی پێدەڵێن ئاوێکی گەورەیە لە تەمۆز و پاییزاندا بوار نادا ، ئەم رۆبارە خۆی حەوت ئاوی دیکەی دێتەوە سەر و ئاوێکی خۆشە •

سەر چاوەیێکی دیکە دیسان لە چیاکانی (هەکاریَ)ڕا دێ کە لقێکی لە قەڵای (خۆشاب) و بەشێکی لە خاکی مەحمودیَیان لە کێوەکانی (ئاباغای) و

(قەرە قەلآ)وە سەر هەڵدەدا و لە قەلآی وەستانی هەکاریی‌یەوە بە ناو باخەکانی (ئەدەرمید)دا دێ و دەڕژێتە دەریای وانەوە •

ڕۆباری (کدك)ی لای باکور لە بەهاراندا هەڵدەستێ و سەر چاوەکەی لە خۆرهەڵآت لە چیاکانی ( ئاق کیرپێ ) و ( چۆماقلێ )یەوەیە ، لە خواری قەلآی (ئامق) تێکەڵ بە دەریا دەبێ •

شەش سەعات بەرەو باکور دور ، ڕۆباری (قەرەچای) دێتە خوار ، ئەمیش لە بەهاراندا خراپ هەڵدەستێ ، بەناو دەشتی (چایەری قاسم ئۆغلێ)دا تێدەپەڕێ و لە نزیك ( قەرە شێخلەر ) دەچێتە ناو دەریاوە •

ڕۆباری (جاتیك) ئاوێکی گەورەی باکورە ، سەرەتای لە کێوەکانی (بارگر)ڕا دێ و لە نزیك قەلآی بارگر دەڕژێتە ناو دەریا •

دیسان هەر لە باکور ڕۆباری (بەندی ماسێ) هەیە کە لە نزیك قەلآی بارگر دەگاتە دەریا ، ئەم ئاوە بەناو دەربەندێکدا دەڕوا لای خوارەوەی سوێرە و سەرەوەی خۆشە ، ئەویش هەر لەو کێوانە دەر دەچێ و لە شوێنی تێکەڵ بونیدا (بەندی ماسێ) هەیە ، دەریای وان کە ماسێ تێدا ناژێ بەکاری خوا لە یەك ڕۆژدا لەم شوێنە ماسێ کەڵەکە دەکەن و یەك مانگی تەواو بەم دۆڵەدا سەر دەکەون و لە زیارەتگای بەندی ماسێدا بڵآو دەبنەوە ، گژو گیای ناو ئاوی دەخۆن و گوایا زیارەتی ئەو شەخسە دەکەن ، لە پاش مانگێك دەست بە گەڕانەوە دەکەن ، لە لایەن دەفتەرداری وانەوە ئاغایێك ڕێگایان لێ دەگرێ و ماسێ لەو دۆڵەدا دەمێننەوە ، جا ئاغای دەفتەردار بە سەدان کرێکار و خزمەتکارەوە بەردەبنە ماسێ‌گرتن • بە هەزاران بازرگانی عەجەم و ئەرمەنێ پانتوڵ شین دێن ئەم ماسێیانەی میرێ دەکڕن و بە سەدان وشتری لێ بار دەکەن بۆ وڵآتی عەجەمستان و لخیجان و باکۆ و ئازەربایجانی دەبەن ، ئەم ماسێیانە زۆر قەڵەو و بە تامن ، هەمۆ ساڵێ دەسکەوتی میرێ

لەم ماسیانە تۆ بار ئاقچەیە کە دەدرێ بە ئازوقە و مەعاشی قەڵاکانی رۆخی دەریا • رۆژی راوەماسی ئەو ماسیانە وەکو لە بەسەرهاتی خۆیان گەیشتبن لەبەر دەستی خەڵك راناکەن • شەرەفخانی خاوەنی (شەرەفنامە) دەڵێ ئـەم زیارەتگای سەربەندە گۆڕی یەکێك لە زاناکانی سـەردەمی ئەسکەندەری مەزنە و گوایا ئاو و هەوای بارگری چۆتە دڵەوە و تێیدا نیشتەجێ بـوە ، جا بۆ ئەوەی بژیوی خۆی و خەڵکەکە پەیدا بـکا تەلەسمێـکی لێـرەدا شاردۆتەوە کە سـاڵی جارێ هەمـو ماسیـەکان روی تێ دەکەن و لـە گەڕانەوەدا دەگیرێن •

لە گەورەیی خوا ، ئەم دەریاچەیە کە ئەم هەمو ئـاوی روبارانـەی دێتەوە سەر ، نە دڵۆپێ زیاد دەکا و نە کەم ، ئـاوەکەی وەکـو ژەهـری هەلاهیل تاڵە ، هەر کەس تـارەتی پێ بـکا لەشـی دەسوتێتەوە و خەڵك خۆیانی لەبەر ناگرن•ئەوانەی نیشتەجێی رۆخی ئەم دەریایەن بۆ جلكشوشتن پێویستیـان بە سـابون نیە ، هەر بـە ئـاوەکە کەلوپەلیـان بە جۆرێك خاوێن دەبێتەوە کە جاوەکانیان وەکو پەمۆی لێ دێ •

لە کاتی بای باشور و خۆراوا ، دەریا شەپۆل دەداتەوە و دەبێتە فەرتەنە، نزیکەی پەنجا پارچە کەشتی لەسەر ئەم دەریایە دەگەڕێن • شتومـەك و کەلوپەل لەم قەڵا بۆ ئەو قەڵا دەگوێزنەوە •

**دیمەنی سەرسوڕێنەر :**

یەکەم دیمەنی سەیر کە لە رۆخی دەریای واندا دیمان یەکێك لە کارە سەرسوڕێنەرەکانی خوا بو لە دۆڵێکدا نزیك تەحتی وان و بڕانەوەی رێگای ئووا •

دەگێڕنەوە گوایا پێش ئەوەی بەندی نەمرود نغرۆ ببێ ، کاروانە وشتر لەسەر چیا بارە بەردیان هێناوە کە بە فەرمانی خوا قەتاری وشتر و بـار و

وشترەوان هەمو بۆنە بەرد ! جا ئێستا کە لە خوارەوە تەماشا دەکەی بە ئاشکرا دەبینی کە ئەو وشترانە بەریز بارکراون، هەندێک بار کراون و هەندێ یخ دراون یا بە پێوە وەستاون ، هەندێ لەوانە تێکدراون بەلام شێوەکانیان وەکو خۆی ماوە ، سێ هەزار و حەوسەد ساڵە هیچیان لێ نەهاتوە ! کاتێ لە دوورەوە بۆیان دەڕوانێ وا تێدەگەی ئەوا کاروانێک بەرەو وان کەوتۆتە رێ ، هەمۆشیان (بەردە ستێ) ن ٠ سەیرتر ئەوەیە لە وشترەوانەکان هەندێکیا ندەستیان هەڵبڕیوەتە ئاسمان و هەندێ لەپەوڕۆ سەریان خستۆتە سەر خاك و هەندێکی دێ لەسەر لا راکشاون ٠ هەرکەس ئەمە دەبینێ سەری لە کاری خوا سوڕ دەمێنێ ٠٠٠ منیش لێرەدا زۆر لەبەر خوا پاڕامەوە ٠

لە کاتی رۆیشتنمان بەرەو باکور هاوڕێکانم گوتیان « قوربان ، لەم نزیکە شتێکی سەیر هەیە ئەگەر حەز دەکەی با بچین ببینین» گوتم «براکانم، من هەمو ژیانی خۆم لە پێناوی گەشت و سەیاحەتدا بەختکردوە ، دەی با بڕۆین » ٠ نزیکەی یەك سەعات بەرەو باکور رۆیشتین ، لە شاری (مۆش) لاماندا ، بە کوێرە رێگاییێکی بەردەلانیدا چارەك سەعاتێك رۆیشتین ، ئەم شتە بێ هاوتایەمان دی :

پارچە ڕەوەزێکی قۆچ وەکو منارە قوت بۆتەوە ، لە تۆقە سەرەکەی ئادەمزادێك بە زنجیر بەستراوەتەوە کە تەنیا ئێسکەکانی ماوە ، زنجیرەکانی نەڕزیون و هەر دەڵێی تازە لە ژێر دەستی وەستا هاتۆتە دەرێ . **ئێسکەکان** هێجگار سپین ، ئێسکی قۆڵ و باسکەکانی حەوت هەشت گەز دەبن ئەستور و درێژ ، کەللە سەرەکەی بەقەدرایێ گومبەزی ژورە بچکۆلەکانی گەرماوە ، کونە چاوەکانی بە رەحەتێ زەلامیان پێوە دەچێ ، تەنانەت هەڵوی مێشکی هێلانەیان تێداکردوە ٠

دەڵێن ئەم ئێسکانە هی موسڵمانێکە باوەڕی بە (ئیبراهیم پێغەمبەر) کردبو ، (نمرود) لەسەر ئەم ڕەوەزە بەستویەتیەوە و ئاگری لە ژێردا کردۆتەوە ، خوای گەورە پاش سوتان ئێسکەکانی بە ساختی هێشتۆتەوە ، هەندێ لەو ئێسکانە لەگەڵ بەردەکەدا جۆشی خواردوە ، ئێستا تەنیا ئەژنۆی و قۆڵەکانی و سەری لە بەردەکەوە دیارن • ئەم شوێنە ماوەیێکی باش لە جادە دورە • شێخ مستەفای ئەخلاتی دەڵێ «ئەم پیاوە لە ئۆمەتی برایم پێغەمبەرە و خۆم لە چەند کتێبی مێژودا دیوم» ، ( مەقدیسی ) مێژونوسیش هەروا دەنوسێ • سەیر ئەوەیە ئەم ئێسکانە زیاتر لە دو هەزار ساڵە هەر ماون و نەڕزیون •

پاش تەماشای ئێرە بەرەو باکور ڕۆیشتین ، بە چوار سەعات بە ڕۆخی دەریادا هاتینە گوندی ( ئازغاك ) کە سەر بە سنجاقی ئەخلاتە و گوندێکی ئاوەدانە •

دیسان سێ سەعاتی دیکە بە گوێ ئاودا ڕێگامان بڕی تاگەیشتینە (بەندی کاسێ) کە شوێنی ماسێ گرتنە و داهاتەکەی لەلایەن دەفتەردارەوە وەردەگیرێ و ئەمانەتێکی میرییە • لێرەوە بەرەو باکور هاتین دەریا کەوتبوە لای ڕاستمانەوە، بە تەماشای گوند و ئاوایییەکانەوە گەیشتینە کۆنە شاری ( ئەخلات ) •

**کۆنە شاری ئەخلات :**

دەڵێن ئەم شارە مەڵبەندی (عاد)ەکان بوە ، لە ترسی ڕەشەبا خۆیان لە ئەشکەوتی چیاکاندا شاردۆتەوە ، بە تایبەتی ئەشکەوتە زلەکانی چیای ( سوبحان ) کە هەریەکەیان بە ڕەحەتی جێی سێ هەزار کەسی تێدا دەبێتەوە• مێژونوسان ناوی ئەم شارەیان (داربلە) نوسیوە ، واتا شاری تیرەی زەلامە زلەکان • ئەم شارەش دەستاودەستی کردوە و ئەوەندەی پەرە سەندوە کە

سەرێکی لە کەناری دەریاوە گەیشتۆتە قەڵای (ئەرجیش) ، باخ و باخچـە پەرژێن دارەکانی یەك لەسەر یەك دنیای پڕکردوە و هەوارگەیـان چیـای ســوبحان بوە •

**هۆی تێکچوونی شـاری ئەخلات :**

پێشوتر ئەم شارە بە دەست شایەکانی ماهانەوە بوە ، یەکی لەو شـا گەوجانە ویستویەتی لەشکر بکاتە سەر شای ( سەمەنکان ) ، بۆ ئازوقەی سوپا داوای سەد هەزار هێلکەی لە خەڵکی ئەخلات کردوە ، خەڵك کە ئەم فەرمانەیان پێدەگا دەڵێن «تا ئێستا داواکاریێ وا نەبیستراوە بەڵام چارێشمان نیە ، » هەرچۆنێك بێ سەد هەزار هێلکە کۆ دەکەنەوە و ئەمجا دەمێنێتە سەر ئەوەی ئەم هێلکانە چۆن بگەیێنن ؟ کە ئەم هەواڵە دەگاتە شای (ماهان) ، نامەیێکیان بۆ دەنێرێ کە «من داوای هێلکەی مریشکم لە ئێوە نەکردبـوّ ، هێلکەی زێڕم لێتان ویستوە ، بەڵام چونکو ئەوەندە هەژارن ئـەوا دەتان بەخشم و هەرکەسـە هێلکەی خۆی وەرگرێتەوە » • خەڵك دێنە سـەر دابەشکردنەوەی هێلکەکانو لەسەر ئەوەی ئەو دەڵێ هێلکەی من زل بوّ ئەم پچوکەم ناوێ یا من هەر هێلکەکەی خۆمم دەوێتەوە لێیان دەبێتە هەرا و بەگژ یەکدا دەچن ، پیاوە ژیرەکانیان دەڵێن « ئێمە مافی یەکترمان نەپاراست، تـازە پیت و بـەرەکەت لـەم شـارەدا نەمـا و تـوشی بـەڵاییێکی زل دەبین » ، هەمو ترسیان لێ دەنیشێ ، زۆری پێ ناچێ پەتـای ڕشانەوەیان تێدەکەوێ •

بە یەك شەو دوازدە هەزار ماڵ بار دەکەن و دەڕۆن هەتا وڵاتی میسر ناوەستنەوە ، لـەوێ دەچنە کن ( ئەلموسـتەکفی بیللا )ی خاوەنی قەڵای (ئەلکێش) و داوای حاوانەوە دەکەن ، ئەویش لە ناوچەی خۆرهەڵاتی میسر کوێستانی (قایتبای)یان دەداتێ تێیدا نیشتەجێ دەبن ، لە ماوەی ساڵێکدا

شارێکی خۆش پێکەوە دەنێن و خشتی سور بەکاردێنن کە میسرییەکان نەیاندیبو ، ئێستا لە بەشی خۆرهەڵاتی ( قاهیرە ) لای تۆپخانە گەڕەکی (ئەخلات) هەیە چەند هەزار کاولێکە لم و خۆڵ داپۆشیوە •

شای ماهانیش کە ئەو زوڵمەی لە ئەخلاتییەکان کردبو لە شەڕی (سەمەنکان) بە شکاوی و سەرشۆڕی گەڕایەوە و دیتی کەوا دوازدە هەزار ماڵ لە (ئەخلات) کۆچیان کردوە •

پاشان لە شایەکانی ئازەربایجان ( سوڵتان جەلایر ) ئێرەی ئاوەدان کردەوە • باپیرە گەورەی عوسمانییەکان (قویا ئەلپ بای ) کە کاکی ئەرتوغرولە لەگەڵ براێکی بە ناوی ( بایندر خان )و باوکیان ( سولەیمان بای ) لە پەنا قەڵای ( جەعبەر ) لە ئاوی فوراتدا خنکا • ئەمانە لەداخی تەتارەکانی چەنگیز وڵاتی ماهان بەجێدێڵن و دێنە ئەخلات ، لای ( سوڵتان جەلایر) دەبنە بۆیبەگێ و دادەنیشن •

ئەم عەشیرەتی جەلایرە کە بەرە باوکێکی تەتارە چەنگیزییەکان بون و پیاوی ئازا و مەردیان تێدا هەڵکەوتوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە (سوڵتان جەلایر) بوبوە شای ئاق قۆیونلوەکان دیسان هەر (ئاقچە قۆینلی)یان پێدەڵێن واتا بچوکیان دەکەنەوە و بە سوك ناویان دێنن ، ئەمانە بنەچەیان لە وڵاتی ماهانی پشت روبار ـ ماوەرائو نەهر ـ ەوە هاتون ، لەم ئەخلاتەوە بۆ هەر شوێنێك دەچون لە شەڕدا بە سەرکەوتویی دەگەڕانەوە ، لەبەر ئەوە سوڵتان جەلایر شاری ئەخلاتی بە ملکایەتی دا بە خۆیان و ئەوانیش ئاوەدانیان کردەوە ، خزم و عەشیرەتیان لە وڵاتی (تورکستان) کە هەواڵی خۆشی ئەخلات و دەسکەوتی ئەو هەمو تاڵانە دەبیستن بەرە بەرە کۆچ دەکەن و دێن بۆ ئەم ناوە و ئیدی وردە وردە خاکی قەیسەرەکانی رۆم داگیر دەکەن و لەم ناوەدا هەرا دەنێنەوە • دانشمەندییەکانیش هاتنە ئەخلات و بەهۆی شەڕ و تاڵانەوە

دەوڵەمەند بون ، پاشان لەشکری تەتاریان گەیشتە سەر و بلاوەی پێ کردن، لە ساڵی ٤٧٦ دا شاری ئەخلات بۆ ( قەرە وێسف کوڕی جەلایر )مایەوە و ئەویش ساڵی ٨٠٥ لە ترسی ( تەیموری لەنگ )هەڵدێ و پەنا دەباتە بەر ( ییلدرم بایەزید ) ، تەیمور داوا لە ییلدرم دەکا وێسفی بداتەوە بەلام نایداتەوە ، تەیمور هەڵدەکوتێتە سەر پرۆسە و لەسەر رێ ئەم ئەخلاتە کاول دەکا و داری لەسەر بەردی ناهێڵێ • بۆیە ئێستا کۆنە شارێکی ئاوەدان کراوەیە •

ساڵی ٨٦٨ ئێرە کەوتە دەستی ( شا حەسەنە درێژ ) ، ئەو کاتەی (سولتان محەمەد خان) داگیرکەری ئەستەمۆڵ هاتە سەر حەسەن و لە دەشتی (تورجان) لێکیان دا ، حەسەن بەزی و بە حەڤدە سوارەوە گەڕایەوە (تەورێز) و لەوێ مرد ، تەرمەکەیان هێنایەوە ئەخلات ناشتیان •

سەردەمێکیش ئێرە کەوتۆتە دەست شایەکانی ئێران ، لە ساڵی ٩٢٠دا کە سولتان ( سەلیمی یەکەم ) شای ئێرانی بەزاند خەڵکی ئەخلات هاتنە کنی و پێیان گوت « قوربان باپیرانی تۆ لێرە نێژراون ، بۆ پاراستنیان قەلایێکمان بۆ دروستبکە ، » بەلام سەلیمی یەکەم زۆر کەیفی بە قەلاکردن نەدەهات گوێی نەدانێ ، چوە سەر ( سولتان عەلائودەولەی زولقەدرێ ) فەرماندەی مەرعەش کە یارمەتی عەجەمەکانی دابو ، لە دەشتی (کۆکش)دا ئەویشی شکاند و پاشان پەلاماری میسریەکانی دا ، ( سولتان سەلیم ) ساڵی ٩٢٦ لە ئەستەمۆڵ مرد و ( سولتان سولەیمان ) لە جێی دانیشت •

براێکی ( شا تەهماسبی ) ئێران کە ناوی ( ئەلقاس میرزا )یە لە شای کاکی دەتۆرێ ، شایەتی ( شیروان )و (شەماخی) بەجێدێڵێ و لە دەشتی قەپچاقەوە خۆی دەگەیێنێتە ناوچەی کریمە و لەوێشەوە دێتە ئەدرنە بۆ کن سولتان سولەیمان خان ، سولتان زۆر رێز و قەدری دەگرێ ، پاشان بە

لەشــکرێکی زۆرەوە دەچێتە ســەر خاکی عەجەم ، (روان)و (گەنجــە)و (نەخچەوان) و (تەورێز) و (خۆی) و (مەرەنــد) و (ورمێ) و ( دۆمبــلی ) داگیر دەکا ، لە گەڕانەوەیدا (وان) و ئەو حەفتا پارچە قەڵایانەی سەر بە وانن لە ساڵی ٩٥٥ دا خۆیان دەدەن بە دەستەوە و هەمو کوردستان دەچێتە ژێر دەستی • بە قەراخ دەریای واندا دێتە ئەم ئەخلاتە و دەچێتە ســەر قەبری باپیرانی و فەرمان دەدا بە ( زاڵ پاشا )و (وەستا سەنانی میعمار) کە قەڵایێکی قایمی لێ دروست بکەن ، خۆشی لە بتلیسەوە دێتــە دیــاربەکر و لەوێوە دەگەڕێتەوە ئەستەموڵ • لەولاشەوە ( زاڵ پاشا ) بە راوێژ لەگەڵ خەڵکی ئەخلاتدا لە خوارۆی کەلاوەکانی کۆنە ئەخلات لە رۆخی دەریا لەسەر پارچە زەوییێکی تەخت دەست دەکا بە بنیات نانی قەڵا •

**دیمەنی قەڵای ئەخلات :**

وەکو گوتمان ئەم قەڵایە ساڵی ٩٦٥[١٦] لەسەر نەخشەی سولەیمانخان بە دەستی زاڵ پاشا دروستکراوە ، قەڵایێکی چوارگۆشەیە لە گوێ دەریا، درێژاییی هەیە چوار دەوری سێ هەزار شەقاوە ، تێکڕا سێزدە قوللەی هەیە دیوارەکانی زۆر بەرز تین ، خەندەکەکەشی زۆر قوڵ نیــە بەڵام هێجــگار قایم و پتەو داڕێژراوە و دیوارەکانی زۆر پانن ، سێ دەروازەی، ئاســنی بە رۆی دەریادا هەیە ، لە سەر دەروازەکە بە خەتێکی درشت ساڵی تەواوکرانی نوسراوە ــ ٩٦٣ ــ •

ئەم دەروازەیەی لای دەریا رۆی لە قیبلەیە ، ناو قەڵا سێسەد و پەنجا خانوی بە قوڕ سواقدراوی تێدایــە ، مزگەوتێك و گەرماوێك و خانێك و نزیکەی بیست دوکانی هەیە ، سەر بە ئەیالەتی وان و پاتەختی بەگی موشە•

---

(١٦) ئەم (٩٦٥)ە هەڵەی چاپییە و راســتییەکەی (٩٥٦)ە ، چونکو ســاڵی تەواوبونی قەڵاکە (٩٦٣) بوە .

لەلایەن سولتانەوە (٤١٠٠٠٠) ئاقچەی میری بۆ داندراوە ، بەگەکەی هەمو سالێ بیست کیسەی دەستدەکەوێ ، بە پێنسەد کەس بەسەر گوندەکانی ئەم سنجاقە رادەگا ، ٤٤ زەعامەت و ١٣٠ تیماری هەیە، بەگی ئالآ و گەورەی چەرێ و هەزار عەسکەری جبەلەبەری هەیە کە لەژێر فەرمانی بەگدا دەچن بۆ شەڕ ، پلەی قازێتییەکەی سەدو پەنجا ئاقچەیە و دەسکەوتی سالآنەی قازێ دوو کیسەیە ، شێخەل ئیسلام و نەقیب و کوێخا و فەرماندەی نیە ، شا بەندەر و باجگر و دارۆخە و میراوی لـە ئەستەموڵەوە بۆ دادەندرێ ، قەلآدارەکەی سەد نەفەرێکی هەیە کە هەمو شەو تەپڵ لێدەدەن و هەمیشە سازن • بەشی خۆی جبەخانە و چەند تۆپی گەورە و گچکەی شاهانەیێ و کولومبۆرنێ هەیە، ئەمینداری گومرگ لە بەندەری قەراخ دەریا دادەنیشێ و هەر کەلوپەلێك بێ دەیەکی میری لێ وەردەگرێ و مەعاشی هێزی قەلآی لێ دەدا • سالآنە بە حەوت بار بە قۆتتەرات دەدرێ •

**کەلاوەکانی ئەخلات :**

لە ناو کەلاوەکانی ئەم شارە بە سەدان گومبەزی مزگەوتان هەیە کە لە بەرد دروستکراون و بە خشتیسوور داپۆشراون و زۆر کۆنن ، ئێستا نوێژ و جومعەیان لێ ناکرێت و بون بە هێلانەی قەل و کوند ، یەك لەوانە مزگەوتی (ئەمیر خای)یە کـە بێکەس و بێناز کەوتوە ، دەرك و دیواری ئـەوەندە نەخشین و رازاوەیەوە دەلێی قاقەزی ( غەناکی )یە •

ئەمیر قای کە ئەم شارەی گرت چەند مزگەوت و فێـرگە و خـان و خاتوبەرەی گەورە لەناو شارا هەبو هەموی بە خەتی خۆی لە دیوارەکانی ئەم مزگەوتەدا نوسیوە ، من خۆم ئەو نوسراوانەم خوێندەوە و بە دوربێنێ ساخم کردنەوە و نوسـیم • زمانی خەلـکی ئـەم شارە شێوەیێـکی مەغولی و جەغەتاییە •

ئەمجا نوسیبی سەرژمێری شار بەپێی ئەو نوسراوە : سێ و پێنج هەزار میحرابە ، ــ راستە منارەی زۆری تێدایە بەڵام پێم وایە ئــەم ژمارەیە زۆر زیادە ــ دو هەزار مەدرەسە، هەزار گەرماو ، دو هەزار خان ، هەزار شوێنی حەدیس گوتنەوە ، شەش هەزار قوتابخانە ، هەشسەد تەکیە ، هەژدە هەزار کانیاو ، هەشت هەزار سەبیل ، دە هەزار گەڕەك ، دو سەد هەزار ماڵ، حەفتا هەزار خانوبەرەی گەورە ماڵان ، سێ هەزار کاروانسەرا ، دو هەزار خانی غەریبان ، شەش هەزار دوکان ، لە سەدو پەنجا جێــگا گومبەزی گوزەری زێڕنگەر و گەوهەرفرۆش ، حەوســەد عمارەت ، چل هەزار ســەیرانگا ، نوسەد هەزار باخ و باخچە ، حەفتا هەزار زیارەتگا ، شەش سەد هەزار مەلا و زانا و پیاو ماقوڵ ! نوسەری سەر دیوار زۆری لەم قسە خەیاڵی و هاش و هوشانە نوسیوە و شارەکەی ئەوەندە گەورە پیشان داوە لە ســنور چۆتە دەرێ ، ئەم شتانەی هەمو لە خۆیەوە هەڵبەستوە و مەبەستی زۆر زلکردنی شارەکە بوە •

چەند سەد کەسێك لە ناو ئەم کاولستانەدا دەژین ، ئاوی خۆش و باخ و باخچەیان هەیــە و بەبێ ترس خەریکی کار و کاســبی خۆیانن ، زۆریان ملکەکانیان لە بابو باپیرانەوە بۆ ماوەتەوە بۆیە هەر یەکەیان خانوی خۆی سەد میل لەوانی دی دورتر دروستکردوە و بە تەنیا دەژین ، بەڵام هەمویان پیاوی باشن •

لەئەشکەوتەکانی ئێرەدا پیاوی خوایی وا هەیە چل ســاڵە لەسەر پارچە حەسیرێك دەژێ و لەم ماوەیەدا گۆشتی گیانلەبەری نەناوەتە سەر زمانی ، لەوانە (شێخ مستەفای ئەخلاتی)یە کە چل ساڵی رەبەقە بە رۆژوە ، یەکێکە لە گەورە پیاوانی حەنەفی ، من چومە خزمەتی ســەلامم کرد ، دەیزانی من کێم گوتی « وەعەلیکە سەلام ئەی محافزی ئەولیای دنیا گەڕ » ، داوای دوعای خێرم لێ کرد ، گوتی «پەنجاو پێنج ساڵە دوعای خێرت بۆ دەکرێ و بەهرەی

ئەو دوعایانەت پێ گەیشتوە ، تۆ نەختێ قورعانم بۆ بخوێنە منیش دوعات بۆ دەکەم ، با سەوداکەمان وابێ » ، لەسەر چۆك دانیشتم و ئایەتێکم بۆ خوێند ، ئەویش دوعای بۆ کردم و دەستی بە ردێنیدا هێنا و کردمی بە برای دنیا و قیامەتی خۆی و گوتی « بڕۆ خوای گەورە لەم گەڕانەتدا پشت و پەنات بێ ، هەر شت بزانە و خۆت بە کەم بگرە ، » ئیدێ مالاوایێم لێ کرد •

( شێخ عەلی ئەخلاتی ) کە سێ ساڵە لە ئەشکەوتێکدا رۆژوی داودی دەگرێ ، پیاوێکی بە نرخە و بەراستێ مەردی خودایە ، لەسایەی خواوە بە خزمەت ئەویش گەیشتم •

( حەسەن دەدەی ئەخلاتی ) لە تەریقەتی خواجەکاندا گەیشتۆتە ئەو پەڕ و ئێستا دەستی لە تێکەڵی و دواندنی خەڵك هەڵگرتوە •

جگە لەمانە لە ئەشکەوتێکی دامێنی کوێستاندا پیاوێکی گەورە هەیە ناوی (شێخ تەقی دەدە) یە •

لەمە زیاتر باسکردنی ئەم شارە وێرانەیە کەڵکی نیە و خوێنەر وەڕەز دەکا ، کاری دنیا وایە ، ئەنجامی هەمو ئاوایییەك کاوڵ بونە • ئەو شارە کاولانەی من توشیان هاتوم بریتێ بوْن لە ـ ( کوفە ) لە عیراقی عەجەم ، (کۆنە بەغدا) ، (کۆنە موسڵ) ، (میافارقین) • لە عیراقی عەرەبدا (ئەنتاکیە)• لە میردا ( ئەسکەندەریە ) ، (عەسقەلان) ، (تەبەرستان) ، (بوسرای حۆران)، (تەرسوس) • لە ئەنادۆڵی ( بەلات ) ، (مەلاختێ) ، (ئایاتلوق) ، (ئایدنج) • لە رۆمێلی (ئاتینە) و (کوالە) • لە کرێسە (کۆنە کریم) ، شاری (ئیبن کرمان)و (عیراق دا.یان) لە داوێنی کێوی ئەلبورز و گەلێك شوێنی دێ •

ئەم شاری ئەخلاتەش وەکو ئەو کۆنە شارە کاولانەیە و پێویست بە لەسەر ڕۆیشتنی زۆر ناکا ، بەلام زمانە و خۆی پێ ڕاناگیرێ ••• ئاخر ئەم شارانە وەختی خۆی بە هیمەتێکی زۆر وا ئاوەدان و گەورە کراون ، پیاو

داخ دەخواو جەرگی ژان دەکا کە ئاوایان دەبینێ ، بەلام دەڵێی چی دنیا وایە ، هەمیشە تا لایێك ئاوەدان دەکرێتەوە لایێکی دیکە کاول دەبێ •

**زیارەتگای باپیرانی سوڵتانە عوسمانییەکان :**

قەبری ( قویا ئالب بای ) کاکی (ئەرتوغروڵ) کە پیاوێکی ئازا و قارەمان بوە لە تەنیشت قەبری (حەسەن بایندرخان)ی برایەتی ، بە فەرمانی شای (ماهان) کراوە بە خانی (ئەخلات) و زۆر بنیاتگەی لەم شارەدا هەیە •

ئەوانی دێ : ( سوڵتان عەبدوڵلا ) ، ( عیزەددین خان ) ، سوڵتان حەسەن) ، (سوڵتان مەیمەندێ) ، (سوڵتان بۆغەبای) ، (سوڵتان تۆختە بای)، (قورقود خان) ، (سوڵتان عەلێ خان) ، (سوڵتان کازم) ، (سوڵتان بەندێ خان) ، (زۆربای خان) ، (ئیسماعیل خان) ، (بەدربای خان) ، (چیغەلی خان)، (تۆختەمیش خان) ، (سەلجوق خان) ، (ئیسرایيل خان) ، (مەعسوم بای) ، (قوەتلێ بای ) •

ژنەکانیش کە لەولاتر نێژراون ئەمانەن : (ماما خاتون) ، (سرمە خاتون)، (جان خانم) ، (نیلوفەر خانم) ، (سەرو بۆی خانم) ، (زیبا خانم) ، (وەسفیە خانم) ، (خورشید خانم) ، (دۆندی حورمە) ، (سەفیە حورمە) •

لە بنەماڵەی دانشمەندی‌یەکانیش : (مەلیك گوندوز) ، (مەلیك قبلە) ، (مەلیك سەفا) ، (مەلیك موقەددەس) ، (مەلیك عومران) ، باپیرانی ئەمانە لە (نیکسار)ی نزیك (سیواس) نێژراون •

بنەماڵەی چۆپانیش کە ئەخلاتیان بە **دەستەوە** بوە و خەڵك ئەمیریان پێدەڵێن دوازدە کەسن ، ئەمانیش بنەچەیان لە ماهانەوە هاتوە ، ساڵی ۱۲۳ لە زەمانی مەلیك هوشامی ئەمەویدا لەگەڵ داغستانییەکان موسڵمان بون و لێرە نێژراون : (ئەمیر زیاد) ، (ئەمیر یادس) ، ( ئەمیر کوردومان ) ، ( ئەمیر

عیدبار) ، (ئەمیر قنیاق) ، ( ئەمیر سارەوان ) ، ( ئەمیر سـولتان وەلی ) ، (شەمسەدین) کە باپیرە گەورەی خانەکانی بتلیسە •

لە قەرەقۆینلوەکانیش ئەوانەی لێرە نێژراون : ( قەرە جەلایر خان ) ، (قەرە وێسف خان) ، (قەرە دورمش خان) ، (قەرە بورخان)و (قەرە شێخی خان ) •

ئافرەتەکانی ئەمانە لە ژێرزەمینەکانی ناو شاردا لەسەر تەختەکانی خۆیان راکێشراون و رۆژی مردنیان لە تەنیشتەوە نوسراوە • لەو ژێرزەمینـانەدا تەخت و سەکۆی بەردیان بۆ کردوون ، هەندێکیان بە جلکی قەدیفەوە ، بـە کفنی سپی ، بە پرچ و ردێنەوە پاڵخراون ، زۆریشـیان وشك هەڵاتون • تەنانەت قولەرەشێك بە پێوە راگیراوە و دارێکی بە دەستەوەیە پیاو لە دەمو چاوی دەترسێ ، ئێرە قسـنەوانی نیە ، لە زەمانی سـولتان مراد خانەوە دەرگاکەی گیراوە ، من لە کونێکەوە بە گوریس خـۆم شـۆڕ کردەوە و زیارەتم کردن و شیعرێکیشم بۆ نوسین •

وشك هەڵاتوەکانی ئەخلات لـە رۆم و عەجەمدا ناوبانـگی هەیە ، هەرچەندە ئەم جۆرە تەرمانە لە شوێنی دیکەش هەن ، بەڵام ئەمانەی ئێرە بە پرچ و ڕیشەوە باشتر ماون •

**باسەکانی دیکەی شاری ئەخلات :**

کێوەکانی ئێرە پڕن لە ( کان )ی جۆربەجۆر ، لەوانە کانی (زەڕنیقی سور ) کە لەگەڵ سابون تیکەڵ بکرێ و پیاو لە خۆی هەڵسوێ یەك داوە موی بە لەشـەوە نامێنێ و وەکو لۆکە نەرمی دەکاتەوە • ئەوانەی توشی نەخۆشی گولی دەبن ، وەندەی نیسکێکی لەگەڵ ترێی ڕەش بخۆن لـە نەخوشیەکانی بەلەکی و فەڕەنـگی و گولی و گەڕی رزگاریان دەبێ • (کان)ی (زەڕنیقی زەرد) کە لـە کێوەکانی ئەخلاتدا هەیە گلێکی زەردی

قورس وەکو گلەسەر وایە کە بۆ (رۆم)و (عەجەم)و (فەرەنگستان) دەڕوا ، گوایا کیمیاگەران تێکەڵ بە مسی دەکەن و چەند شتی دیکەشی داوێنە سەر دەبێتە زێڕ ، ئەگەر لەم شتە تیو مسـقاڵ لە فنجانێکدا بتوێندرێتـەوە و کاتیتوستن بخورێتەوە هەرچی متوی بێکەلکی لەش هەیە هەڵدەوەرێ و لەش سوك و سپی دەکا ، بەڵام زیادەڕەوی کردنی خراپە •

لە دوای گەڕان بە قەڵای ئێرەدا ماڵاوایيم لە قەڵادار و ئەوانی دیـکە کرد و هەر بە قەراخی دەریادا بەرەو خۆرهەڵات هاتینە قەڵای (عادلجەواز) • لێرە بە خزمەت مەلیك ئەحمەد پاشا گەیشتمەوە و نامەی خـانی بتـلیس عەبدالخانم دایە ، خوێندیەوە و گوتی « لە خۆیەوە دەڵێ ، هە خوا دەزانێ چی دەبێ ، » خان لەو نامەیەدا نوسیبوی « گەورەم ، لە کاتێکدا تۆ پـێ دەخەیتە قەڵای وانەوە ، خەبەرێکی خۆشت لە ئەستەمۆڵەوە پێدەگا کە پێی شاد دەبێ ، وا دیارە (ئیبشیر پاشا) خراپی لێ قەوماوە و بەم زوانە خەبەری کوژرانیت بۆ دێ ، بێگومان لەگەڵ چوێتە وان ماڵ و پارەیێکی زۆرت دەست دەکەوێ ، لە دوعای خێر فەرامۆشمان مەکەن • » پاشا نامەکەی هەڵگرت و هەواڵی کوڕەکانی خانی بە دورودرێژی لێ پرسیم ، منیش ئەوەی دەمزانی پێم ڕاگەیاند •

پاشان ڕۆیشتم بۆ تەماشای شار •

**قەڵای عادلجەواز :**

بنیاتنەری ئێرە لە شایەکانی ئازەربایجان ( تاجدین عالیشانە ) ، پاشـان دەستاودەستی کردوە و لە ساڵی ٩٤٠دا عەجەمەکانی ناو قەڵا نەیـانتوانی خۆ لەبەر زەبرو زەنگی عوسمانی ڕابگرن ، کلیلەکانی قەڵایان هێنایە خزمـەت ستولەیمانخان • یەکەمین فەرمانڕەوای ئێرە ( زاڵ پاشا)بوە •

قەڵاکە بە بەردی تاشراو لە سەر یەکپارچە زەرد و ماهی قەراخ دەریا

دروستکراوە و زۆر قایمە ، لە خوارەوە بە پێ بە نیو سەعات دەگاتە سەرێ ، دەریای وان کە خۆرهەلات و باکوری قەلای دەورە داوە لەم سەرەوە وەکو خلیجێکی بچوك دێتە بەرچاو، کاتی نیوەڕۆیان نەبێ هەمیشە تەوقەسەرەکەی لەناو هەورایە و نابیندرێ • قەلای ناوەوە خەرەندی نی‌یە و بۆشی ناکرێ چونکو دەورەکەی رەوەزێکە هێلانە هەلۆ و شەهێنە و نینۆکی لێ گیر نابێ • سی و هەشت دانە قوللەی قایمی هەیە ، دەروازە ئاسنەکەی سێ دەرگای یەك لەدوی یەکە •

لە ناو قەلادا حەفتا مالی بێ باخ و باخچە هەیە هەموی بە قوڕ سواخ دراون • مزگەوت و جبەخانە و عەمباری دەخل و عەمباراو و قوللەی تەویلەخانە و مالی قەلاداری لی‌یە • تۆپی گەورەی بالیومزی تیدایە ، خانوبەرەی گەورەی تیە ، درێژایی چواردەوری چوار هەزار شەقاوە ، هەر چەندە هێلکەیی دروستراوە بەلام بەرەو باکور درێژ بۆتەوە ، لەبەر ئەوەی لە لای باکورەوە لە کێوە بلندە دورەکانەوە حەوالەی تۆپی بە سەرەوەیە وا درێژکۆلە کراوە ، ڕێشی تێ ناچێ لەو حەوالەیەوە زیان بە قەلا بگا ، چونکو هەر تۆپێك لەوێرا بگیرێتە قەلا راستەوخۆ دەکەوێتە دەریاوە •

لەخوار قەلاشەوە وارش هەیە کە لەسەر بەردەکانی چیا داندراوە ، بەلام شوێنەکەی گردۆلکەیێکی نزمە، لایێکی لەسەر بەردی قەراخ دەریایە و سێ دەروازەی هەیە . دەروازەی ئەخلات ڕوی لە باشورە ، دەروازەی خۆرهەلات روی لە ئەرجیشە • ئەم قەلایەی خوارەوەش بە بەردی گەورە داندراوە و چوارگۆشەیە ، لای باکوری هەرچەندە لەسەر بەردە بەرزەکانە، دیسان دەروازەیێکی ( ئورغون )ی تایبەتی پێوەیە کە هەمیشە قەپاتە ، درێژایی چواردەوری ئەم دارشە شەش هەزار شەقاوە • ئەو لایەی ڕوی لە لەنگەرگایە تۆپی ئەوەندە زلی لێ داندراوە کە زەلام بە لولەکەیەوە دەچێ ، بە هەمویەوە حەفتاو شەش تۆپی شاهانە و بالیومزی هەیە • لەم قەلایەدا

سێسەد خانوییکی قوزی بێ باخ و باخچە هەیە • عەجەم چەند جارێك ئێرەیان گەمارۆ داوە و بە هەناسە ساردێ گەڕاونەوە • ئەشکەوتی ناو چیاکان جێ‌بۆسەی چاکە • ئەو لای قەلا ، شیو و سەر چیاکان هەموی باخ و باخاتە و بە هۆی ئاو و هەوای سازگارەوە داتیشتوانی لەشساخن • لای قیبلەی دەریای وانە ، بە هەموییەوە هەزار و سەد ماڵێك دەبن •

هەشت گەڕەك و حەوت میحرابی هەیە ، مزگەوتی زاڵ پاشای بە ناوبانگە ، گەرماوی زاڵ پاشا کە لە دەرەوەی قەلادایە زۆر خۆش نیە ، گەرماوێکی دیکەشی هەیە وێرانەیە ، حەفتا گەرماوی ئاغاکانیش هەیە ، ناو قەلا خانێکی لێیە بەلام زێڕنگەرخانەی تیە ، بازاڕێکی بچوکی هەیە پڕ لە کوتاڵە، هەمو چەشنە کە لۆپەلێکی تێدا دەست دەکەوێ ، حەوت هەزار باخی هەیە ، بەری خۆرهەلاتی شار ئاوێکی خۆش و باخچەی بە حەوز و پلوسکی هەیە و سەیرانگای خەلکە ، باخ و سەیرانگای زاڵ پاشا بەناوبانگە •

بەڕێوەبەرایەتی قەلا :

ئێرە پاتەختی بەگی سنجاق و سەر بە ئەیالەتی وانە ، بە پێی قانونی سولەیمانخان خاسەی میری ( ١٥٤٠٣٦ ) ئاقچەیە ، سالانە شەش هەزار قرۆش دەسکەوتی بەگە و بە شەسسەد کەسەوە دەچێتە شەڕ ، بەگی ئالاو سەرۆکی چەری هەیە ، بە جیە لەبەرەکاتیەوە هەزار عەسکەری هەیە کە لەگەڵ بەگدا دەچن بۆ شەڕ ، قەزاکەی سەد و پەنجا ئاقچەیی‌یە و سالانە قازیەکەی هەزار قرۆشی دەست دەکەوێ ، مفتی و نەقیب و نایب و دارۆخە و میراو و شابەندەر و ئەمینداری گومرگی هەیە ، قەلادار فەرماندەیە و نەفەرەکانی هەمیشە ئامادەن • کوێخای سوپا و فەرماندەی یەنیچەری نیە • چونکو لە (وان) نزیکە جار بەجار ئاغای یەنیچەری چاوەشێك دەنێرێ بۆ تەمێ کردنی یەنیچەریە تاوانبارەکان •

سالی ١٠٣١ ئەم قەلایە شەش قاوش یەنیچەری بۆ پاسەوانی دەروازە و دوو قاوش تۆپچی و قاوشێك پاسەوانی بوە ، بەلام ئێستا ئەوەندەی تۆپی بالیومز و جبەخانەی بێ ژمارە تێدایە بۆتە داخی سەر دلی عەجەمەکان ٠

**زیارەتگاکانی عادلجەواز :**

کوڕی زال پاشا فەرماندەی ئێرە بوە ، شەوێك لە ناکاو هەشت هەزار پیاوی شای عەجەم خۆیان دەگەیێننە ناو باخەکانی ئێرە و بۆسە دادەنێن ، کوڕی زال پاشا پێدەزانێ بە حەفتا کەسەوە هەلدەکوتێتە سەریان و بە جۆرێکیان دەشکێنێ کە لەو هەشت هەزار کەسە بە حالەحال پەنجایان لێ دەردەچێ ، لەمانیش یەکێك شەهید دەکرێ ، عەجەمەکان لە داخی ئەم روزەردیە شەبەیخونێك دەکەن کوڕی زال پاشا شەهید دەکرێ ، قسنەکەی لێرەیە ٠

زیارەتگای چلان هەیە ، گوایا چل برا بە یەك زگ و بە یەکجار هاتونەتە دنیاوە ٠

**چیای سوبحان :**

لە باکوری (عادلجەواز)دا کێوێکی بلندی سەر لە ئاسمان هەیە بە ناوی (چیای سوبحان) ٠ بە قسەی (مەجستی) کە (پەتلیموسی زانا) دایناوە لە دنیادا سەدو چل و هەشت کێوی گەورە هەیە کە ئەمە یەکێکە لەوان ، هەمو سالێ (توورکمان) و (کوردەکانی) (خالتی) و (چەکوانی) و (زازا) و (لۆلۆ)و (زێباری)و (پسانی)و (گەرگەری) بە سەد هەزاران سەر مەڕەوە بۆ هاوینەهەوار دەچنە سەر ئەم چیایە ٠ ئەو ئاژەلانەی لێرە دەلەوەڕێن زوربەیان جمکە دەزێن ٠

سەیر لەوەدایە کە پیرەپیاوەکانی ئێرە پێیان گوتم لەم نزیکانە ژنێك

بە یەك زگ حەوت منداڵی بوە ، من نەچوە ئەقڵمەوە چونكو تا ئێستا شتیوا ڕوی نەداوەو بە درۆم خستنەوە ، سێ کەس لەو ریش سپییانە بە نـاوی کوڕی ساوریێ و کوڕی دزدار و کوڕی مەیمەندیێ لەگەڵم هاتنە مەحکەمە ، قرۆشێکیان دا بە قازیێ (حامید ئەفەندیێ) و داوای دەفتەری زەمانی ( زاڵ پاشا )یان کرد ، قازیێ ناردی ئەو دەفتەرەیان لە خەزێنەی قەڵا هێنایە دەر و تەماشامان کرد ، نوسرا بو « لەم سەردەمەدا لە کوێستانی ( چیای سوبحان ) ژنی کابرایێکی تورکمان کە ناوی (موول سجاه)ە لە پاش نۆ مانگ و دە ڕۆژ زگپڕیێ لە سەعاتێکدا چل دانە منداڵی بوە بیستیان کوڕ و بیستیان کیـژ بوَن ، لەبەر ئەوەی ( زاڵ پاشا ) خەبەری ئەم ڕوداوەی بـە سولەیمانخـان ڕاگەیاندوە ، وا لێرەدا نوسیمان • ساڵی ۹٤۳ • » جا منێك بڕوام بە بوَنـی حەوت منداڵ بەزگێك نەدەکرد ، ئێستا دەبێ بڕوا بە چل منـداڵ بـکەم ! ئەمەش لە خاسیەتی چیای سوبحانە •

لەم چیایەدا گورگ و کەمتیار و ورچ و ڕێویێ و چـەقەڵ و پڵنـگ و هەمو جۆرە دڕندەیێك هەیە و هەرچەندە لێرە جوت بگرن قەت بێچوَیـان نابێ • لەسەر ئەم چیایە گورگ و مەڕ پێکەوە دەگەڕێن و توَکێك لە کەوڵی مەڕەکە لار نابێتەوە ، لەبەر ئەوە لەم چیایەدا زۆر پێویستیان بـە شـوان نییە • گوڵە سەگی وایان هەیە بەقەد کەرە بەغدایییێـك زلـە ، مەلـە گوَشتخۆرەکان ئەگەر هێلانە بکەن بێچو هەڵناهێنن بۆیە لێی نیشتەجـێ نابن • بەڵام داڵی زورە ، ئەو داڵانە هێوایان تێدایە تەمەنی دەگاتە هەزار ساڵ • مریشکی ئێرە زۆریان ڕۆژی دو جار هێلکە دەکەن •

لە نێوانی ئەخلات و چیای سوبحاندا تەماشاگایێکی زۆر بەسام هەیە (کانی چیمەن)ی پێدەڵێن ، ئەو کانیە لەناو بەردان دێتە دەر و بەسەر تاتـە بەردانداهەڵدەڕژێتە خوارێ ، گرمژنێکی لێ دێ گوێچکەی پیاو کەڕ دەکا و دەنگی لە دو فرسەق دورەوە دەبیسترێ ٠ ئاوی ئـەم کانیە دەچێتـە نـاو

خلیجێکەوە و بزر دەبێ ، ئاوەکەی لە ژەهری هەلاهیل تاڵترە و هەر ئادەمزاد یا ئاژەڵ و مەلێك لێی بخواتەوە دەزبەجێ دەمرێ . (حاجی جارولّلا) ناو کە بازرگانێکی خێرەومەندە حەشارێکی گەورەی لە دەوری ئەم ئاوە کردوە، قەراخی کانیەکە هیچ گیای لێ سەوز نابێ .

لە باکوری خۆرهەلاتی ئەم چیایە گۆمێکی گەورە هەیە هەوارچیەکان مەلەی تێدا دەکەن ، ئاوەکەی زەرنیقی تێدایە و زۆر گەرمە ، بەر هەر کوێ یێکی لەش بکەوێ مۆی هەڵدەوەرێ بەلام بۆ ژنان زۆر بەکەڵکە ، ئەوانەی خورقیان لە لەشدا بێ قوڕی ئەم ئاوە لە خۆیان هەڵدەسون چاك دەبنەوە .

دیسان لە نزیك باکوری قەلای (عادلجەواز) لە داوێنی (چیای سوبحان) ئاوێکی سوێر دێتە دەر لە رۆنیدا دەڵێی چاوی قرژاڵە ، ئەملاولای ئەو کانیە ئاوەکەی بوە بە کانە بەرد ، وەستاکان دێن دەیبڕن و دەیبەنەوە ، هەندێ وەستا بە پێی پێداویسی خۆیان سندوقی دار دروست دەکەن و لە ئاوی ئەم گەڕاوە پڕی دەکەن و کەمێك خوێی تێکەڵ دەکەن بە کاری خوا ئەو ئاوە دەیبەستێ و دەبێتە بەرد ، بەلام بەردەکەی زۆر سەخت نیە ، بۆ دەرگا یا بەردی کوچکە ئاگر یا جێ پێی پلەکان و ئەمجۆرە شتانە بە ئەندازەی پێویست قالبی دار یا قوڕ دروست دەکەن و لەم ئاوەی تێدەکەن کە بەردەکەی تەواو بەستی و ڕەق بێ بە کاری دێنن .

دوای ئەوەی لە تەماشای عادلجەواز بۆینەوە ، کەوتینە رێ ، نۆ سەعات بە قەراخ دەریادا ڕۆیشتین هاتینە گوندی بەردە کون (دەلێك داش) ، دوو سەد ماڵێکە لە رۆخی دەریا ، لەوێشەوە هاتینە گوندی (دەمیرچی) ، کەمێك لە دەریا دورە و سێسەد ماڵێکی مەسیحیە ، لە خاکی قەلای ئەرجیشدایە ، دانیشتوانی هەمو ئاسنگەرن ، لێرەوە هاتینە گوندی (کەنزەك) کە دو سەد

ماڵ دەبێ لە خاکی ئەرجیشدا و ئاوەدانە • لێرە لە نزیك بارەگای پاشا حەوت دزیـان گرت و هەر لـەوێ سەریـان بڕین • کە لێرە بارمـان کرد بەرەو خۆرهەڵات هاتینە قەڵای ( ئەرجیش ) •

ئەم شوێنە لە کۆنەوە دەستاودەستی کردوە تـا لە ساڵی ٥٢١دا کەوتە دەست(قلیج ئەرسەلان شا ) ، قەڵایێکی لێ دروست کرد و ئاوەدانتری کرد ، پاشان گەیشتە دەستی (قەرە وێسف شای قەرەقۆینلو) کە چاکی ئـاوەدان کردبۆوە ، بەڵام کە تەیمور هات بە جارێك کاولی کرد • سـاڵی ٩٥٥ کـە سولەیمانخان لە وڵاتی عەجەم گەڕایـەوە ئێرەی لە دەسـتی عەجـەمەکان هێنایەدەر •

پاتەختی بەگی سنجاقە ، خاسەی میری (٣٠٠٠٠٠) ئاقچەیە ، بەگەکەی ساڵانە دە کیسەی پێ دەبڕێ و بە هەزار عەسکەرەوە حکومەت دەکا ، ٨٦ تیمار و ١٤ زەعامەتی هەیە ، بەگی ئاڵا و گەورەی چەرێ و ویزباشێ هەیە ، بە پێی قانون بە جبەلەبەرەکانیەوە هەزار کەس پڕ چەك و شـەڕکەر لـە ئەرجیشدا ئامادەن کە لەگەڵ بەگدا بچن بۆ شەڕ •

کە مەلیك ئەحمەد پاشا چوە (ئەرجیش) ، بەگەکەیان (فەرهـاد بەگ) بە هێزی قەڵا و سوپای خۆیەوە شەشهەزار عەسکەری هەڵبژاردەی بـۆ پێشواز هێنابۆ کە بریقەی چەکەکانیان ئاوی چاوی دەبرد ، کاتێ نزیـکی قەڵا بۆینەوە لە ناو قەڵا دەنگی ئەڵڵا ئەڵڵا هەستا و لە بورج و قوللەکانـی قەڵاوە بە هەزاران تفەنگ تەقێنرا ، هێشتا خرمەی ئەو دەزرێژانە نەبڕابۆوە کە گرمەی تۆپی بالیومز دنیای لەراندەوە و ئەو ناوە پڕ بو لە دوکەڵ ، بـە نزیك بونەوەی پاشا تۆپچیەکانی قەڵا بۆ دەرخستنی شارەزایێ خۆیـان چەند گوللەی تۆپی بالیومزیان بەسەر دەریادا خل کردەوە کە ئەو گوللانە هەتا ماوەیێك بەسەر ئاودا بە خشکەیێ دەڕۆیتن•پاشا لە میوانخانە دابەزێ و

فەرمانی سێ ڕۆژ حەسانەوەی دا ، منیش دەستم کرد بە گەڕان و تەماشای قــەڵا •

**دیمەنی قەڵای ئەرجیــش :**

قەڵایێکی چوارگۆشەی گەورەیە لەســەر گردۆڵکەیێــکی نزم لــە گوێ‌دەریای واندا، بەردەکانی یەکی ئەوەندەی فیلێکن ، قــەڵاکە ســپێ بێگەردە ،قوللەی چوارقولنجکەکانی زۆر قایمن ، لەبەر ئەوەی حەواڵەی بە سەرەوە نیە دیوارەکانی بڵند نەکراون و لە جیاتی ئەوە ئەوەندەیان پان کردوون جلیتێنیان لەسەر دەکرێ ، خەرەندی نیە ، هەندێ ساڵ دەریا هەڵدەســتێ حــەوت هەشــت مــانگ ئەم قەڵایــە لەنــاو ئــاودا دەمێنێتــەوە • دوو دەروازەی هەیە یەکیان ڕوی لــە خۆراوایــە کە دەروازەی عادلجــەوازی پێ‌دەڵێن و ئەوە دەروازە گەورەکەیانە •

ناو قەڵا هەزار خانوێکی قوڕینی هەیە ، مزگەوتی سولەیمانخان کــە کۆنە مزگەوتی وێسف پاشا بوە و تازەکراوەتەوە ، شێوەی کۆنە و منارەیێکی هەیە • دوسەد دوکانی لێ‌یە ، جبەخانەی زۆرە ، تەنانەت سەد و دە پارچــە تۆپی تێدایە کە لە تۆپەکانی قەڵای عادلجەواز جوانترن ، تۆپ هاوێژێك بــە لای باکوردا کێوی (ئالا داخ) هەیە کە باخچەی زۆر خۆشی لێ کــراوە • هاوینی ئێرە گەرمە و دانیشتوانی قەڵا شەش مانگ لە باخچەکانی ئالاداخدا ڕادەبوێرن •

**حکومەتی قــەڵا :**

بەگی ئەم قەڵایە بەگی ئالا و فەرماندەی گەورەیە ، قەزاکەی سەدو پەنجا ئاقچەیێ‌یە ، میراو و باجگر و کوێخای شاری هەیە • لەناو قەڵادا قەڵاداری یەنیچەری کە لە ئەستەمۆڵەوە داندراوە سێسەد کەس و چوار بلۆك نەفەری هەیــە •

لەبەر ئەوەی سنوری عەجەمە ، ئەگەر قەڵادار تۆپ هـاوێژێك لـە پردی ئەرجیش بەولاوەتر بڕوا ، فەرماندە خەبەر بە پاشای وان دەدا و دەڵێ قەڵادار قەڵای بەجێ هێشتوە دەزبەجێ لەسـەر کار لادەبـرێ • لایێـکی دوژگەیە ، بەندەرەکەی لەنگەرگاییکی جوانی هەیە بۆ کەشتییەکانی وان کە ماڵ و شتومەکی بازرگانێ لێ بار دەکەن و لێرەوە هەتا ئەرزەڕۆم دەچن •

دانیشتوانی قەڵا هەمویان (بۆشناق) و (ئەرنەووتن) و موسڵمانن ، لـە سەردەمی سولەیمان خاندا هێنراونە ئێرە ، لەناو خۆیاندا مەلایان هەیـە ، کورد و عەلۆ و جەلوی نەناسراو رێگا نادەن بچێتە ناویان هەمو خزم و کەسی یـەکترین •

**گەڕاوی قەڵای ئەرجیش :**

لای باکوری (ئەرجیش) لەسەر رێی (ئەرزەڕۆم) گەڕاوێـك هەیە ، هەمو ساڵێ هاوینان (لە کاتی گەیشتنی کولەکەدا لە شارەکانی وان و بتلیس و ئەخلات و هەمو کوردستانەوە بە هـەزاران کەس خێـوەت و خـواردن و خواردنەوەیان دێنن و سێ مانگی تەواو لێرە رادەبوێرن و بەم ئاوی گەڕاوە خۆیان دەبۆژێننەوە ، لە نزیك ئەم گەڕاوە شوێنەواری بینای زۆر گەورە هەیە کە گوایا ئەسکەندەر کردونی ، ئاوی گەڕاوەکە ئاشـگێرێکە •

کەمێك لەولاتر ( کانێ خانان ) هەیـە ، لەنـاو بەردانەوە ئەوەنـدەی فیچقەییك ئاو هەڵدەدا و دەڕژێتەوە ناو حەوزێکی دە بە دە ، ئاوەکەی رونە بەڵام زۆر گەرم نیە چونکو گومبەزی لەسەر نەکراوە •

(کانێ‌شێر)یش هەیە کە وەستای بەردتاش سەلکە شێرێکی تاشیـوە ئاو لە دەمی ئەو شێرە هەڵدەڕژێتە حەوزێکەوە ، بەڵام پەنا بەخوا ئاوەکـەی ئەوەندە گەرمە لەناو حەوزەکەدا وەکو مەنجەڵی سەر ئاگردان قوڵپ دەدا ، سەروپێ دێنن بەم ئاوە ئاوەڕۆتی دەکەن، بە کاری خوا سێ هەنگاو بەولاوەتر

له کونی بەردێــکەوە ئاوێــك دێتــە دەر ئەوەندە سارده له هاوینـا کەس ناتوانێ دەستی تێخا • ئەم ناوچەیە کەوتۆتە دەرەجە هەژدەی ئیقلیمی عرقیه و هەوای زۆر سازگارە •

له زیارەتگاکانی ئێرە قسنی (سولتان قەرە ویسـف بای) هەیـە که پیاوێکی خوایی بوه •

لەگەڵ پاشا ئێرەمان بەجێهێشت و به قەراخ دەریادا هاتین ، له ( قەرە کۆپرێ) قۆناخمان گرت ، پردێکی قایم و باشه بەڵام نەمزانی کێ کردویەتی، ئاوی (ئاقسو) به ژێریدا دەڕوا ، ئەم ئاوە له (چیای سوبحان) و ئالاداخەوە دێته خوار و دەڕژێته دەریای وانەوە ، قەراخی ئەم ئاوە (یازلق)ی پێدەڵێن حەسیری باشی هەیه • له نزیك ئەم پردە (پازاڕ کۆیێ) هەیه سێسەد ماڵێکی مەسیحی لێیه هەمویان کاریان حەسیر چنینه ، ئەم گوندە سەر به هێـزی وانــه •

لێرەوە ڕێ به خۆرهەڵات دیسان به نــاو ســازلق و زەلــکاودا کــه شوێنێکی به ترسه هاتین گەیشتینه روباری بەندی ماسێ که لــه کێــوەکانی بارگرەوە دێ و به بن قەڵای بارگردا تێدەپەڕێ ، پێشتر باسمــان کرد که ئێرە ساڵی جارێك راوە ماسێ لێ دەکرێ •

دەڕۆیشتین که له بەرامبەرمانەوە (قەڵای بارگر) دەرکەوت ، فەرماندەی هێزەکان و سنجاقی ئێرە (شەرەف خانی مەحمودی) به پێنج هەزار جبەلەبەر و چــەك هەڵگرەوە و به سوپــای پڕ لــه سیلاحەوە گەیشتە پێشوازی پاشا، دابەزێ و ڕکێفی پاشای ماچکرد و تا ماوەیێك به پێ لەگەڵی ڕۆیشت ، دوایێ به فەرمانی پاشا بەبێ ئاوزەنگی سوار بۆوە و هاتینه (قەڵای بارگر) • لــه قەڵاوە چل پەنجا تۆپ و چەند هەزار فیشەك هاوێژرا و کرا به شادێ ، پاشا چوە ناو سەراپەردەی خۆی ، پاشان بەگ بانگهێشتنی بــۆ کرد و دیــارێ چاکی پێشکێش کرد و کرا به دیوان •

**قەلای بارگر :**

دۆلێکی درێژ کە ئەوسەری بۆتە خلیج ناوی بەندی ماسیێە ، جا لە خۆرهەلاتی ئەو بەندە و لە سەر بەردە ڕەشەکانی ئەو چیایە قەلاییێکی پێنج سوچی بەرز بە بەردی گەورە دروستکراوە ، ئەم قەلایە بە دەست کوردەکانی مەحمودییەوەیە ، نەفەرەکانی هەمو کوردن ، خاسەی میریەکەی (۲۰۰۰۰۰) ئاقچەیە ، ۹۷ تیمار و ۷ زەعامەتی هەیە ، بەگی ئالا و سەرۆکی چەری هەیە ، لەکاتی شەڕدا سێهەزار عەسکەر کۆ دەکاتەوە ، قەزاکەی سەد و پەنجا ئاقچەیە ، باجگر و میراوی هەیە • هۆی ئەم ناوەی قەلا ئەوەیە کە (قلیج ئەرسەلان) کاتێ ئێرەی بنیات نا ، لەم شوێنەدا باج و بارانەی لە کاروانێ و بازرگانەکان دەستاند، کوردەکان ناویان لێ نا قەلای بارگری•

خەلکی ئێرە هەمویان کوردی ئازان و لە قارەمانەکانی هۆزی مەحمودین ، ئەسپی کەهێلەی ڕەسەنی پاشودرێژی پشت کورتی شان گاجوتی مل مامزی قەلەو و ڕێکوپێکسەلێرە هەیە لە هەمو کوردستاندا وێنەی دەست ناکەوێ •

سەرای شەرەف خان و گەرماو و خانێك و باخ و بێستان و بەشی خۆی دوکانی هەیە ، ئاو و هەوای سازگار و ترێکەی خۆشە • ئەم قەلایە بە خاکی ئازەربایجان دەژمێردرێ • سالی ۹۵۵ کە کوردەکانی ناو قەلا سەریان بۆ سولتان سولەیمان دانەواند و قەلایان دا بەدەستەوە ، فەرمانڕەوایەتی درایەوە بە خۆیان •بەگی ئێرە لە مەحمودییەکانە •

لەم قەلایەوە بەرەو قبیلە هاتین ، هەوارگەی ( حەسەن تاپدی)مان خستە لای چەپ کە هەمو کوردەکانی مەحمودی هاوینان دێنە ئێرە ، پێی هەلگەڕام چومە قوچی سەرێ دەبینم کوێستانێکە سەری لە ئاسمانە ، کە لەم چیایە تێپەڕیت ڕێگا دەبێتە دو ، ڕێگای دەستە چەپ بۆ قەلای (وان)

دەچێ و ڕێگای لای ڕاست دەچێتە قەڵای ( ئامێق ) • لێرە بڕوینــە میوانی گوندی (پاس) لە دامێنی چیای چۆماخلی دا ، هەرێمی وانە و سەد ماڵێــك دەبێ ، گوندێکی ئاوەدان و بە باخ و باخچەیە ، من ئیزنم لە پاشا وەرگرت و چوٗم بۆ قەڵای (ئامیق) • گوندە ئاوەدانەکانی لای قیبلەم بەجێ هێشــت و بە ناو بەردەڵان و بە قەراخ دەریادا بە چوار سەعات گەیشتم •

**قەڵای ئــامیق :**

بە قسەی مێژوونوسان ، ئێرە نەتەوەی (عاد) بنیاتیان ناوە ، بەردەکانی ئێرە و وەکوو عەقیقی یەمەن سوورن • قەڵا لە قەراخی دەریا لەسەر یەك کۆڵەکە بەردی خوایی دروست‌کراوە کە ئەوەندەی پێنج منارەی سلەیمانی بەرزە ، خوا دەیزانێ زاتم نەکرد سەرکەومە ئەو ئاسمانە بچم تەماشای بکەم ، چونکو دەبێ بە چەند هەزار پلەکانی بەردا سەرکەوی تا دەگەیتە ئەو پەیژە دارانەی بە بەردەکانیانەوە ناون و پاشان دیسان پلەکانی بەردی‌دیکە ••• لە کاتــی شەڕدا پەیژەدارەکان بە گوریس هەڵدەکێشنە سەرەوە و ئیدی لــە هیــچ لایێکەوە ماوەی پێ‌هەڵگەڕانی نامێنێ ، لە هیچ شوێنێکەوە حەواڵەی بــە سەرەوە نیە ، لایەکانی قیبلە و باشوور و خۆراوای دەریای وانە و ئەم بەردە وەکو سنگێك لەم ناو ئاوە سەری هەڵداوە ، شتێکی سەیرە •

لە هەموی خۆشتر لە تەوقە سەری ئەم بەردە قوچە کانیلەیێك هەیــە ئاوە زیادی‌یەکەی بە لاقەدی بەردەکە دا دێتە خوار ، لەناو قەڵادا مزگەوتێك و پەنجا خانوی لێ‌یە ، لە عەمبارەکانیدا گەنمە شامی و چەڵتوك و شەش توٗپی شاهانە هەیە • قەڵایێکی زۆر سەختە ئەگەر لە ناو خۆیدا ئازوقە و ئاوی بێ لە گرتن نایێ، من تەنیا یەك قەڵای لەم بابەتەم دیوە : لە وڵاتی (ئەدەنە) ، سنجاقی (سلفکە) لە نزیك (لارندە) ، قەڵای (ئەرمەناك) ، ئەویش شیاوی بینینە بەڵام ئەم قەڵای ئامیقە لەو سەخت‌تر و بێ‌حەواڵەترە •

سالی ٨٠٥ تەیمور هاتۆتە سەر ئەم قەڵایـە کە دیویەتی گوتویـەتی «ئەم قەڵا پیسە گەلێك شا وخوێنکاری بەدناو کردوە و ئابڕوی بردون ، من حەیای خۆمی لەگەڵ نابەم» و بەبێ خۆ تێگەیاندن بەجێی هێشتوە • دەریای وان لە بەردەمی ئەم قەڵایەدا ئەوەندە قوڵە ، گوریسی چەند سـەد جوتـە باڵیان بۆ شۆڕ کردۆتەوە نەگەیشتۆتە بنی ، بۆیە پێیان گوتوە (عەمیق) و کوردەکان بە هەڵە کردویانە بە ئامیق ، جار جارە (ئامۆك)یش دەڵێن •

لە درز و کونە بەردەکانی ئێرەدا بە هەزاران شەهێن و هەڵۆ و خەرتەل هێلانەیان کردوە • جارێك قەساب لە خوارەوە گامێشێك سـەر دەبڕن و خەریکی کەوڵکردنی دەبن ، هەڵۆیێك لە هەواوە لوول دەبێتـە سـەلکی گامێشەکە کە لەو ناوەدا کەوتوە هەڵیدەگرێت و دەیباتـەوە هێلانـەکەی خۆی دەرخواردی بێچوەکانی دەدا • تا ئێستا ئێسکی ئەو سەلکە وەکـو سندوقێکی سپی لە بەردەمی ئەو هێلانەیەدا دیارە ! ئەمـە ئەوەمـان پـێ دەسەلمێنێ کە هێزی هەڵۆ بە ئەندازەیێکە سەلکە گامێشی سەد هۆقەیی بـۆ هەڵدەگیرێ •

ئەم قەڵایە لە سەردەمی سولەیمانخاندا بە دەستی (رۆستـەم پاشـا) گیراوە، ئەمڕۆ ویوادەیی‌یە و هی پاشای وانە ، قازی وان نایبەتی ئێرە دەکا ، قەڵادار و پەنجا نەفەرێکی هەیە• لە وارشی خوارەوەدا سەد خانوێکی قوڕی بە باخ و باخچەی هەیە ، مزگەوت و خان و گەرماوێك و بازارێکی بچوکی لێیە •

پاش تەماشاکردنی قەڵا رێکەوتین بەرەو خۆرهەڵات ، لە کن گونـدی (جانکلەر) لە روباری (جانك) پەڕینەوە و پاشان لە ئاوی (سوارچلی)شمان دا هاتینە گوندی (ئابلان) ، لێرە لەگەڵ پاشا یەکدیگیر بوینەوە ، باسی قـەڵای ئامیقم بۆ گێڕایەوە ، بە بێ چاوپێکەوتن واقی وڕما و ئەوانەی لەوێ بـون شایەدی قسەکەیان دام •

لێرەڕا هاتینە گوندی (قەرە قاسم) کە سەد ماڵێکە لەناو مێرگێکدا ، ئێرە سەکۆیێکی سوڵتان مراد خانی لێیە کە جێگا سەیرانیانە • مەلا قاسم ناوێك لەم گوندەدا تەکیەی دەروێشانی هەیە ، فێداران دێننە ئێرە بە حەوت ڕۆژ چاك دەبنەوە • ئەمجا بەرەو قیبلە هاتینە (چای باشی) و قۆناخمان گرت، گوندێکی سەد ماڵیی ئاوەدانە لە ناو چیمەنێکدایە و کەمێـك لە ڕوبـارەوە دوورە • ئەم ڕوبارە لە کێوی (چۆماقلی) و چیای (ئاق کیرپێ) دێتە خوار کە تۆپ هاوێژێك لە خۆرهەڵاتی واندایە و دەچێتەوە ناو دەریا •

پاشا لێرە وچانی گرت ، پیاوماقوڵ و گەورەکانی وان بـە خزمـەتی گەیشتن و ئەوەندەیان دیاریی بۆ هێنا باسی ناکرێ ، چونکو تا ئێستا یەکێکی وەکو مەلیك ئەحمەد پاشا کە مۆری لێ سەندرابێتەوە و [۱۷] دوو جار بووبێ بە قایمقام و وەزیرێکی زاوای سوڵتان بێ نەهاتۆتە وان ، جـگە لـەوەی وەزیرێکی ئەوەندە گەورە و پایەبەرزە هەتا بنقەڵای تەرجیلی دیاربەکریشی بە دەسـخەتی موبـارەکی سوڵتـان بۆ نوسراوە لەژێر فەرمـانیدا بێ ، سەردەرگاوانێك بۆ چاككردن و تازەکردنەوەی قەڵای وان نێررا •

خەڵکی وان بە جارێك زراویان ڕژا ، ئەو هەمو سوپای وانە تا دەگاتە (دیاربەکر) و (حەزۆ) و (بتلیس) لەگەڵ پێشوازکەران لەو ناوەدا هێقیـان کردبۆوە ، لە دەرکەوانە ناودارەکانی ئەستەمۆڵ (مستەفا ئاغا گوێزل) بـە خۆی و چل دەرکەوانەوە لێرە بوون ، ئەمانە خەزوری خسرەو پاشا (سولەیمان بەگ ) و (حوسێن ئاغا) و کوڕەکانیان هێنابو کە بە ناوی دوورخرانەوە لـە وانیان دابنێن • دەنگ بڵاو بۆوە کە فەرمانی کوشتنی سەدان پیاوی گەورە و

---

(۱۷) مۆروەرگرتن و مۆر لێ سەندرانەوە زاراوەی تایبەتی ڕژێمی عوسـمانیی بوە ، واتا دانران لە سەرەك وەزیریی یا لەسەر کار لابران مەبەسـت لە مۆر مۆری تایبەتی سولتانی عوسمانییە کە دەدرایە دەسـت سەدری ئەعزەم و ئـەویش چی بویسـتایە لە دسـتوور و فەرمانەکان بـە ناوی سوڵتانەوە دەری دەکرد .

ماقولی وان دەرچوە (١٨) ، بۆیە خەڵك لە ترسی گیانی خۆیـان ئـەم هەمـو دیاری‌یەیان هێنابو ، شتەکە ئەوەندە زۆر بو ئاغاو دەس و پێوەندەکانیشی تێر کرد ، فەرمان دەرچو کە بەیانی زو بچینە ناو شار .

**باسی ئالای سوپا :**

سەر لە بەیانی رۆژی دوشەمو دوامین رۆژی مانگی رەجەبی ساڵی ١٠٦٥ لە سەعاتێکی پیرۆزدا پاشای پایەبەرز بیسمیللای کرد و سـواری ئەسپـە رەسەنەکەی خۆی بو ، کوێخای چاوەشەکانی وان بە سێسـەد چـاوەشی چۆقەدارەوە تێکڕا هاواریان کرد « تەمەنت درێژ بێ و خوا دەوامی سوڵتـان بدا » ، کە پاشا کەوتە رێ هەشت قات تەپڵخانە لێدرا کە وەکو ترێشقەی هەور دەنگی دایەوە و دەریاش لەولاوە کەوتە شەپۆڵدان .

لەسەر دەستوری وەزیر لە پێشەوە هـەزار و پێنسـەد عەسـکەری سوارەی (تەتاری) چەتاڵ بە دەست بە سەدەف و سوات و قەمچی شـیداق بە دەستەوە ، کڵاو و شەپرتمەلەسەر یا تەپلەی چاڵمەیی و توغای و مێزەری مەنسوری‌یان بەستبو ، ئەمجا هەزار کەس عەسکەری (دەلی) و هـەزاری (کوکللی) کە تاجی کەوڵە سمۆرە و سـالحلی و قورقونـای و یەلـکەن و ئوراتوس و غازی پورچاوی و کوڕی ئەلیاس و بە هلولی و غازی میخالی و هەرومی و قاسمی بالمیلی چۆقەی قەراخ شینی بە ریشو و مانلفکەی عارەبی و تاجی بەکداشی‌یان لەسەربو و پەڕی سیمرخ و بالقچیل و دوڕنە و وشترمر و شەهین و زەغنوسیان لێدابو ، پێنسەد شەشسەد کەسێش قەپانچەی سمۆریان هەبو و هەندێکیان باڵی میسکی قەرتال و هەڵو و داڵ و قەرەقوشیـان لـە

---

(١٨) ئەم هەواڵە بە مەبەستی تۆقاندنی چەند کەسانێك بوە ، تا هەرچێکیان بۆ هەڵدەسوڕێ بە ناوی دیارییەوە بۆ پاشای بهێنن و ملی خۆیان لە شیری سەربڕ رزگارکەن .

پشتی خۆیان بەستبو ، لە جیاتی قۆسداتیجە گۆپالی وایان بە دەشەوە بــو کە تۆپزەکەیان بە زێڕ نەخش کرابو و ئەستورایی بە قەدەر باسکێك دەبو ، کەوڵی گورگ و ورچیان لەبەرکردبو و پارچەی هەرێری پێدا هاتبوە خوارێ• ئالای (دەلیەکان) سور و شین و هی(کوکللیەکان) زەرد و ئاڵ بو،هەندێك خۆیان لە قەتلاوی ئاسنی شین هەڵکێشابو پوتلوقلی و دەربەندلی و تـۆغولقالی و کلاو زرێ و سەرپەنا و کۆکستیلی قازی ئاسنیان لەبەرکردبو و تەنیا چاویان بە دەرەوە بو ، بوبون بە یەکپارچە ئاسنی بەسام و ترسێنەر ، سواری ئەسپی کوێت بون و مامزەیان لەپێ کردبو، لبادی بەخەنە سورکراویان کردبو بە بەرە و نەرمەزین ، تەنیشتیان مەتالی یانجقلی و خوتای بەحــری و تیژەی تەیموری بەدەست کەوڵی بەور و پڵنك لەبەردا و سواری ئەســپی کەهێلە ، بە رێکی تێپەڕیــن • لەناو ئەمانەدا پەنجا چاوەشی زرێ لەبەر کە کەمەرەی سێ هوقەیی زیویان بەستبو خەنجەر لەبەردا و پەڕی شاسواریان لەسەر چەقاندبو ، هەندێکی دی چەفتەی عەنقایان بەستبو گۆچانێکی زیوی دو هۆقەیی بە دەستەوە شەروالی قەدیفەی سورە رۆستەمــانی لە پێــدا و ئەسپەکانیان بە پارچەی والا و متومورو داپۆشیبو بە ئەڵلا ئەڵـــلا گوتــن عەسکەرەکانیان رێز دەکرد و بە ناویاندا دەگەڕان تێپەڕین • دوای ئەوان پێنسەد ئازوقەچی ، پێنسەد چاشنگیرچی ، پێنســـەد ســـەڕاج و خـــولامی تایبەتی ، پێنسەد مەیتەری خێوەت ، پێنسەد سارەوان ، پێنسەد خەربەندە ، پێنسەد قەرە قوللوقچی و عەکام و چراچی ، پێنسەد مەیتەر و خزمەتکاری دیکە • ئەمجا چل ئالاسەگەوان و چل ئالاساریجە بە چەکەوە و بە سواری و یەکی بە تفەنگێکی چل پەنجا درەمیەوە رۆیشتن ، دوای ئەوان هـــەزار و پێنسەد هەڕەمەی بە چەکەوە ، سێسەد سەر دەرگاوانی کەوڵی سمۆر لەبەر هاتـــن •

ئەمجار تۆغ و باغراغی پاشایان هێنا سێ ئەســـپی یەدەکی وێرخـــە و

هەشت یەدەكی بە زێنی گەوهەردار و زنجیری زێـڕەوە لـەگەڵ دەستـەی میراخوڕەكان و بە دوایاندا هەشتا بەیداخی سەگوان و ساریجەكان لەگەڵ چاوەشەكانیان و هەشتا بلوكباشێ و چاوەشی پڕ چەك ، لە دوای ئـەوان شاترەكانی پاشا كە ئابلاقی سپیـیان بەسەر تاسـكلاوە زێڕینەكەیاندا دابوو ئەتەكلغی كورت و كەنتوڕەیان لەبەردا و تەوەرزێـن بە دەسەوە جووت جووت وەكو تاوس لەنجەیـان دەكرد • پاشاش بە فێتزێـكەوە ئـەو سورغوجـە گەوهەردارەی سوڵتان دابویە و گوتبوی تۆ سەرداری هەرە مەزنی ، بـە لاییێكی كەللەیەوە نابو ، لە راست و چەپی مەتارەچیـیـەكان بە مەتـارەی زێڕەوە و تفەنگچی بە تفەنگی نقێمدارەوە ، لە پشت پاشـاوە سیلاحدار و چۆقەدار بە لبادەی سور و ئەسكوفەی زێڕدروەوە هاتن • بیست و دوو ئاغا و چوارسەد خولامی تایبەتێ كە هەندێك گورجی و زۆریان ئەبازەیێ بـون سەرپەناكانیان لەچكی سور وسەوز و ئاڵ و زەرد و رەنگی دیكەیان بەسەردا دابو ، كەوا محەمەدی‌یەكانیان بەلاداكردبو خشتی زیوی لەكەوڵ گیراو بـە دەستەوە بە سوارێ هاتن ، پاشان سەد مەیتەری تۆخماخ و تفەنگ بەدەست، جا (كوێخا وێسف ئاغا) و (جەعفەراغای خەزێنەدار) لەگەڵ سەد ئاغای پڕ چەكی ئێسك سوك و تۆ قات تەپڵخانە كە سنجاق و بەیداخیان لە راست و چەپ بو بە سێگالێدان تێپەڕین و دوایێ سەقاكان و هەندێ پینەدۆز و مەیتەر هـاتن •

لە راست و چەپی ئەم ئالا گەورەیە حەڤدە كەس بە كلاو زرێ و نوقمی ئاسن و بە شان و شكۆ سواری ئەسپی كەهێلە ڕمبی قەف قەف بە دەست و تفەنگ و دەمانچە بە قەدەوە خشت بەملاولادا هەڵواسراو بە تۆپز و غەدارە و بوزدۆغان و قوڵنگی فەرهادی‌یەوە و بە سوارێ بە تەنێشت یـەكەوە بـۆ سەلام راوەستابون • لە پێشەوە قۆڵی راست ، قۆڵی چەپ ، باشلێ ، داشلێ، حەسەنێ و حوسێنێ لەگەڵ بیست ئاغادا ، پاشان كوێخای خانی بتلیس بـە

هەزار عەسکەری هەڵبژاردەوە ، کوێخای خانی هەکاری بە پێنج هەزارەوە، (برایم بەگی مەحموودی) بە هەشت هەزارەوو • بەگی شیتروان بە هەزار کەسەوە بەگی مەکس بەگی کەسان بەگی بایەزید بەگی هێزان بەگی پنیانش بەگی پیرەدوس بەگی گەرگەر بەگی ئاغا کێس بەگی بەنی قەستیل بەگی سعرد بەگی کارنی بەگی هیروون بەگی زریقی بەگی موش بەگی عادلجەواز بەگی ئەرجیش و بەگی بارگر هەر یەکە بە کوێخا و هەزار کەسەوە هاتبوون بۆ سەلام ، بەگی چل و حەوت عەشیرەت بە عەسکەرەوە هاتبوون • تەنیا لە بەگەکانی مەحموودی ( ئەولیا بەگ ) نە خۆی و نە کوێخای و نە دیاری نەهاتبوو ، پاشا گوتی «با وابێ ، جارێ با بزانین» ، بە چوار سەعات لە رووبارەوە بە بەردەمی هەشتا هەزار عەسکەردا هات و وەڵامی سەلامەکانی راست و چەپی دەدایەوە • پاشا لەم گەرما و ناو حەشاماتە نارەحەت بوو فەرمانیدا « با بڕۆن بۆ پێشەوە » ، عەسکەر بەرەو وان جوڵا و پاشاش بە کاوەخۆ لە دواوە دەهات کە خەبەریان دایێ نامەبەری ئەستەموول هاتوە ، دەرکەوانی خانم سوڵتان گەیشت و بە سەر سوارییەوە نامەکەی دا بە پاشا، لەو نامەیەدا هەواڵی ئەنجامی (ئیبشیر پاشا) نوسرابوو و داندرانی ( قەرە مراد پاشا ) بە وەزیری گەورە• من گوتم «ئەو نامەیەی خانی بتلیس ناردبوی بە راست دەرچوو ، ئیشەڵڵا ئەوەی لە بارەی دەسکەوتیشەوە نوسیبوی دێتە دێ » • لەم کاتەدا (عوسماناغای مۆردار) هاتە قسە و گوتی « قوربان (ئیبشیر پاشا) ئێمەی بۆ (وان) هەڵدا تا دنیای بۆ چۆڵ بێ و بە وەزیری گەورە بمێنێتەوە • کە لە ئەستەموول دەرچووین بەم چلەی زستانە ئەوا سێ مانگە نارەحەتی و ماندوویی دەکێشین ، وا لە سایەی خواوە خەبەری کوژرانی هات ، زۆر شوکر ، ئێستاش وا باشە نەچینە ناو وان ، مادام ئیبشیر مرد ئێمە لە دەرەوەی وان رابوەستین و بەم سوپایەوە بچینە (ئەرزەڕۆم) یا ( بەغدا ) • » پاشا کە پاشەڕۆژی لەبەرچاو بوو پێی گوت « کوڕە هەی

نەفام ، تۆ چ حەدت هەیە لە ئاستی وەزیری خاوەن مۆری سوڵتانی عوسمانیدا زماندرێژی بکەیت ؟ یەکێك مردبێ پێخۆشبونی بۆچیە ؟ بۆچی من لە سەر قسەی ( ئیبشیر پاشا) هاتومە وان یا بە فەرمانی سوڵتان سورغوجم لێداوە و وەکو سەرداری مەزن هاتوم ؟ تۆ چوزانی ••• دا بیگرن ئەم نامەردە » بە سواری بە تۆپزی نقێمدار ئەوەندەی لە سەروگوێلاکی دا تۆپزەکەی لەتوکوت کرد ، دیسان دڵی ئاوی نەخواردەوە بانگیکرد « دەی کوا سەربڕ ؟ » ئەو گەورە پیاو و ماقوڵانەی لەوێ راوەستابون و سەردەرکەوانی سوڵتان (مستەفاغای گوێزل) خۆیان بە زکێفیەوە هەڵواسی و بە هەزار حاڵ لە دەست سەربڕی نامەردیان سەندەوە •

دیسان پاشا دەستی کردەوە بە سەلام سەندنەوە لە خەڵك ، عەسکەری پیادەی وان دەرکەوتن ، لە لایێك هێزی حەسار ، لای راست هێزی عەرەبستان ، ئەمجا ئاغای یەنیچەریەکان (عەبدی ئاغا ) لەگەڵ حەوت قاوش یەنیچەری • واتا تێکڕا پەنجا هەزار پیادەی پڕچەك و تفەنگدار ، لای راست پێنسەد جبەچی ، لای چەپ تفەنگ دارەکان بۆ سەلام راوەستان ، لە بەردەمی پاشادا بە ریزە یەنیچەریەکان و جبەچی یەکان و دوای ئەوان سەگوان و ساریجەکان و بلوکباشی یەکان بە نەعرەتەلێدان ریزیان بەست •

کاتێ لە سەروخواری قەڵاوە سێ جار سڵەوات لێدرا ، دەزرێژێکی تفەنگ و دوابەدوای شێلگەی تۆپ ••• سێ جار بەم چەشنە تۆپ و تفەنگی شادی تەقێنرا و قەڵای وان وەکو سەمەندەری لێهات یەکپارچە کەوتە سەر ئاگر و دوکەڵ ، گوللە تۆپی بە قەدەر شوتی گەورە بە سەر ئاودا خل دەبۆوە •

پاشا کە ئەمەی دی وەکو باروت گڕی گرت و گوتی « هەی قەڵاداری نامەرد ، ئەو کاتەی لەگەڵ (سوڵتان مراد خان) هاتینە ئێرە ئەوەندە تۆپ نەهاوێژرا ، ئێستا لە خۆڕا ئەم هەمو باروتە رەشە بۆ بە فیڕۆ دەدەن ؟ » زۆر

لە قەڵادار تۆزە بۆ ، کەچێ کاتێ گەیشتینە نزیك گوندی (ئەسکەلە) لە چیـا بەرزەکانی وانەوە تا ناوقەدیان دەزرێژی تۆپ دنیای پڕ کرد ، ئەو گوللە تۆپانە هەندێکی بۆ دەشتی وان و هەندێکی بۆ سەر دەریا دەڕۆیێ • پاشا ئەوەندەی دێ تۆزەبۆ و سوارێکی بەڕێ‌کردە سەر قەڵادار کە چیدی نەهاوێن ، بەڵام تازە پاشی‌چی ؟ گوللە و بارۆتی تەقیو ناگەڕێتەوە •

پاشا وەڵامی سەلامی گەورە و گچکەی ئەو خەڵـکەی دایـەوە کە هاتبۆنە پێشوازی و لە کۆتایێ مانگی رەجـەبی ١٠٦٥ دا لـە دەروازەی ئەسکەلەوە چوە ناو شاری (وان) • خەڵکی شار بە سەدان قوربانی‌یان لەسەر ڕێ سەربڕیبۆ و ڕێبازی پاشایان هەتا سەرا راخستبۆ •

(ئەحمەداغای ئەرغەنەلێ) لە دیوەخان سفرەیێکی رەنگینی رازاندەوە و بانگهێشتنێکی کرد هەر باسی ناکرێ ، سوپای کوردستان و پیاوماقوڵانی وان نانیان خوارد • پاشان دیوانی شاهێ جاڕ درا ، نۆ قات تەپڵ لێـدرا و چاوەشان بانگیان کرد « کێ شکاتی هەیە ؟ » شەش حەوت کەسێك هـاتن شکاتەکانیان دەربڕی و بە پێی شەرع بۆیان جێ‌بەجێ کرا • فەرمانێـکی سوڵتان هەبۆ بۆ کوشتنی حەوت کەس و فەرمان درا بگیرێن ، چواریان لەناو خەڵکدا رایان‌کرد و سێ‌یانیان هەر لەوێ کوژران ، پاشان دەرکەوت ئـەم حەوتە لە باخی‌بۆنەکەی ( محەمەدەمێنی کوڕی شەمسی پاشا )دا دۆستیـان بوە و ئەوان هانیان داوە ، ئەوانە رەکێش کرانـە بەردەمی پاشـا و دوای ساخ‌کرانەوەی تاوانەکەیان سەریان لە لەش جیا کرایەوە •

سەر دەرکەوان دەسخەتی سوڵتانی هێنا دایە دەسـت ( عەلیەفەنـدێ غینایێ زادە ) و ئەویش بە دەنگی بەرز بۆ هەمۆ لایێکی خوێنـدەوە کـە حەفتا کەس فەرمانی لە سەردرانیان دەرچوە پێویستـە کەللەکانـیان بـۆ ( ئەستەمۆڵ ) بنێردرێ • لەم حەفتایە چل و پێنجیان حـازر بۆن بە قـۆڵ بەستراوێ هێنرانە خزمەت پاشا ، پرسیاری تاوانی ئەمانەی لە خەڵکەکە کرد

هەمو گوتیان « ماڵ کاول بون ، شار بەر تۆپ دران و خوێنی ئەم هەمو کوژراوانە لە ئەستۆی ئەمانەیە ! » پاشا گوتی « من ئەمڕۆ وەکیلی سوڵتان و سەرداری مەزنی ئەوم ، لەمانە حەوتیان بەرەڵا دەکەم ، بەڵام عیلاجی ئەم سی و هەشت کەسەی دیکەتان بۆ دەکەم . دەی سەربڕ ، لایان بەن » ، دەزبەجێ سەگوان و ساریجە بەرەو قەڵایان بردن ، یەکیان هەر لە ڕێگا گیانی دەرچو . ( سولەیمان بەگی خەزوری خسرەو پاشا)ی بانگ کردە لای خۆی کە فەرمانی شاربەدەرکرانی دەرچوبو ، بەخشی و ئاغایەتیەکەی خۆی پێدایەوە ، ئاغا و پایەدارەکانی دیکەش کە دورخرابونەوە بە هۆی بەشداری کردنیان لە یاخیبونی محەمەدەمین پاشا ، بانگی کردن خەڵاتی دانێ و ناردنیەوە جێی خۆیان . ئیدێ خەڵك بڵاوەی لێکرد و عەسکەر کشایەوە ناو قەڵا . ئەو شەوە لە لایەن تاوانبار و گوناهکار و ئەو کەسانەی دەیانویست لەسەر فرمانەکانی میری بمێننەوە ، هەشسەد کیسە پارە بۆ پاشا هات ! [١٩]

بۆ بەیانێ پاشا لەگەڵ ئاغای یەنیچەری و مفتی و نەقیبی ئەشراف و مەلاکان چونە سەیری ئەو شوێنانەی قەڵاکە پێویستی بە چاككردنەوە هەیە، کە دەبینن چیای لای باکوری وان ئەوەندەی یەك کێو گڵی لێ ڕۆ کراوە ، پاشا پرسی « ئەم هەمو گڵە بۆ لێرە کۆکراوەتەوە ؟ بە مەبەستی گرتنی قەڵا ڕۆکراوە؟ » پیرەمێردەکانی وان گوتیان « قوربان ، (تەیموری لەنگ ) بە سێ ساڵ ئەم گڵەی لێرە کەڵەکە کرد تا ئەم قەڵایەی پێ بگرێ بەڵام دواییش هێچی بۆ نەکرا و هەروا بەجێی هێشت ، دوای ئەو (ڕۆستەم خانە کەچەڵ)ی عەجەم حەوت مانگ ئێرەی گەمارۆ دا و ئەویش ئەوەندەی دیکەی گڵ خستە

---

(١٩) ئەو هەڕەشە و تۆقاندن و دەنگوباسە ترسێنەرە هەموی بە مەبەستی دەسکەوتی پاشا و ڕوتاندنەوەی خەڵك بوە و باشیش سەرکەوتوە ، بە تاقە شەوێك هەشسەد کیسەی بۆ هات کە بە نرخی ئەو ڕۆژە دەبێتە سامانێکی زل .

سەر ، کەچێ (خەلیل پاشا) و (قەرە مورتەزا پاشا) فریاکەوتن و سەنگەریان بە (رۆستەمە کەچەڵ) بەجێهێشت ، ئێمەش لە بەرەبەیاندا دەروازەکانمان کردەوە و شوێن سەربازی عەجەم کەوتین هەشت هەزار کوژراو و سێ هەزار زیندوومان پێ بەجێ هێشتن ، حەفتا هەزار گوللە و هەزار بەستە بارووت و هەشسەد قەتار رەوە و هەزار ئەسپی قەرەچووبوون و گەلێك خێوەت و بارەگا و سێسەد و بیست توپ و بیست توپی بالیۆمزمان لێ گرتن جگە لە ماڵ و تالانێکی زۆر • ئیدێ لەوساوە ئەم گلە هەر لێرە ماوە••»
پاشا گوتی «کوێخا ، هەموو خێوەتەکانی من لێرە هەڵدەن ، هەموو عەسکەریش با لێرە دابەزن ، با بەگی بیست و حەوت سنجاقی وان بێن و بۆ خزمەتی سوڵتان لە فرێدانە دەریای ئەم گلەدا یارمەتیمان بدەن » ، تێکڕا گوتیان جەنابی وەزیر ، خوا رێکیخا •

یەکەم کەس خۆی داوێنی لێ بەلادا کرد و هەموو ئاغاکانی ژوورەوەی خۆی و ئاغاکانیوان دەستیان کرد بە بەرد هەڵگرتن و فرێدانی • لەناو شار جاڕچێ جاڕیان دا هەرچێ دەنکە جۆیێکی پاشای خواردوە بە پاچ و پێمەڕە و تورەکە و زەمبیلەوە بێن بۆ گڵفرێدان • خێوەت و بارەگای پاشا و بار و بارخانەی ئەو هەموو عەسکەرە لە دەشتی وان هەڵدرا و ئەو ناوە بە جارێك ئاوەدان بۆوە •

پاشا قەڵەمی بە دەستەوە گرت و بۆ هەموو بەگەکانی ئەو سنجاقانەی سەر بە وانی نووسێ «ئەگەر لە ژێر فەرمانی پادشای مەکە و مەدینەدان ، وەرن لە وان یارمەتێ قەلاکەی بدەن » • هەر یەك لەو فەرمانانە درایە دەستی ئاغایێك و بۆ فەرماندە کوردەکان بەڕێ کران •

منیش کە ئەم ناوەم نەدیبوو دەستم کرد بە سەیران و تەماشای قەلای (وان) •

# باسی قەڵای وان

ئێرە لە پێشتردا نەتەوەکانی (عاد و سەمود)ی لێ بوە کە لە چیاکانـــدا نیشتەجێ بۆبۆن لەناو ئەو ئەشکەوتە قوڵ و گەورانەی هەڵیان‌کەنـدبۆ ، ئەوەبۆ خوای گەورە هەمویانی کردە بەرد • ئەم ناوچەی وانــەش چەنـد دەستاودەستی کرد تا لە ساڵی ١٦٠٠ پێش هاتنی پێغەمبــەری ئیســلام لە سەردەمی حەزرەتی سولەیماندا (مەلیك جالوت) لێرەدا کلیساییێکی گەورەی دروستکرد ، پاش ئەوەی (سولەیمان پێغەمبەر) جالوتی کوشـــت ئێرە زۆر ئاڵوگۆڕی بەسەردا هات تا ٨٨١ ساڵ پێش هاتنی پێغەمبەر کەوتە دەســت ئەسکەندەری گەورە • لەبەر ئەوەی دانیشتوانی ناوچەکە بەو کلیسایەیــان دەگوت وان ئەو شارەی لە لاشیەوە دروستکرابۆ هەر ناوی وانی بە سەردا بڕا ، لە سەردەمی پێغەمبەردا بە دەست کیسرای دادکار نۆشیروانەوە بۆ ، یەکێك لە ئەسحابەکان ڕێی کەوتە ئێرە قەشەی کلێسا و چەند کەسێــکی دیکەی موسڵمان کرد ، پاشان یەکێك لە بنەماڵەی (یەزدی گرد) بە نــاوی (تاژدین) بۆ بە فەرمانڕەوای ئێرە و قەڵای وانی نوێ کردەوە و قەڵاییێکیشی لە خوارەوە دروست کرد •

ساڵی ٨١١ی کۆچی کەوتە دەست (قەرە وێسفی جـەلایری) کە لــە شایەکانی قەرەقۆیونلوی ئازەربایجان بۆ ، ئەویش لە ترسی (تەیمۆری لەنگ) هەڵات و پەنای بردە بەر (ییلدرم بایەزیدی عوسمانی) ، بەڵام یەکێکی دیَ لە

شایەکانی ئازەربایجان (حەسەن بایندر) ناو سەرێ بۆ (تەیمور) دانەواند و شوێنی کەوت ، تەیموریش لە پاداشتی ئەم دلسۆزی‌یە ئازەربایجان و شاری ئەخلات و قەلای وانی دایێ •

لە سالی ١٩٥٥دا وان کەوتە دەست (شا تەهماسبی سەفەوی) ، سالی ٩٥٦ لە سەردەمی سوڵتان سولەیماندا برای ( شا تەهماسب ) کە ناوی ( ئەلقاس میرزا ) بۆ لە کاکی تۆرا و هاتە کن سولەیمانخان و پاشان لە کاتی ئاژاوەنانەوە و تالانکردنی ولاتی عەجەمدا کوژرا •

( ئیبراهیم پاشا ) کرا بە سەرداری مەزن و (ئەلقاس میرزا) بۆ بە یارمەتی‌دەری ، جا بە سوپای تەواوی ئەیالەتەکانی سەر بە ( ئەنەدۆل ) و ناوچەکانی (قرمان) و (مەرعەش) و (دیاربەکر) و (شام) و (حەلەب) و (تەرابلوس) و (ئورفە) و (ئەدەنە) و هەمو کوردستانەوە کەوتە رێ و لە دەشتی واندا چادر و خێوەتیان هەلدا و حەسانەوە ، ئەو عەجەمانەی لە ناو قەلادا خۆیان حەشار دابۆ لە بەرامبەر ئەم هێزەی عوسمانیدا خۆیان بۆ نەگیرا لە ترسان کلیلی قەلایان بۆ سەرداری مەزن هێنا و چونە ناو قەلای (زگدڕاو)ەوە • هەر لەو رۆژەدا (ئەمین بەگی مەحمودی) کلیلی قەلاکانی (ئامیق) و (سێ ئاوان) و (سولتان کیپانێ) بۆ سەردار هێنا ، لەبەر ئەوە حکومەت و قەلاکان درایەوە بە خۆی • دیسان قەلا زۆر قایمەکانی (جرم) و (بیدکار) و (بارگر) و (رۆسنی) و (حل) و (تەنوزە)ش کلیلەکانیان بۆ هێنا • سەرداری مەزن ولاتی وانی دا بە وەزیری شام (خسرەو پاشا) •

بەلام گەلێك لە خانەکانی کوردستان ــ وەکو (شەرەفخانی بتلیس ) ــ کە لەلایەن شا تەهماسبەوە تاجی لەسەر نرابۆ ، دەستیان کردبۆ بە رێگرێ و ئازاردانی کاروانی موسلمانان و رێبواران •

سەردار خەبەری گیرانی وان و هەر چل و سێ قەلاکەی دیکەی وەکو

هەواڵێکی پەلە بۆ سولەیمانخان نارد کە لەو کاتەدا لە گەرمیانی حەلەب بو ، ئەویش رۆی کردە لای ئەوان • (خسرەو پاشا) کە یەکەم فەرمانڕەوای قەڵای (وان) بو خەریکی نوێکردنەوەی قەڵاکە بو • شای ئێرانیش کە زانی قەڵای وان گیراوە بە لەشکری ئێران و تورانەوە بەرەو ئەملایە جمی ، (سەردار ئیبراهیم پاشا) ش بە هێزەکانی خۆیەوە چو بۆ پێشی ، لە وانەوە بەرەو باکور و خۆرهەڵات گەیشتە (سەڵماس) کە لە وانەوە حەوت فرسەقە ، شا کە هاتنی سەرداری بیست گەڕایەوە بۆ ( ئیسفەهان ) ، سەرداریش لە (ئەسعەداباد)ی نزیك (تەورێز) خستی ، پیاوماقوڵ و مەلا و ناسراوەکانی سەریان بۆ سەردار دانەواند و دیاریان بۆ هێنا • (ئیبراهیم پاشا) فەرمانی دا کە تەورێز تاڵان نەکرێ ، بەڵام هەواری (قزلجە) کە شوێنێکی سەختی عەجەمەکانە و سەربزێوی دەکا (ئولامە پاشا)ی بە دە هەزار عەسکەرەوە نارد بیگرێ ، کەچی (ئولامە) شکا و بە عەسکەرێکی کەمەوە گەڕایەوە (تەورێز) ، ئەمجارە سەردار عەسکەرێکی پتری ناردە هەواری ( ئوجان ) لە نزیك (تەورێز) و (خۆی) و (مەرەند) و (تسو) و (سەڵماسیان) تاڵان کرد و تۆڵەی خۆیانیان سەندەوە و بە تاڵانێکی زۆرەوە گەڕانەوە تەورێز • بیست رۆژ پاش ئەو بەسەرهاتە کوردەکانی پنیانشی لە دۆڵی قەتورەوە هاتنە ناو وان و قەڵاکەیان ئاوەدان کردەوە • (شەرەفخانی بتلیس) چونکو بۆ کن شای ئێران هەڵاتبو ولاتی بتلیس بە خەڵات درا بە (ئولامە پاشا) •

دوای ئەمانە (سەردار ئیبراهیم پاشا) بەسەر (بتلیس) و (حەزۆ) و (میافارقین) و ( دیاربەکر )دا بەرەو بەغدا رۆیشت کە لەو کاتەدا سولەیمانخان گەمارۆی دابو ، دوای ئەوەی بە خزمەت سوڵتان گەیشت لە گەمارۆی بەغدادا بەشداری کرد و ئەو شارە پاش چل رۆژ گەمارۆ دران لە ساڵی ٩٤١دا گیرا •

پاش گەڕانەوەی بۆ ( ئەستەمۆڵ ) بیستی کە ( قەیسەری ئەڵمان )

لەشکری ناردۆتە سەر (بەلگراد) ، (سولەیمانخان) بەبێ راوەستان رۆی کردە ئەو ناوە و پاش داگیرکردنی حەفتا پارچە قەلای وەکو ( ئەردەد ) و دۆك نشینی (سولانکمیش) و (ئەردین) و (ئوسکە) بە سەرکەوتویی هاتەوە (ئەستەمۆل)• لەم کاتەدا هاواری قەلاکانی (وان) و (عادلجەواز)ی پێگەیشت کە شای ئێران گرتونی ، (سولتان سولەیمان) چاری نەما بۆ جاری دوەم بەرەنگاری عەجەمەکان وەستایەوە •

( سولتان سولەیمان ) رۆژی حەوتەمی مانگی سەفەری ٩٥٥ لەگەل (شازادە جیهانگیر)دا هاتنە (ئوسکودار) و (لەوێوە) بە سوپای دەریا ئاساوە هات تا گەیشە ئەو شوێنەی پێی دەلێن (سەید غازی) ، لێرەدا (شازادە سەلیم خان ) والی (سارۆخان) گەیشتە خزمەتی و کاروباری ولاتی (رۆمێلی) پێ سپێردرا و نێررایە (ئەدرنە) • پاشان هات گەیشتە بەرەوەی (ئاقشەهر) و لەناو بارەگادا حەسایەوە ، (شازادە بایەزید خان) بە سوپای خۆیەوە هات لەمبەرەوبەری رێگا بۆ سەلام راوەستا ، کە ئالای پێغەمبەر دەرکەوت دابەزی و چو زکێفی باوکی ماچکرد ، سولتان زۆری پێخۆشبو ، ئەم شازادەیەشی رەگەل خۆی خست و بەرەو ناوچەی (وان) رۆیشتن ، گەیشتنە (سیواس) ، لێرەدا (شازادە مستەفا خان) کە فەرمانرەوای (ئاماسیە) بو گەیشتە دەست ماچکردنی سولتان و ئەویش بە سوپاکەیەوە شوێنی کەوت ، کە هاتنە قەلای (ئەرزە رۆم) سێ رۆژ وچانی گرت و سوپای دیکەشی کۆ کردەوە و هات لەبەر قەلای (عادلجەواز)دا پشوی دا ، عەجەمەکان خۆیان رانەگرت هەندێکیان بە کەشتی رویان کردە قەلای (وان)و هەندێك بۆ دەشتی (تەحتیوان) هەلاتن و قەلای (عادلجەواز)یان چۆل کرد •

لە بەردەمی ئەو قەلایەدا سولتان (ئولامە پاشا)ی کرد بە بەگلەربەگی قرمان و (پیری پاشا)ی بە چل هەزار کەسەوە نارده سەر وان گەمارۆی بدا • ئەوان گەیشتنە خوارەوەی وان مەتەرێزیان هەلکەند چونە ناوی و چەند

هەزار عەسکەرێکیان بۆ شوێنەونی بەڕێ کرد کە بچن لــە خاکی عەجەمدا تالآن و کاولکاری بکەن • سولتانیش بە دە ڕۆژ گەیشتە دەشتی (تەورێز) •

برا بچکۆلەی شا ( ئەلقاس مــیرزا ) لە بەردەم ســولتان سولەیماندا دەستی بە چاوڕاو کرد تا سولتان کردیە سەردار و ڕوی کردە (هەمەدان) و (دەرگەزێن) و (ئەردەوێل) و (نەهاوەند) و (قوم) و (کاشان) و (قەزوێن) و (مەراغە) و (ئەسەداباد) و شاری (ئوجان) و دەوروپشتی (ئیسفەهان) • لە (عیراق) و ئازەربایجاندا بە چل ڕۆژ حەفتا و شەش پارچە شاری داگیر کرد و لەگەڵ (ئەلقاس میرزا)دا گەڕایەوە خوار شاری (تەورێز) ، ئەوەندەیان تالآن لەگەڵ خۆیان هێنابو کە هەر خەربەندەیێك باری وشترێك میسکی پێ بڕابو، ئەم قسەیە زۆر بلآوە ، بەلآم سولەیمانخان نەیهێشت شاری (تەورێز) تالآن بکرێ و رازی نەبو دەست بۆ دانیشتوانی ببرێ ، تەنیا کۆشك و خیابانی شا لەناو تەورێزدا ڕوخێنرا و تەخت کرا • من کە لە ساڵی ١٠٥٨ دا چومــە تەورێز باسی ئەو کاولکاریەم کردوە •

دوای ئەوە سولتان بەرەو خۆراوا گەڕایەوە و بە پێنج ڕۆژ گەیشتەوە دەشتی (وان) کە تەماشای کرد (ئولامە پاشا)و (پیری پاشــا) هەروا لەناو سەنگەردان، دەزبەجێ سەدری ئەعزەم ــ سەرەك وەزیر ــ (ڕۆستەم پاشا)ی بە حەفتا بەگلەربەگییەوە کردە فەرمانداری گرتنی وان ، بــە مەرجێك بە ئاشکرا لەو دوژمنــانە کەسیــان لێ دەرنەچێت و ئەمــانیش لە ناو خۆیاندا سەبارەت بە چۆنێتی گرتنی قەلآ ڕاوتەگبیر بکەن • جــا سوپــای عوسمانی وەکو شەڵخە چواردەوری قەلآیان دا و ئەم ئابلۆقە تەنگە دە ڕۆژی خایاند، عەجەمەکانی ناو قەلآ لەبەر قاتوقڕی و برسێتی پەرێشان بون ، لــە ڕۆژی یازدەیەمدا فەرماندەی قەلآ (سوپا سالار عەلیجان) لەگەڵ چەنــد کەسێکدا خۆیان لە دیواری قەلآوە بە گوریس شۆڕ کردەوە و چونە خێوەتی (ئەلقاس میرزا ) و بەسەر دەست و پێیدا کەوتن ، ئەویش تکای لە سولەیمانخان کرد

بۆ بەخشینیان • بەم پێیە بیستی رەجەبی ٩٥٥ جاریَکی دیَ قەلآی وان بە دەستی ( سولتان سولەیمان ) و گەورە وەزیرانی ( رۆستەم پاشا ) داگیرکرایەوە •

سولتان چل رۆژی دی لە وان مایەوە و قەلآکەی بە جۆریَ تازە کردەوە لە جاران باشتر • ئەمرۆ وان یەکێکە لە قەلآ هەرە قایمەکانی عوسمانیَ و مێژوَنوسەکان نازناوی قزل ئەرسەلان (شێری سور) یان داوەتیَ چونکو رەنگی گومبەز و بەردەکانی ئالە و لە دورەوە دەلێی خوێنی پێدا کراوە •

**رەوەزی وان :**

وان لە خاکی ئازەربایجاندایە، باشور و خۆراوای باکوری بە دەریاچەی وانەوەیە ، خۆرهەلآت و لای قیبلەی کەوتۆتە ناو دەشت و چیمەنێك دەلێی بەهەشتی شەدداده • قەلآکە لەناو ئەم دەشتەدا لە دورەوە دەلێی وشتری بارکراوە و یخی خواردوە ، لای پشتەوەی گەیشتۆتە پەڕەکەی ئاسمان و لە هەزار رەنگ دەنوێنیَ ، ئەملاو ئەولاشی وەکو باری وشتر لەبەریەك رەویوەتەوە و خوارەوەی وەکو کێوی بێستون بەردێکی یەك تەختەی بن هلۆلە و دیوارە نزمەکانی وارشی شاری لیَیە ، لای باکوری کەندی ژێر رەوەزەکە ـ ئەو جیَیەی تەیمور خۆلەکەی لیَ رۆ کردبو ـ شاری لیَ نیە و لایەکەی دیکەی زەلکاوە ، لای خۆراوای خۆلی تەیموری لیَیە و پشتەوەی دەشتە • ئەم چیایە کە دەلێن لە وشتری یخدراو دەچیَ ، سەری وشترەکە لای خۆرهەلآتە و کلۆ بەردەکانی تۆپ نایانگاتیَ ، لاقەکانی ئەو وشترە دەڕوانێتە خۆراوای سەر دەریا ، ئەوەی گوتمان لاقی وشترەکەیە لە خوارەوەڕا بە سیَ هەزار و شێست شەقاو بەسەر بەرد و پیَپیلکەی بەترسدا بە یەك سەعاتی تەواو جا دەیگەیتیَ و دەبیَ لە حەوت قوللە و حەوت دەروازە دەرباز بی ئنجا تازە دەگەیتە دەرگای عەرەبجان کە لە هەمو دیوارەکانی قەلآ نزمترە •

گاشه بەردەکانی ئەم قەڵایە لە خوارەوەڕا بە چەشنێکی سەیر دێنە بەرچاو ، لایێکی دەڵێی هەژدیهایە و خۆی بۆ خوارەوە شۆڕکردۆتەوە و ڕێگای شاری گرتوە کەللە و چڕنوك و ملی بە ئاشکرا دیارە ، لایێکی دیکەی هەیە وەکو شێر وایە یا لە شێوەی تیمساح و کەشتی سەر ئاوە ، هەیانە بێ کەموزیاد هەڵۆی لە سەر نیشتۆتەوە ! لە خوارەوەڕا بە سێ سەعات دەگەنە لای ئەو بەردانە ، لە قەدی ئەم چیایە شەشسەد ئەشکەوتی گەورەی نهۆم لەسەر نهۆم هەیە هەر یەکە ئەوەندەی کاروانسەرایێك بەرینە ، لەناو هەندێ لەم ئەشکەوتانەدا شارە کرمی ئاوریشم هەیە کە وەستاکاران بە خەڕەك دەیڕێسن و دەیکەن بە داو و قوماشی لێ دەتەنن • لە سەدان ئەشکەوتدا ئەوەندە گوللە تۆپ هەڵدراوەتەوە مەگەر خوا بیزانێ ، هەندێکی لێپاولێپ پڕ کراوە لە باروتی ڕەش ، هەندێکی دیکە پڕیەتی لە شێر و تیر و تفەنگ و مەتاڵ و تەوەرزین و پاچ و پێمەڕە و نوێڵ و چەرخوفەلەك و مەنجەنیق و بەردی خڕ و چەك و کولوپەلی بێ ژمار ، تەنانەت لە سەد ئەشکەوتا گەنم و جۆ و چەڵتوك و گەنمەشامێ و پاقلە و نیسك و نۆك و دانەوێڵەی دێ عەمبار کراوە ، ئەشکەوتێك هەزار ساڵە پڕ کراوە لە کەوشە کۆن و کاڵەی دڕاو و پەڕۆکۆن و ئەم جۆرە شتە بێکەڵك و هیچوپوچانە ، ئەشکەوتێك پڕیەتی لە ئێسکی ئاژەڵ و جانەوەر • یەکێکی دێ لەو ئەشکەوتانە پڕیەتی لە کەندوی گەورە گەورە کە یەکیان ڕۆنی بزێر و یەك ڕۆنیکونجێ و یەك ڕۆنماسێ و یەك ڕۆنی ئاژەڵ و یەك نەوتی ڕەش و گەلێکی دێ لەم جۆرە چەوریێانە ، حەوت حەوزیان دروست کردوە و پڕیان کردوون لە پێستی مەڕ و گامێش ، ئەو پێستانە ئاوەڕۆت و پاك کراون و وەکو سیرمەی باریك بڕیویانن تا ئەو حەوزانەیان لێ پڕ کردوون ، پاشان ئەوەندەیان هەنگوین پێدا کراوە تا نوقوم بون و ئێستا لە پێستی دەرچوە بۆتە مرەبایێکی ئەوەندە خۆش پیاو لێی تێر ناخوا • لە ئەشکەوتێك ماسێ خوێکراو و لە یەکێك بەرخی خوێ کراو یا

گۆشتی بزن و گامێش وشك كراون ، سێ ئەشكەوت پڕیەتی لە خوێ ، چل ئەشكەوتیش ئەوەندەیان گەنمەشامێ كوڵاو و كولێرە و بەكسەم و ئارد و ساوەر تێدایە خوا نەبێ كەس نایزانێ • چەند حەوزیش سركە و هەنگوین و پەنیر و ڕۆنی زەیتونە و تەنانەت شـەراب ( مەی )یش هەیە كە دەدرێ بـە نەخۆش یا بۆ فەلەكانە • لەوانەش سەیرتر ئەشكەوتێك بە كاری خوا كانی نەوتی تێدایە لە قەڵشتی بەردێك دێتە دەر و دەچێتە حەوزێكەوە ، كە پڕ بێ دەفتەردارێكی میرێ دێ و بە خەڵكی دەفرۆشێ ، بەڵام ئەم ئەشكەوتە شەو و ڕۆژ داخراوە و چەند تەپۆڵكە خۆڵی لـەلا هەڵدراوەتەوە كە ئەگەر خـوا نەخواستە لەبەر هەر شتێك ئاگری گرت پێی بكوژێندرێتەوە •

بە كورتێ وەكو گوتمان لەم چیای وانەدا شەشسەد ئەشـكەوت هەیە كە هیچیان خاڵی نین و هەموی پڕە لـە چەك و جبەخانە و ئازوقەی شەڕ ، چونكو سولەیمانخان كە لە شەڕەكانیدا زۆر سەركەوتو بو و چەندین قەڵای داگیر كردبو و خۆی بەسەر هەمو شتێك رادەگەیشت ، پەلاماری دەرەوە بۆ ناو قەڵا و بەرگرێ قەڵا بۆ دەرەوە هەموی لێكدابۆوە ، بۆیە لە خواری قەڵاوە تا لوتكەی سەرێ بیست بیست و سێ سێ و چل چل تۆپی بالیۆمزی دامەرزاندبو كە هەتا مەودای چوار سەعات لە باخەكانی ئەردەمیتەوە رێی دوژمن بگرێ و لە دەشتی وان و چل میلی دەریاوە كەس نەوێرێ بجوڵێتەوە• جا ئەگەر هاتو سەرەڕای ئەم هەمو شتە دوژمن بە فێڵێك گەیشـتە دامێنی قەڵا و تۆپە گەورەكان رێگای لێدانیان نەبو •••• سوڵتان سولەیمان بـە هەزار زەحمەت و ماندوبون دیواری هەندێ لە ئەشكەوتەكانی كون كردوە و لولە تۆپی وای لێ هێناوەتە دەرێ كە پیاو سەری سوڕ دەمێنێ ، بەم جۆرە ریزێك تۆپی داناوە و گوللـە و پێویستیەكانی لـە تەنیشتەوە داناون ، ئەشكەوتەكانی خوار ئەوانیشی كون كردوە و لولەی تۆپی لەوان گچكەتری دەرهێناوە و گوللەی بەردی لە تەنیشـت داناوە ، جگە لەوانە لـە وارشی

خوارەوە دەرك و دیواری قەڵاو بورج و شورەکانی لە دەروازەی یالی‌یەوە تا قوللەی پاشا و لە قوللەی ڕۆستەم پاشا و خسرەو پاشاوە هەتا دەروازەی ناوەڕاست ، لە دەروازەی تەوریزەوە تا دەگاتە قوللەی سەرۆ قات‌قات تۆپی بۆ ریز کراوە و بەم حیسابە لە راست و چەپەوە چوارچین تۆپ دامەزراوە .

**شێوەی قەڵای وان :**

قەڵایێکی زۆر قایمە لە سەرۆی ئەو ئەشکەوتانەیە باسمان کردن و سەری گەیاندۆتە هەوران ، بەشی خۆراوای حەوت قات قوللە و دەروازەی هەیە کە بورجەکانی یەکتریان لێ دیارە ، ئەو لایەی بەسەر باکوردا دەڕوانێ لەسەر تیرە شاخێکی تیژ سێ چین دیواری قەڵایە خێڵی عەزەب و عەسکەرەکانی دیکە لێرەدان ، لەم لایەوە بە ناو بەردانداڕێگای هاتنەخوارەوە و ئاوهەڵگرتنی هەیە و قوللەکەی تۆپی بالێومزی بۆ داندراوە . لای قیبلەی بەسەر باشوری شاردا دەروانێ و قەڵا لەم شوێنەدا دیواری بۆ نەکراوە ، لەسەر ئەو تەختە بەردانە سەرای فەرمانڕەوا و ژوری ئاغای یەنیچەریەکان و باشچاوەش و توسەر و کوێخای سەرا و قەڵادار و یەنیچەریەکانی دیکە و. تۆپچی و چەکدار و شانشینی‌یەکان کراون ، لەم ئاستەوە کەس زات ناکا تەماشای خوارەوە بکا . قوللەی ئاوخانە لێرەیە کە گاشە بەردە زلەکان لە خواری شاریان جیا کردۆتەوە ، لە قەڵا و لوتکەی سەرەوە بە پلەکانێکی چەند هەزار پلەیی لە بەرد هەڵکەندراو دەگاتە سەر ئاوی خوارەوە ، ئەمە ڕێگای سەرکەوتن و هاتنە خوارەوەیە ، ڕێگای ئاوهەڵکێشانیش جودایە ، لە کاتی خۆیدا قلیج ئەرسەلان بۆیە کردویەتی بە دو ڕێ تا لە کاتی گەمارۆدرانا ڕێگای ئاوهێنان قەڵەبالخ نەبێ . هەر لەم ئاستەی قەڵای واندا ئاشی خوڕخوڕە دەگەڕێ و ئاوەکەی دەچێ لە دەباخ‌خانەوە بۆ باخچەکانی دەرەوە و چی لەوان زیاد بو دەرژێتەوە ناو دەریا . ئاوەکەشی زۆر ڕون و خۆشە .

**بڕگەی لای ملە وشترەکە :**

جگە لەو قەڵایە کە باسمان کرد ، ئەوەی گوتمان وەکو ملە وشتر وایە قەڵایێکی بچوکی لێیە وەکو قەڵای زلی سەر کەللە وشترەکەی لێ هاتوە و کەوتۆتە خواری قەڵای یەنیچەریەکان ، ئێرەش ڕێگای ئاو و ئەشکەوت و قەڵادار و عەسکەر و چەکی پێویستی هەیەو بۆتە کۆسپی ڕێگای تەورێز و وا هەڵکەوتوە کە لەگرتن نایێ •

**بارستایی قەڵای ژۆرۆ :**

ئەم قەڵایەم بە شەقاو بۆ نەپێورا چونکو لایەکانی گەلێ ئەوەندە قوڵ و تاشراون دەڵێی شیوی دۆزەخە ، هەر لەبەر ئەوەشە خەرەندی بۆ نەکراوە ، ئەوەی زانرابێ قەڵاییێکی زۆر سەختە و لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆراوا ڕاکشاوە ، لە خوارەوە بۆ سەرێ بە سێ هەزار شەقاو و زۆر بە ناڕەحەتی دەگاتە قوللەی ناو قەڵا ، لایەنی خۆراوای سێ چین دەروازەی ئاسنە • لە ناو دەروازەکانی قەڵای واندا شەو و ڕۆژ ، هاوین و زستان هەر ڕۆژە تاقمێك لە یەنیچەری پراودە و عەزەبەکان و پیاوەکانی حەوشە پاسەوانی دەکەن تەنانەت ژنێك یا منداڵێکیش ڕێگا نادرێ بێتە ژورەوە • ئەمە لەبەر ئەوەیە کە جارێکیان چەند سەد کوردێك بە جلکی ژنانەوە هاتبونە ناو قەڵا و داگیریان کردبو • دوایی ئەحمەداغا ناوێك بە پارەی خۆی سێ هەزار کەسی گرت و لە هەمو لاییێکەوە بە هەزار فیێڵ و تەڵەکە و بە کەشتی ناو دەریاوە توانیان کەلێنێك بدۆزنەوە و بچنە ژورەوە ، ئەو کوردانەیان بە شیر لەتوپەت کرد ، هەندێکیان لەو سەرەوە خۆیان هەڵداشتە خوارەوە و کەلاکی کوژراوەکانیان لەسەر بورج و دیوارەکانی قەڵا هەڵواسی ، ئەم ڕوداوە لە زەمانی مرادی چوارەمدا ڕوی داوە و لەو ڕۆژەوە ژن و منداڵ ڕێ نادرێ بچنە ناو قەڵا • دە قاوش یەنیچەری بۆ وان داندراوە •

لەم دەرگایەوە بەرەو خۆرهەلاّت تا قوللەی ملە وشـــتر درێژایی قەلاّ هەزار و چل شەقاوە ، ئەگەر سێ هەزار و شێست شـــەقاوی خوارەوەشی بخەینە سەر ، قەلاّی وان لە خوارەوەڕا تا قەلاّی ناوەڕاست و قوللەی ملە وشتر دەبێتە چوار هەزار و سەد شـــەقاو ، پانایی‌یەکەشی جێی وای هەیە دوسەد سێسەد شەقاو دەبێ ٠

**خانوبەرەکانی ناو قەلاّی وان :**

نزیکەی ســـێسەد مال یەنیچەری و تۆپچی و چەکداری تێـــدایە کە هەمویان رەبەنن و خاوەن ژن‌و مالّیان تێدا نی‌یە ٠ بەلاّم ئەولای باکورەی بەسەر دەشتا دەڕوانێ و قوللەی ئاوخانەی لێ‌یە لەناو حەوشەی بە دیواردا خاوەن ژن و منالّی لێ‌یە٠ مزگەوتی سولەیمانخانی لێ‌یە کە کلیسا بوە و کراوە بەمزگەوت ، منارەکەی بە بومەلەرزە روخابو ئاغای یەنیچەری (عومەراغا) دروستی کردۆتەوە ، گومبەز و خانوەکانی هەتا نزیك نیوەڕۆ لەناو هەور و مژدان و دەرناکەون ٠ دەلّێن تیر نایگاتێ بەلاّم ئەو کاتەی سولەیمانخان لە گرتنی روان گەڕابۆوە (ساری سولاّخ پالّەوان) و ( حاجی ســـولەیمانی ) بانگ کردبو و تیری پێ هاویشتبون گوایا ئەوان تیریان گەیاندۆتە قەلاّ ٠ لە ناوەوە حەوت مزگەوت ، تەکیەیێك ، سێ قوتابخانـــە و دە دوکانی بچوکی تێدایە ، لە هەمو مالّێك سەرشوڕێك هەیە ، هەمو مالّێك بە ئێستر و بارگیر لەخوارەوە ئاو بۆ خۆیان دێنن ٠

**شتێکی گرنگ :**

ئەو لایەی قەلاّی ناوەوە کە قیبلەیە و دەڕوانێتە شار ، لەسەر ئەشکەوتی تۆپی ملەوشـــتر بەردێـــکی قوچی چوارســـوچ لوس کراوە و شـــتی لێ هەلـکەندراوە ، ئەو هەلـکەندراوە بریتی‌یە لە نوسین و نیگار و جفرەی وا کە من بۆم نەخوێندرایەوە ٠

**قەڵای ژێرو :**

ئەم قەڵایە لای قیبلە نەبێ کە بەسەر دەشتێکی بەریندا دەڕوانێ لە هیچ لایێکەوەحەوالەی نیە ، زۆر قایمە و سێ گۆشە هەڵکەوتوە ، پشتەوە و لای باکوری لەگەڵ قەڵاکەی ژوروو دەیکاتە چوارگۆشە • ئەم قەڵایەی خوارەوە لەو شوێنانەی بە قەڵای سەرەوە نوساوە دیواری نیە ، زۆر پتەوە و بە بەردی تاشراوی زل تاژدین بنیاتی ناوە ، نزمە بەڵام زۆر قایمە ، پانایی دیوارەکانی دوازدە گەزە و باش داڕێژراوە • لە قوللەی (وەلەد)ەوە تا قوللەی باخچەی کۆشکی پاشا دیواری قەڵا بیست گەز ئەستورە ، بەڵام لای قوللەی ئەلماجی پاشا کە لەپاش گەمارۆکان چاك کراوەتەوە دیوارەکەی سێ شەقاو پانە و جلیتینێی لەسەر دەکرێ •

قوللەکانی دەوراندەوری حەفتان، قوللەی (سولتان وەلەد) بۆ پاراستنی دیواری قەڵایە و هەمیشە تۆپەکانی ئامادەن • لای دەروازەی یالی قوللەکانی شا و پاشا و رۆستەم پاشا و خسرەو پاشا و ئەلماجی پاشا و سولەیمان پاشای لێیە ، قوللەی کەتانچی محەمەد پاشا لە ساڵی ١٠٥٥دا تازەکراوەتەوە • قوللەی دەروازەی ناوەڕاست، قوللەی ئەحمەداغای وان، قوللەی ئەسکەندەر پاشای چەرکەس کە یەکەمین والی ئێرە بوە ، قوللەی ئولامە پاشا ، قوللەی ئاتلی پاشا ، قوللەی یادێ ، قولله نەخشێن ، قوللەی فەلەمێت ، دیتسان قوللەی ئەلماجی پاشا ،قوللەی دەرگای تەورێز کەوتۆتە ژێر قەڵای ملەوشتر و بە بەردی گەورە لەسەر رەوەزێك بە حەوت هەشت توێ هەڵچنراوە و بە زمان باسی ناکرێ ، لە هەر یەکێکەوە بۆ ئەوی دێ رێگایێکی هاتوچۆ و یارمەتی گەیاندن بە ژێر بەردەکاندا هەیە کە تەنیا خۆیان پێی دەزانن •

قوللەی سەر دەروازە تۆپی زۆری هەیە چونکو مەترسی بۆ سەر (وان) هەمیشە لەم لایەوە دێ ، بۆیە دامێنی ئەملایەی قەڵا دیوارەکەی زۆر ئەستورە ، چل ئەشکەوتی قات قاتی هەیە • لە بەردەمی قوللەکانیشەوە

دیواری نزمی زۆر قایم هەن کە کونە مەتەریزیان تێدایە بەڵام تۆپیان بـۆ دانەندراوە ، لە ژێر دیوارەکاندا ڕاڕەو هەیە کە لەکاتی گەمارۆدرانا ئەگەر دوژمن بیەوێ خۆڵیان لەسەر ڕۆکا و بیانخنکێنێ بتوانن خۆڵەکە فرێ‌دەنـە دەرێ ، سێ لای ئەم دیوارانە لە دەروازەی یالێ‌یەوە تا دەروازەی تەورێز خەرەندێکی بۆ کراوە کە پەنجا شێست شەقاو پـانە بەڵام نزمـە چونـکو گەمارۆدرانی زەحمەتە لێرە یـەك گەز زەوێ بدەیتەوە دەگاتە ئاو ، بۆیـە سەنگەرهەڵکەندن ستەمە ، کاتی خۆی کە (ڕۆستەم خانی کەچەڵ) بە سوپای ئێرانەوە گەیشتە بەردەمی ئەم قەڵایە ، لە دوورەوە گڵێـکی زۆری هێـنا و وردە وردە ئەم گڵەی هێنایە پێش و لەشکر بەدوایدا تـا خەنـدەکی پـڕ کردەوە و چوە ناو مەتەرێز و گرتی • خەندەکی لای دەروازەی تەورێز زۆر گەورەیە ، سەد گەز پان و چل گەز قوڵە ، عەسکەرەکانی ئێرە هیچ لە دوژمن ناترسن ، تەنانەت لەکاتێکدا کە گەمارۆی ڕۆستەم خان حەوت مانگی خایاند، لەم حەوت مانگەدا تەنیا حەوت تۆپیان تەقاند ، تۆپێکی زەمانی سولەیمانخان ماوە دەمەکەی شکاوە پارچەیێکی لێ بۆتەوە تۆپەکەلی پێدەڵێن ، جارێکیان ئەم تۆپەیان هاویشت گوللەکەی کەوتە نێوان حەوت ئەفسەری عەجەم کـە پێکەوە دانیشتبوون و هەموی کوشتن ، جگە لەمە هەر دەرد و بەلاییکیش بێ یەکەمجار بەر قەڵای خوارەوە دەکەوێ •

جارێك پاسەوانانی قوللەی وان لەگەڵ قوللەکانی دیکەدا دەمقاڵێیان دەبێ ، کابرای قوللەی وان دەڵێ « وس بن ، ئێمە لە سەردەمی ڕۆستەم خانە کەچەڵدا قاتوقڕی کەوتە ناو قەڵاکەمانەوە گۆشتی پشیلە و تووتکە سەگمان دەخوارد ، خوشك و پور و منداڵەکانمان گۆشتی شەهیدەکانمانیان خوارد و لە پێناوی هەر بەردێکی قەڵادا هەزار سەرمان دا و ئەم قەڵایەمان نەدا بـە دەست دوژمنەوە ! » بەم جۆرە شانازێ بە خـۆیەوە کردوە ، بە ڕاسـتێ نەتەوەیێکی کەللەڕەقن • (ڕۆستەم خانە کەچەڵ) پاش حەوت مانگ گەمارۆ

بار و بارخانەی خۆی بەجێ هێشت و بەهەناسە ساردیَ گەڕایەوە ئێـران ، پالەوانەکانی (وان) شوێنی کەوتن تا لە نزیك (ورمێ) و (سەلماس) پـێی گەیشتن لەشکرەکەیان شکاند و چەند هەزار دیل و کەللەسەریان هێنایەوە ، بە ماڵ و تالاَنێکی زۆرەوە هاتنەوە کردیانە شایی و هەلپەڕین • عەجەمەکان لە ولاَتی خۆیاندا دەلێن « رۆستەم خانی سوپا سالارمان لە چـەند لاوە وانی بریندار کردوە ، ئاخریَ هەر نێچیری خۆیەتی ، » بەلاَم ئیشەللاَ قەت وا نابێ، چونکو هەر وەزیریَ هاتبێ شتێکی لە قایمەکاریَ قەلاَی وان زیاد کردوە ، تا ئەمجارە کە (مەلیك ئەحمەد پاشا) کرا بە سەرداری وان ، لە جێی قوللەی قەلاَی ژۆرق قوللەیێکی تازەی دروستکرد و دەرگای ئاسـنی تێخست و کونی لولە تۆپی بۆ هێشتەوە و لە چوارلاوە هەشت تۆپی باَیۆمزی بۆ دانا، ئەمە لە سالی ١٠٦٥ دابو •

جگە لەمە سەرپۆشێکی قایمیشی بۆ دەروازەی تەوریز دروست کرد و لە راست و چەپی دەروازەدا خەرەندێکی وای بۆ کێشا مەل نەتوانێ بەسەریدا بفڕێ ، پردێکی بەکرەداریشی خستۆتە سەر ئەم خەرەندە لە هیچ شوێنێـك وێنەی نیە ، هەمو ئێواران پاسەوان و پیاوە تایبەتی‌یەکان ئەم پـردە بـە گوریس و زنجیر هەلدەکێشنەوە و بە دیواری قەلاَیەوە دەنوسێنن تا بـۆ رۆژی دوایی دایدەنەوە •

**دەروازەکانی قەلاَی وان :**

چوار دەروازەی ئاسنی هەیە . لە هەمویان قایمتر دەروازەی تـەوریزە کە پێنج قاتە و پاسەوانەکانیان شەو و رۆژ ئاگادارن • لەدیوی ناوەوەی ئەم دەروازەیە بنی ملـە وشتر و بڕگەکـە ئاشگێڕێـك ئـاوی حەیـات لـە سەرچاوەیێکەوە دێتە دەر بۆ خان و مزگەوت و ماڵ و گەرماوەکانی شـار دەڕوا و چەند باخچەی حەوشی مالاَن پاراو دەکات و چی زیاد بێ دەچێتـە

دەرەوە ، سەرچاوەی ئەم ئاوە پەرستگاییێکی کۆنی لێیە ، پاسەوانەکانی دەروازە بۆ نوێژکردن دەچنە ئەوێ و ئاوی خواردنەوەشی لێ دێنن •

دوەمیان دەروازەی ناوەندە کە بەرەو باشور و قیبلە رۆ لە باخەکانی ئەردەمیت دەکرێتەوە و ئاسنی سێ قاتە . زۆر لە دەروازەی (باب ناسر)ی متیسر دەچێ ، ناوی ئەم دەروازەیە پڕە لە چەك و جبەخانە ، نزیکەی دوسەد پاسەوانی هەیە ،پردێکی قایم خراوەتە سەر خەرەندەکەی •

سێیەم دەروازەی (ئوغرن)ە ، ئەمەیان دەروازەیێکی بچوکە کەوتۆتە قوژبنێکی باخچەکەی سەرای پاشاوە و بەلای قیبلەدا دەڕوانێ ، ئەم دەروازەیە هەمیشە داخراوە و کلیلەکەی لای پاشا خۆیەتی • ئەگەر تەتەرێك یا نێرراوێکی کوردستان یا عەجەم بگات ، شەوانە ئەم دەرگایەیان بۆ دەکرێتەوە • ئەمەشیان پردێکی دار بەسەر خەرەندەکەیەوەیە و پاسەوانان پاسی لێ دەگرن •

چوارەم دەروازەی ( یالی )یە کە دەروازە چوار قاتە ئاسنەکەی دەڕوانێتە پشتەوە و لە هەر قاتێکدا دەرکەوانی چەکداری هەیە ، هەرچەندە ئەم دەروازەیە رۆی لە بەندەرگایە و کراوەیە ، چەکداری زۆرە ، تەنانەت کارگێڕی گومرگ و دەفتەرداریش چەکداری خۆیانیان هەیە ، سەر دیوارەکانی نێوانی دەروازەکان ئەوەندەی چەك و جبەخانە لە سەرە کە لە ژمارە نایێت • بەردەمی ئەم دەروازەیەش لەسەر خەندەکەکەی پردێکی تەختەی لێیە •

**بارستایی قەلای وان :**

لە دەروازە تەورێزی لای خۆرهەلاتەوە هەتا دەرواز یالی لای خۆراواوەی ئەم قەلایەی خوارێ بە دیوار و قوللە و دەلاقەکانیەوە پێنج

هەزار شەقاوی تەواوە ، جا ئەگەر قەلاّی ناوەوەشی لەگەڵ حیساب بکرێ دەکاتە یازدە هەزار شەقاو ، تێکڕا چوار هەزار ددانەی لێیە کە لە کاتی گەمارۆدرانا هەر ددانەیەی دوو زەلامی لەسەرە ، ئا ئێستا هەمو شەوێ لە حەفتاوسێ قوللەدا پێنسەد کەس خەریکی پاس گرتنن ، شەوانە بیست و چوار ئاغا و چاوەش بە جلکی شەوەوە دەگەڕێن ، ببینن پاسەوانێك خەوی لێ کەوتوە دوای تێسرەواندنی دوسەد تێلاّ خەبەری پاشاشی لێدەدەن تا بینێرێتە ئەو دنیا ، چونکو ئەمانە مەعاش و ئازوقەی باش وەردەگرن •

ئێرە نزیکەی چوار پێنج هەزار کەس بەگێ لێکەوتو و پیاوی ئازای پەڕیوەی ولاّتان و کاربەدەستی دورخراوەی تێدایە کە بەسەرە نۆرەی پاسیان دێتە سەر ، لەمانە یەکیان بمرێ فرمانەکەی دەدرێ بە کوڕەکەی ئەگەر منداڵ نەبێ • ئەم پاسەوانانە هەمو شەوێ بە چەکەوە پاس دەگرن ، ئەگەر هەواڵێکی دوژمنیان پێ بگا لەناو سندوقدا مەشخەڵی داگیرساو بە زنجیر شۆڕ دەکەنەوە و دنیا روناك دەبێتەوە • لە دوای نوێژی خەوتنان تەپڵخانە لێدەدرێ ، بەلاّم لەبەر ئەوەی سەرەوە زۆر دورە لە خوارێ باش نابیسترێ•

**حکومەتی قەلاّی وان :**

بەپێی قانونی سولەیمانخان (وان) ئەیالەتە ، یەکەمجار لە سەردەمی سولەیمانخاندا کە مەقبول (ئیبراهیم پاشا) ئێرەی گرت درا بە (ئولامە پاشا)• پاشان لە ساڵی ٩٥٣دا کە عەجەم هاتن و گرتیان سولەیمانخان خۆی هات گەمارۆی دا و بە دەستی (ڕۆستەم پاشا)ی سەرەك وەزیر داگیر کرا و درا بە (ئەسکەندەر پاشا)ی چەرکەس و پایەی وەزیریشی لەگەڵدا درایێ •

ساڵانە خاسەی میرییەکەی یازدە جار سەدهەزار و سیودو هەزار ئاقچەیە ، سێ هەزار عەسکەری جبەلەبەر لەگەڵی بۆ شەر دەچن ، پاشا هەمو ساڵێ چل هەزار قرۆشی لە محاکەمە و شەڕ و هەرای خەڵك دەست

دەکەوێ ، بەڵام مەلیك ئەحمەد پاشا هەزار کیسە زیاتری دەست کەوت •

لە ئەستەمووڵەوە ئاغایێکی زل دەکرێ بە ئاغای یەنیچەری‌یەکانی ئێرە کە لە سەردەمی ئێمەدا ( عەبدیێ ئاغا شـێتە ) بوو کە لە شـەش ئۆردووگادا سەرپەرشتیێ سێ هەزار یەنیچەری دەکرد ، ( یاسین چاوەش ) بۆتە ئەفەندی یەنیچەریەکان و جبەباشیشیان هەیە کە لە سێ قاوشدا هەزار جبەلەبەری لەژێر دەستایە • سەر تۆپچیێ ئێرە لە دوو قاوشدا فەرماندەی هـەزار تۆپچیێـیە ، ئەمانە لە رۆژی جەژن و هەینیێدا بۆ سامپیشاندان لەگەڵ پاشادا دێنە دیوان•

کوێخای پاشا و سەلام رێکخەر و سەرمیراوی شاریش فەرمانڕەوان . (شانی ئەفەندیێ) سەرپەرشتیێ دارایێ دەکا کە ٦٤٨٧ ئاقچەی هەیە و مـاڵی میری لەگەڵ سەد و پەنجا کەسـی بەردەستی خۆی لە حەوسەد فەرمانڕەوا وەردەگرێ و ئەو دەسکەوتە بەسـەر حەفتا قەڵا و مووچەخۆرەکانی میریدا دەبەشێتەوە و بۆی هەیە بە قەفتانی سەرەوە بێتە دیوانی پاشا . چاوەشی کوێخاکان ، ئەمینی چاوەشەکان ، چاوەشی کاتبەکان ، دەفتـەری تیمـار ، ئەمینی دەفتەر ، رۆژنامەچیێ ، حیسابدار ، موقاتەعەچیێ و مەوقوفـاتچیێ و هیێ دیکە • نۆ خەلیفەی دیوان لە لایەن سوڵتانەوە فەرمانڕەوان کە مەعاشیان ٦٠٩٩٩ ئاقچەیە ، لەناو ئەمانەدا کاتێ پاشـا دەچێت بۆ شـەڕ ، کوێخای زەعامەت و سوولەیمان بەگ قۆڵ ئاغای راست و قۆڵ ئاغای چەپ و ئـاغای عەزەب و ئاغای حەسار و قەڵاداری ژورۆ و قەڵاداری ملە وشتر و قەڵاداری خوارۆ و ئەمینی گومرگ و ئاغای خەرج و ئاغای دارۆخە و ئاغای شابەندەر و ئـاغای میرا و لەگەڵی دەچن ، ئەم (گەنجی ئاغا)ی میراوە ئاو بۆ نۆ هەزار بەند بەرێ‌دەکا و دەیەکیان لێ دەستێنێ و یەکێکە لە ئاغاکانی پاشا ، سـەد پیاوی خۆی لەژێر دەستایە ، دەسکەوتی بۆ پاشا شەش کیسە و بۆ خـۆی سێ کیسەیە ، جگە لە میراو (چوپلك)یش هەیە کە رێگاوبان و خەرەندەکان پاك‌دەکاتەوە ، حاکمی شەرعیێ هەیە کە دایرەکەی سێسەد ئاقچەییێیە ، بەڵام

پاش داکیرکرانەوەی وان لەلایەن پاشاوە بە پێنسەد ئاقچە دراوە بە مەلایێك• لە هەرێمەکانی (ئەردەمیت) و (وەستان) و (کوار) و (کواش) و (سۆرپ) و (ئامیق) قازی‌یەکانیان سالی دە کیسە دەرامەتیانە • مفتی حەنەفی هەیە کـە مفتی شافعی و حەمبەلی و مالکی لەژێر دەستایە و بۆ هەموو کێشە و هەراییك فتوا دەردەکەن ، لە هەر فتوایە دە ئاقچە دەستێندرێ ، نەقیبی ئەشرافیش هەیە ، نایبی شارێشی دێتە دیوانی پاشا ، ئەم نایـبە سـالی جـارێك بـە گوندەکاندا دەگەڕێ و داهات کۆدەکاتەوە ، وان سـەرداری یەنیچەری و کوێخای سوپای لێ نیـە ، ئاغای یەنیچەری فەرمانڕەوای یەنیچەریەکانە و لەناو سوپاشدا قۆڵ ئاغاکانی راست و چەپ فەرمانڕەوایی دەکەن •

**سوپـا و کارگێڕانی :**

راست ، چەپ ، کۆکللی ، رەبەنی ئێشتەجێ ، توپچی حەسار ، جبەچی، قەلاداری ژۆرو ، قەڵاداری ملەوشتر ، قەڵاداری ژێرو ، یاشلی ، حەسەنی ، حوسێنی ، ئاغای چاوەشەکان و ئەوانی دی • تێکـڕا وان کراوە بـە دوو ( تـوغ ) و بیست‌وچوار ئاغا کاری ، عەسکەرەکانی قـۆڵی راسـت زۆر ئازان و ئاغایان (سولەیمان بەگی خەزوری خسرەو پاشا)یە ، ئاغای قـۆڵی چەپ کوڕی دەمیرچی‌یە ، (داشلی) بەوانە دەڵێن لـە قـەڵا بەردینـەکەی سەرەوەدان و (باشلی)یەکان لە حەساری خوارەوەدان ، سەیر لەوەدایـە کە هەرچەندە ئەم دوو بەرەیە دوژمنی یەکترن ، هەر کاتێ دوژمنی دەرەوە رووی تێکردن دەبنە برای گیانی یەکتر و پیاوانە پێکەوە شەڕ دەکەن • چـاوەش و پاسەوانەکان و جبەچی‌یەکان • ئەمانە ئێشیان چەك‌سڕینەوە و پاك‌کردنەوەیە و توپچی‌یەکان و رەبەنەکان هەموویان ئازان •

بە پێی قانوون قەڵای وان شەشهـەزار قـۆڵی هەیـە ، (ئامێـق) و (ئەرجێش) و (عادلجەواز) و (ئەخلات) و (وانی خوارو) و وەستانیش شەش

هەزار قۆلیان هەیە کە هەمۆی دەکاتە دوازدە هەزار قۆڵ • پارەی ئەمانە لـە دەفتەرداری وان و خاسەی میری لە کواش و کوار و قۆتتەراتی ماسـتی و خەرج و گومرگی وان و خوێلێین • مەملەحە ــ و باجی بازاڕ و قەپان و باجی مۆش و باجی عەرەب و ئەرمەنی‌یەکانی بتلیس و باجی ئەو کەشتی و کەڵەکانەی بەسەر روباری مراددا دەرۆن و بە کورتی لە سێسەد و شێست پارچە بـاجی جۆربەجۆرە کە هەر ساڵە شەشسەد کیسەی رۆمی دەستێندرێ و دەیاندرێتێ، ئەگەر مەعاشیان یەك مانگ دوا بکەوێ دنیا بەسەر دەفتەردار و چل دایرەکەی دیکەو بیست و چوار ئاغاکاندا دەڕوخێنن و بە قیژە و هاوار دەچنە سـەر پاشا و ئاژاوە دەنێنەوە •

**فەرمانڕەوای سنجاقەکانی وان :**

بەپێی قانون فەرماندەی سی‌وحەوت سنجاق لە وان هەیە ، بـەڵام ئەو سنجاقانەی دانان و لابردنیان بە دەست حکومەتی عوسمانی‌یە بیستن وەکو : (ئەرجیش) ، (عادلجەواز) ، (مۆش) ، (بارگر) ، (گەڕگەڕ) ، (کسانی)، (هێزان) ، (سعرد) ، (ئاغاکیش) ، (شروی) ــ واتا شێروانی کوردان ــ ، کوردەکانی (قەتور) ، (قەڵای بایەزید) ، (بەردەع)، (ئەرەجك)، (کورلادێك)، (چۆپانلۆ) ، (شۆرگر) ، (دالەگێر) ، (زریقی) (سنجاقی وان) کە پاشای لێ دادەنیشێ • هەرچی خاسە و باجی ئەوانە هەیە هەمۆی دێتە وان • حەوسەد پارچە گوندی هەیە کە بە زەعامەت و تیمارەوە بەسـتراوە و دەیەکیان لێ دەستێندرێ •

**ئەو حکومەتانەی لابردنیان بۆ نیە :**

تیمچە حکومەتی (هەکاری) کە کەوتۆتە لای قیبلەی وان و لە نێوانی شتاق و هەستاندا ئەو خانەیە کە لە (جۆلەمێرگ) دادەنیشێ و خاوەنی چل و حەوت هەزار سەربازە ، هەمۆیان ردێن‌تاشراو ، چوار شانە ، زرتەبـۆز و

ناشیرین و ئازان ، وەکو هۆلەندی یەکان تەنیا لەسەر چەناگەیان نەختێ ریش دێڵنەوە ، سمێڵ قیتن و وەکو قازاقەکانی ئاخمێخ کاکۆلێکی تەنك بە ناوچەوانیانەوەیە ، کەللەی سەریان بە قەدەر مەنجەلێکە و زوربەیان ئاڵقەیان لە گوێدایە ، هەر یەکەیان چل پەنجا درەم نەنگ دەتەقێنێ ، ئەوەندە نیشانچین کیچ دەنگێون ، یەکێ قەلخانێکی کوردی یان بە پشتەوەیە و گۆپالێك بە دەستەوە ، مێزەرەکانی رەنگاوڕەنگی سەریان دۆ پەڕی تێ دەچەقێنن • زوربەیان چیلکەی گوێیان بە چەقۆ کون دەکەن و پەڕێکی شەهێن هەلۆ یا کەلەشێری تێرادەکەن ، جلکیان شال و شەپکە کە دامێنەکەی چین چینە ، کاڵەی پۆچەکلی ، پێنسەدی ، هەزاری ، سەدی و کەپکەپلی لە پێ دەکەن کە هەرتاکەی دۆ هۆقە قورسە ، وا رێ دەکەوێ لە کاتی شەڕدا قەلخانیان پێ نابێ کاڵەکەیان دادەکەنن بە دەستێ دەیگرن و بە دەسەکەی دێ خەنجەر یا شیر دەوەشێنن ، لە دە کەس پشت ناکەنەوە ، لە شاری وان وا بڵاو بۆتەوە کە یەکێك زۆر تۆزە بێ و پەلاماری خەنیمەکەی خۆی بدا دەڵێن «وەك چەلۆی هەکاری کاڵەی بە دەستەوە گرت و هات ! » هەکاری دە هەزار تفەنگچی لەم بابەتەی هەیە و لە کاتی شەڕدا دەیگەیێنێتە چل پەنجا هەزار ، بەلام ئەم دە هەزارەیان مەعاش خۆرن • بۆم دەرنەکەوت مەزەبیان چی یە •

**حکومەتی بتلیس :**

هێ خانی پایەبەرز عەبداڵ خانە کە لەمەوپێش باسمان کرد، عەشیرەتەکەی رۆژەکی یان پێدەڵێن ، ئەویش ئەوەندەی هەکاری عەسکەری هەیە •

**حکومەتی مەحمودی :**

ئەمان لە خۆرهەلاتی وان لە ناو چیاکانی یالچین دادەنیشن ، لەگەڵ خاکی عەجەم چیای (شاکدیکی)یان نێوانە ، لەولایانەوە قەلای قەتوری عەجەم هەیە • هەمو بەسەر یەکەوە شەش هەزار شیروەشێنیان هەیە کە

لە هەرە ئازاکانی کوردستانن و سوارچاکیشن ، چەند جار لە (سەلْماس) و (خۆی) و (ورمێ) لە سوپای شایان داوە و سەر کەوتون •

لە بەگەکانیان (برایم بەگ) لە قەلاّی (خۆشاب) دادەنیشێ و قارەمانە ، چەند جار خۆی فڕێداوەتە ئاگری شەڕ و بە سەربەرزێ هاتۆتە دەر • ئەم مەحمودی‌یانە بە ژماردە سەد و بیست بەگی سەرەك هۆزیان هەیە کە هەمۆیان خەلاّت لە برایم بەگ وەردەگرن • لەناو ئەمانیشدا خاکی میرێ و خەرج و زەعامەت هەیە ، لای قیبلەی ئەمان ولاّتی هەکارێیە و لەگەڵ جەنابی (شێر یەزدان) خانی گەورەی (هەکارێ) خزمن ، لای باکوریشیان قەلاّی وانە •

**حکومەتی پنیانش :**

ئەمانیش هەر مەحمودین بەلاّم حکومەتیان جیایە ، شەش قۆناخ لە خۆرهەلاّتی وانەوە دورە، بەگیان حەسەن بەگە و لە قەلاّی حەسەن دادەنیشێ، ولاّتەکەیان لای خۆرهەلاّت و باکور و باشوری بە سێ قۆناخ ولاّتی عەجەمە و لەگەڵ خانی ورمێ (چۆلاق سولْتان)دا سنوریان پێکەوەیە ، شەو و رۆژ لەگەڵ عەجەماندا شەڕە دەندوکەیانە ، شەش هەزار عەسکەریان هەیە ، بەلاّم چەندی بیری لێ کەیتەوە ئازا و بە دەست و بازۆن ، چەند جار پێشی سوپا پەنجا هەزار کەسێیەکەی خانی ورمێ و تەورێزیان گرتوە ، لە خاکی ئەمانیشدا خاسەی میرێ و تیمار و زەعامەت هەیە ، عەجەم ناوی ( غازی قڕان)یان لێناون •

گوایا لە کاتێکا (سولْتان مراد) بە سوپاوە چوبوە سەر (روان) ، عەجەمەکان لە لایێکی دیکەوە لەشکەریان ناردوە ، خانی‌پنیانش کە ناوی (میر عەزیزی شەل) بوە لە دەشتی سەلْماسدا بە هەشت هەزار کەسەوە پێش بە سێ هەزار عەجەمی (شاسەیوان) گرت و قڕانی تێخستن و چیان پێ بو

به تالآن هێنای ،لەو ڕۆژەوە ناوی (غازی قڕان)یان بەسەردا بڕا ، خوا یاربێ لە تۆرەی خۆیدا باسی وڵات و قەڵاکەیان دەکەین •

لە لای خۆرهەڵاتەوە (بەنێ قەتور) ، (بێرە دوسێ) ، (جۆلانێ) ، (دمدمێ) و (دۆمبلێ) پێنج حکومەتن کە بە قانونی سولەیمانێ سەر بە وان بون ، بەڵام کە (تەواشی سولەیمان پاشا)ی وەزیر تەورێزی گرت و قەڵایێکی گەورەی دروستکرد ، ئەم پێنج حکومەتەی لە وان دابڕێ و خستنیە سەر ئەیالەتی (تەورێز) ، پاشان کە عەجەم تەورێزیان گرتەوە ئەم پێنج حکومەتە لەم ناوەدا مانەوە • ساڵی ١٠٤٨ کە مرادخان مرد عەجەم سوپایان هێنایە ناو قەڵای قەتور و دەستیان کرد بە تێکدانی ئاشتینامەی مۆرکراو ، ئەم پێنج حکومەتە کوردەش بە ناچارێ شوێن عەجەم کەوتن ، چونکو باخ و زەوێ و کێڵگەیان لەگەڵیان سنور و هاوبەشە ، بەڵام ئەبونە پیاوی شا و هەر بە خۆش نشینێ مانەوە •

لەسەر بڕیاری سولەیمانخان ، هەر کاتێ سوڵتانیعوسمانێ بەسەر وڵاتی واندا لەشکر بنێرێتە خاکی عەجەم ، بەگلەر بەگی وان دەبێتە پێشەنگی سوپا، خانی هەکارێ و بەگی مەحمودێ دەبنە چەرخەچێ ، قارەمانەکانی پنیانش دەبنە قەرەوڵی ڕاست و چەپ و فرمانیان ئاگاداربون لە کاروباری دوژمنە• دوای ئەمانە پاشای وان و ئنجا وەزیرەکانی عوسمانێ و لە پشت ئەوانەوە سوڵتان خۆی یا سەرداری مەزن دەکەوێتە ڕێ ، ئەمجار متیری میرانەکان دێن و لە دوای هەمویان خانی بتلیس بە خۆی و سوپایەوە دەبێتە بنکڕ و ئەرکی سەرشانی ئەوە کە نەخۆش و لەپێکەوتوەکان و ئەوانەی هەڵدێن هەڵیان گرێتەوە و چی پێویستە لەگەڵیان بکرێ •

سوپای ئاوا یەکگرتو لای ڕاستی بەگی پازدە سنجاقی کوردستان وەکو (سعرد) ، (شروێ) ، (زرێقی) ، (کارنێ) ، (هیزۆن) ، (گەزگەز) ،

( ئـاغاکیش ) ، (کسان) ، (مەکس) ، (بەردع) ، (لادیك) ، (ئوزەجـك) ، (دالەگەڕ) ، (چوپانلق) و (بەنی قەتور) بە تەپڵ‌لێدان دەڕۆن و لای چەپیش سوپای پازدە سـنجاق کوردی دیکەی وەکو (لامۆس) ، ( عادلجەواز ) ، (ئەرجێش) ، (بارگرێ) ، (بایەزید) ، (ئاقچە قەڵا) . (سورەکێو) ، (قەرەجە قەڵا) ، (کوردی ماکۆ) ، (زیادین) ، (ئاباغای) و (شـتاق) دەڕۆن • ئـەو نەفەرانەی لەناو قەڵاکاندان قانون وایە نیوەیان بچن و نیوە بمێننەوە ، قەڵای وان خۆی شەشهەزار عەسکەری هەیە و قەڵاکانی دیکەش شەش هەزاریان دەبێ ، ئەمانە نیوەیان دەچن • پاشای وان بە جبەلەبەرەکانیەوە سێ هەزار عەسکەرێکی دەبێ و هی سنجاقەکانیشی بێنە سەر تێکڕا چل و هەشت هەزار عەسکەری هەڵبژاردەی ئازایان لێ پێکدێ •

**مزگەوتەکانی قەڵای وان :**

پەرستگایێك لە قەڵای ژورۆی واندا هەیـە گوایا لە زەمانی ( داود پێغەمبەر)دا دروست کراوە ، پاشان کە حەزرەتی ئەبوبەکر بە باڵوێزی هات کرا بە مزگەوت • چەند شا و خونکار دەستاو دەستیان پێ کردوە و هەر بە مزگەوتی ماوەتەوە ، تا لە ساڵی ١٩٤٠دا (سوڵتان سولەیمان) ئاوا و بەرینتری کرد و ناوی مزگەوتی سولەیمانخانی لێنـا ، مزگەوتێکی گەورەیە . یـەك دەرگا و یەك منارەی هەیە ، ئەو ساڵەی بۆلەرزە لە وانی دا منارەکەی ڕوخا، عومەراغای سەرۆکی یەنیچەریەکان منارەیێکی زۆر چاکی بۆ کردەوە کە هەتا کاتی نیوڕۆیان لوتکەی لە ناو هەوردا بزرە ، قەڵاکەی ناوەوە لـەمە زیاتر مزگەوتی نیە ، هەمو پەنجەرەکانی بەسەر دامێنی شار و دەشتی ئەردەمێت و باخ و باخچەکاندا دەڕوانێ ، جگە لەمە ئەو مزگەوتی (گەورە)یەی لە قەڵای خوارەوەیە دەسکردی شا جیهانی ئـاق قۆینلوە و لەمە گەورەتر مزگەوتی تێدا نیە ، ناو مزگەوتەکە گومبەزێکی گەورەی لەسەر کۆڵەکەی ئەستور بۆ دامەزراوە کە هێجگار بلندە ، وەستاکە تەقەلای زۆری لەگەڵ داوە و گەلێك

نەخش و نیگاری لەسەر مەڕمەڕ هەڵکەندراوی بۆ داناوە ، دەرك و دیواری بە تۆغلەی رەش و سور لێی نوسراوە ، مزگەوتێکی کۆنە و لەبەر ئەوەی بە پارەی حەلاڵ دروستکراوە بۆن و بەرەکەتی زۆرە ، وێنەی خەتەکانی سەر دیواری ئێرە لە قەلای حوموسیش هەیە ، مینبەر و میحرابەکەی بە مۆرقی رەش و سپی و سور و بەردی بە قیمەت نەخشاوە ، منارەکەی هەند شیرینە تەماشای کەی • بە کورتی ئەوەندە جوان و دلڕفێنە لە هیچ کوێ وێنەی دەس ناکەوێ و جێگایێکی پیرۆزە، لە درەوەی مزگەوتەکە شوێنی خوێندن و حوجرەی فەقێیان هەیە •

مزگەوتی ( خسرەو پاشا )ی وەزیری سولەیمانخان ، هەر ئەم پاشایە زێڕنگەرخانەی بتلیس و قەیسەریەیە بەناوبانگەکەی و خانی گەورەی ڕێگای ئووای دروستکردوە ، ئــەم مزگەوتەشی لــەکاتی فەرمانڕەواتی وانــدا بنیاتناوە و هەمو گومبەز و ژورەکانی بە مزی ئاسمانیڕەنگ داپۆشیوە و گەلێك هونەر و وردەکاری تێدا بەکار هاتوە ، ئالای سەر منارەکەی زێڕی ساخە و کە هەتاو لێی دەدا ئاوی چاو دەبا ، لە هەر چوارلاوە پەنجەرەکانی بلور و شوشەی تاشــراوی تێ گیراوە ، لە تەنیشــت مزگەوتەوە حوجرە و مەدرەسەی لێیە • دەرگای ناوەڕاستی لە نزیك سەرای پاشاوەیە ، هەمو هەینییێك پاشاکان بۆ نوێژ دێنە ئێرە •

جگە لەمانەی باسکرا ، وان جێگای خۆش و گەورەی نیە ، مزگەوتی دەروازەی تەورێز پەرستگاییێکی کۆنە و نەزانرا کێ دروستی کردوە، ئەویش حوجرە و فەقێی هەیە ، مزگەوتی ( دەروازەی ئەسکلێپ ) عەباس ئاغا ناوێك دروستی کردوە •

**مەدرەسەکانی :**

مەدرەسەی مزگەوتی ئولو ، مەدرەسـەی خوڕخوڕە ، مەدرەســەی

خسرەو پاشا ، مەدرەسەی دەروازەی تەورێز ، مەدرەسـەی عەباس ئاغا ، مەدرەسەی چیا چەلەبێ •

**قورئانخوێندن :**

لە دوو شوێن جێگای قورئانفێربوون هەیە ، یەکیان لە مزگەوتی ئوولوو و ئەویتر لە مزگەوتی خسرەو پاشا ، بەلام چونکو قوتابیان کەمە ناخوێندرێ، لە هەموو مزگەوتەکاندا دەرسی عیلمی تازە دەخوێندرێ ، بەلام وەکو ولاتی رۆم خوێندنگای نوێی نیە ، مەلای موسـلیم و بوخاری زانی زۆرە کە حەدیسەکانیان لەبەر کردوە ••

**قوتابخانەکانی :**

نزیکەی بیسـت قوتابخانەی منداڵی ئەبجەد خوێنی لێیـە ، منداڵە زیرەکەکانی زۆر جوان فارسێ دەخوێننەوە •

**تەکیەکانی :**

تەکیەی ( خواجەکانی رۆم )ی بەناو بانگە •

**کانێیـەکانی :**

لە سەروچاوە ناسراوەکانی وان ، کانی خوڕخوڕە و چوار کانێ و کانێ خسرەوپاشا ناویان هەیە کە لەناو شاردان •

**گەڕەکی ئیسلامەکان :**

لە گەڕەکە ناسـراوەکانی : گەڕەکی پاشـا ، گەڕەکی خوڕخوڕە ، گەڕەکی مزگەوتی ئوولوو ، گەڕەکی سەرچاوە ، گەڕەکی ئەسکەلە ، گەڕەکی دەروازەی ناوەڕاست ، گەڕەکی دەروازەی تەورێز •

**خانـوبەرە گەورەکانی :**

چل و پێنج سەرای ئاوەدانی هەیە ، لەوانە لــە دێوی ناوەوەی قەڵای ناوەڕاستا نزیك بە مزگەوتی خسرەوپاشا ( سەرای پاشا ) هەیە کە بریتییە لە چــل ژووری رازاوە و هۆڵ و دیوەخانی خــوارەوە ، دیوارەکانی وەکو قەڵایە و پڕ لە باخچە و دەروازەی تایبەتی و کۆشکی بەرز و گەرماو لەناو ، سەرایێکی گەورەیە ، ساڵی ۱۰٥٥ دروستکراوە •

کۆشکی خەوەرنەق کە سولەیمان پاشا دروستی‌کردوە و ژووری تایبەتی پاشای لێ کراوە و ساڵی ۱۰٥۷ی لێ نوسراوە •

کۆشکێکی بەرز لە بن قوللەی سەرەوەیە لە عومر پاشازادەی کەتانچی لەگەڵ ئاوەدانکردنەوەی وان دروستی‌کردوە و ساڵی ۱۰٥٦ی لێ نوسراوە، لە ناو ئەم سەرا گەورەیەدا چل پەنجا ژوور لە قاتی‌خواری و مەیدانێکی زۆر فراوان لە ناوەڕاستا • پەنجەرەکانی لای خۆراوای بەسەر باخێکی وەکو بەهەشتا دەڕوانێ • بەردەمی دەروازەکەی مەیدانی دەرەوەی ســەرایە کە ( مەلیك ئەحمەد پاشا ) هەموو رۆژ لەوێدا تــەپڵ لێدەدا و یاری جلیتبازی دەکرێ و ئاغاکان سوارچاکی خۆیانی تێدا دەنوێنن •

لە هەر چوارلای ئەم سەرایە بە خوار و ژووری دوو قات شەشسەد ژووری تێدایە ، دەروازەیێکی بەسەر بازاڕدا دەڕوانێ کە شەو و رۆژ پاس دەکرێ•

جگە لەمانە لە خوارەوە سەرای حسێن ئاغا ، سەرای قازی ئەفەندی ، سەرای کوڕی دەمیرچی ، سەرای چیا چەلەبی ، سەرای کوڕی جندەدان ، سەرای جەعفەراغای خادم ، سەرای شانی دەفتەردار •

لەمانە بگەڕێتەوە لە قەڵای خوارەوەدا هەشت هەزار و هەشسەد خانوو هەیە ، هەموویان خشت و گەچکارین ، زۆریان دوو نهۆمن ، جادەکانی پاك و خاوێنن • سێ گەڕەکی ئەرمەنییەکانی لێیە کە خزمەتچی قەڵان و لە جیاتی

سەرانە هەر شوێنێکی قەڵا پێویستی بە چاك کردنەوە بێ ئەوان دەیکەن ، لەمانە زیاتر ئێرە مەسیحی لێ نیە ، ئەرمەنی‌یەکان بازرگانی دەوڵەمەندن •

**خانەکانی :**

خانی گومرگ ، خانی ئەحمەد پاشای کورد ، خانی قەپان •

**قەیسەری و بازاڕی :**

قەیسەری‌یێکی زۆر ئاوەدانی هەیە هەمو شتێکی لێ دەست دەکەوێ ، بەڵام بازاڕی مزگەوت و بازاڕی خسرەو پاشا و بازاڕی قۆندەرەفرۆشانی زۆر قەڵەباڵغە •

**روبار و سەرچاوەکان :**

چیاکانی وان زۆر کانی‌یان لێ هەڵدەقوڵێ و دێنە خوار و دەبنە رۆبار و لە گەڕەکی خوڕخوڕە ئاش دەگێڕن • لە ناو دەروازەی تەورێزدا کانیاوێك دێتە دەر ئاوەکەی زۆر خۆشــە ، یەك بەرخ بخۆیت و لەم ئاوەی بەســەردا بکەی دەی‌توێنێتەوە • قوڵلەی ئاودارخانە جۆگایێکی پێدا دێ کە لە بورجی ژوروەوە بە ناو بەردانداا دێتەخوار • لــە بەرەوژورتر بورجێك هەیە کــە چاودێری ئەم ئاوەیە و تۆپە زلەکانی وەکو دڕکی ژوژك ئامادە وەستاون ، جۆگەیێکی دیکە لە باکوری چیا هەیە و قوڵلەی ئاو بۆ پاراستنی داندراوە ، ئەو ئاوە لە بورجی سەرەوە و خاکی ســوڵتان دێتە خوار و لە هەمو سەر ڕێگاکانیــدا چێن چێن تۆپی باڵیۆمز داندراوە ، خــوارەوەیان مێشــە و زەلکاوێکە کەس ناوێرێ خۆی لێدا ، چونکو ئەو هەمو تۆپە ڕێگای پیاو هیچ رێی باڵندەش نادەن بە سەریا بفڕێ •

سەرو خواری وان بە تێکڕایێ سەد و شێست تۆپی هەیە کە هەمویان لولەدابڕاون و گوللەی دە هۆقەیێ دەخۆن •

**گەرماوەکانی :**

گەرماوی ( سوڵتان ) لە نزیك بازاڕی مزگەوت زۆر خۆشـــە و ئاوو هەوای سازگارە • گەرماوی ( جوتە )و گەرماوی ( نەخشتین ) لـــە نزیك دەروازەی تەوریز و ( چاڵەگەرماو ) هەرە بەناوبانگەکەیانن ، بەپێی راپۆری گەورەکان هەمو مانگێ شەششەد کەس دەچنە ئەو گەرماوانە ، لەبەر ئەوەی خەڵکی وان زۆر بە دەمار و توڕە و خاوەنی غیرەت و نامو‌ســـن ، ئافرەتیان ناچێتە سەیران و شایی و میوانی ، مەگەر ئـــەو رۆژەی بمرێ لاشـــەی لە حەوشەی ماڵ بێتە دەر ، بۆیە لە زوربەی ماڵەکاندا گەرماوی تایبەتی هەیە •

پاش نیوەڕۆیان پیـــاو ناچنە گەرماو و تەرخان دەکرێ بۆ ژنی ئـــەو ماڵانەی گەرماوی ماڵیان نیە ، ئەویش رێگای تایبەتی هەیە بۆ پێداڕۆیشتنی ژنان کە لەو ماوەیەدا نابێ ئەو کۆلانانە پیاویان پێدا بڕوا .یەك پیاو بە رێگای ژناندا بڕوا ســـزایێکی خراپی دەدرێ • ئـــەم خەڵکە ئەئاوا ژنی خـــۆیان دەپارێزن •

**شێوە و رەنگ‌وڕۆی خەڵکی وان :**

ئەو برادەرانەی من بـــە خزمەتیان گەیشـــتم هـــەرچەندە زۆر پیر و پەك‌کەوتە نەبون رەنگی دەمو چاویان گەنم ڕەنگ و مویان ماش‌و برنجی بو، هەتا پیرتر بن ئـــازا و توڕەتر دەبن . لاوەکانیان بـــۆ شـــەڕ هاندەدەن ، گەنجەکانیشیان گەنم رەنگن و تەڕوتازە و چاو جوان و قسە خۆشن ، خوا ئاگادارە من ئافرەتیانم نەدیوە بەڵام وەکو بیستومە زۆر جوان و بە ناموسن. کیژەکانیان لە باوك و برای خۆیان بەولاوە چاویان بـــە پیاو ناکەوێ • ئەو برادەرانەی من لێرە ناســـیاوتیم لـــەگەڵ پەیـــداکردن چیاچەلەبی و خـــادم جەعفەراغای برای و حوسێن ئاغای قۆڵ ئاغاسی و کوڕەکانی و ئەوانی دیکە بون • هەرچەندە ئێرە بە هۆی ئاوو هەوای سازگارەوە پێویستی بە پزیشك

نابێ ، بەڵام لەبەر زیرەکێ و لێهاتویێ خەڵکەکەی حەکیمیشیان لێ پەیدابوە، لەمانە (مەسعود چەلەبێ) لە لێدانی دەمار (نەبز) زانیندا بێوێنەیە ، (شێخ بای چەلەبێ) دوکتۆرێکە لە (ئەتینا)ش هاوتای نیە ، برینکاری چاکیشیان هەیە •
لە شێخەکان شێخی مزگەوتی ئۆلۆ پیاوێکی دوعا قبوڵە •

**نوسەر و شاعیر :**

یەکەم کەس شای شاعیران ( شانی ئەفەندێ)یە کە لە دەریای زانیارێیەکاندا مەلەوانە ، جگە لەو ( وانێ چەلەبێ ) و (مێر سوپەهری)یش لە شاعیرە ناسراوەکانن •

**وەلێ و دێوانەکان :**

سوڵتانی باڵولان ( وێسف دەدە ) هەیە کە لە ناو قوڵلەی دەروازەی ئوغرۆنی پاشادا دەنوێ ، پیاوێکی ئەوەندە بە نرخە گەلێك کەرامەتی لێ بیندراوە ، لە وشەی « وێسف نانی دەوێ » زیاتر هیچی بە دەمدا نایێ • رۆژێکیان هەر لە خۆیەوە دەستی پێکرد « لێدە لە خان ، بکوژە خان »ی دەگوت و دەگوتەوە ، زۆری نەخایاند هەرای بتلیس رۆی دا و لەو هەرایەدا چەند هەزار عەسکەر بەردەمی شێر کەوتن و کوژران •

**جلك و پێڵاویان :**

زیاتریان چۆخە لەبەر دەکەن و چەکمەی سەرحەدێ لە پێ دەکەن ، کەوڵی سمۆر دەپۆشن و پشتێنێکی هەریری سۆك دەبەستن و خەنجەرێکی لەبەر رادەکەن ، مێزەر و تەپلە قەیفەکانیان زۆر زلە ، ژنان بە تێکڕایێ جزمەی زەرد هەڵدەکێشن و ملیان بە خشڵی زێڕ و زێو داپۆشیوە •

**ناوی پیاوان :**

پەهلەوان ئۆغلێ ، چەندەدان ئۆغلێ ، دەمێرچێ ئۆغلێ ، بەشارەت

ئۆغلی ، عەلیشار ئۆغلی ، قلیج ئۆغلی و کەرەمەددین ئۆغلی ناویان هەیە ؛ هەروەهاماللیچیا ، رۆستەماغا ، بورهاناغا ، تۆغراغا ، ئەسعەد بەگ و قەزنەفەر بەگیشیان هەیە •

**ناوی کیژ و ژنەکانیان :**

ئایشە ، فاتمە ، کولسوم ، ئەسماخان ، ئومەهان ، سەلیمە ، سالم ، کالمە ، کامیلە ، ئەسماخانم ، پەریبۆی خانم ، هوما و میسکبار ناویان هەیە•

**خولامەکانیان :**

ئوسف . ئەورەنگ . چاردی . جولنەی . هەقویردی ، چومەز ، زال، ئەسکەندەر . قوباد ، شوغار . سەروەر ، خوڕەم . لەوەند ، ئەلوەند ، سیامی ، پەرویز . شوکرولڵا ، قاسم و شاقران ناون •

**کەنیزەکان :**

دلفگار ، مردەجان ، خەتمە . وەرەقە ، شاکرە ، هیند . ماهیە . دوڕییە، جەوهەر ، ئوهما ، سەروی بۆی . جان بای ، دلارام ، پەرچینە . پەریشان ، جان نیسار . روکایە ، وەسیمە ، خالیسە ، زۆزان و شایخوبان •

ئێرە بە قسەی ( عەلی قۆشچی ) سەر بە ئیقلیمی هەژدەهەمە بە پانی ، بەلام خانی بتلیس دەلێ ناوەندی ئیقلیمی سێیەمە و رۆی لە خۆراوایە •

**کلیساکانی :**

کلیسای گوندی (ئەسکەلە) بە ناوبانگە . کلیسای (بەلێنم هەیە) لە دورگەی ناو دەریاچەدا و کلیسای (درك) لە خۆرهەلاتی وان •

**دانەویلە و کشتوکالی :**

میوە و بەرهەمی زۆرە و هەرزانە ، حەوت جۆرە گەنمی هەیە ، حەوت

جۆره جۆی هەیه له رەش و سپی و چەور و قەڵەو، پاقله و نۆك و دانەوێڵەی زۆر زۆره •

**پیشه و دەسکردەکانی :**

وەستای بەنا و موهەندیسی وای هەیه هاوتایان مەگەر له سەقز دەستکەوێ ، بەرگدرۆی ئێره ئەوەنده شارەزان شوێنی دەرزی و تەقەڵی قوماشەکه لێك ناکرێنەوه ، دوکانەکانیان پاك و خاوێنن ، زیندروەکانیان زۆر وەستان •

**کار و کاسبی‌یان :**

خەڵکی وان شەش پایەن ، یەکەمیان مەعاش خۆری پاشان که له قەڵادا کار دەکەن و نابێ خەریکی هیچ کاسبی‌یێك ببن مەگەر له ناو شاردا ببن به بازرگان •

هەندێکیان دەچنه وڵاتان شتومەك دێنن و دەیفرۆشنەوه • هەندێك کاری دەستی دەکەن ، هەیانه دەفتەردارن به قەڵەم شت دەنوسن و له خزمەتی میری‌دان • هەندێ مەلا و فەقێن و بەشێك باخەوان و خزمەتکارن •

**میوه و خواردن و خواردنەوه :**

نانەگیا ، ئاوی رازیانه ، کولێچەی خاسی و سەمونی سپی ئێره له هیچ کوێ نیه ، نانی لەواشەی وەك گوڵ سوروسپی ، نانی به قەیماخ ، بۆرەکی کەو ، شۆربای ماستاو ، شۆربای قیرتلی و سێو و قورونفلی زۆر خۆشه •

له سەوزەکانیش کەلەمی وان له هەمو دنیادا بە ناوبانگه که دوانی باری وشترێکه ، گەڵای زۆر تەنکه و یەکی بە قەدەر ورگی فیلێك دەبێ ، مەعدەنوس و کەرەوز و کولەکەی درێژ و پیواز و شوتی زۆر باشی هەیه • دوازده چەشنه سێوی هەیه وەکو تەپکانی ، جانگوڵی ، سیلانی ، زافەرانی و

شامی کە لاستور و ئاودارن • ئەم وانە ئەوەندەی سێو هەیە کە ڕۆژانی سەیران شەڕە سێوی پێ دەکەن • شەربەتی هەنگوێنی چیای ورەك گیان تازەدەکاتەوە ، ئەم شەربەتە دارچینی تێکەڵ بکرێ و سێ ڕۆژ بمێنێتەوە پیاو سەرخۆش دەکا ، شەربەتی ئاوی شلە و شەربەتی ڕێواس و شەربەتی سێو لە خواردنە خۆشەکانی ئێرەن •

**خانوبەرەکانی :**

لە زەمانی کۆندا بە تەنیشت مزگەوتی ئۆلووە سوڵتان جیهانشا خانوبەرەیێکی بۆ میوان و ڕێبوار داناوە ، بەڵام چونکو ئێستا هەمو ماڵێك دیوەخانی هەیە ئێرە کەس ڕوی تێ ناکا • خسرەو پاشاش خانوبەرەیێکی خۆشی بۆ مەلا و زانا و دەروێش و هەژاران کردوە کە ساڵ دوازدە مانگ هەرچی ڕوی تێکا هەمو جۆرە خواردنێکی دەدرێتێ و خەرجەکەی والی وان دەیدا •

**ئاژەلی :**

لە دنیادا گامێش وەکو گامێشی (ئەدەنەی ئەنەدۆڵ) و ( سەرەزی ڕۆمێلی) و (گامێشی وان) لە کوردستاندا زل و کەتە و بەسام نی یە کە ئەوەندەی فیلێك دەخۆن ، ساڵێك دایانبەستن لە فیل زلتر دەبن • خەلکی وان لە ڕۆژی نەورۆزدا ئەم کەڵانە و ئەسپی ڕەسەن و وشتر و بەرانی دابەستراو دێننە دەر و بە شەڕیان دەدەن و پێیان رادەبوێرن •

**سەیرانگاکانی :**

جگە لە باخەکانی (ئەردەمیت) نزیکەی بیست سەیرانگای دورونزیکی هەیە کە شیاوی ئەوەن پیاو بیانبینێ ، یەك لەوانە بە مەودای نوپهاوێژێك لە خۆرهەڵاتی وان (بەردی ژوشکە سپی)یە و لەولاترەوە (گوندی یالی) ،

(ئالەمەلێك) ، (گوڵەزەرد) ، (سەرزۆبار) ، (مێرگی قەرەقاسم) ، (سەکۆی مرادخان) ، (باخەکانی ئەردەمێد) ، (بەندی میرێ) ، (بەنـدی مـاسێ) ، (قۆرخی خۆشاب) ، (چیای ورك) ، (خـیابانی نـکی بەردێـر) ، (دێـری ئەندەرۆنەر ) لە سەیرانگا بەناوبانگەکانی ئێرەن •

**باخەکانی :**

لای قیبلەی قەڵای وان کە لە گۆڕستانی بەر خەرەندەکە تێدەپـەڕێ تا دەگاتە ئەردەمێد بە پانایێ و درێژایێ هەشت سەعات ڕێگا باخ و باخات و خیابانی گوڵستانێکە بە پێی دەفتەری میراو بیست و شەش هەزار بـاخە • ئەوانە دەیەك دەدەن بە میراو کە ئاویان بداتێ ، نەشارەزا بکەوێتە نـاو ئەو باخانەوە بزر دەبێ ، هەمێ باخێك حەوز و پلۆسکێکی لە ناوەڕاستایـە و کۆشکێکی خۆشی لە لایێکەوە بۆ کراوە• لە باخە هەرە خۆشەکان باخی مالی چیا چەلەبێ و باخی شێرەك و باخی سولەیمان بەگە •

**زیارەتگاکانی :**

قسنی ( غازی خسرەو پاشا ) کە لە حەوشەی مزگەوتەکەی خۆیـدا نێژراوە ، (مێری میران محەمەد تسکلی پاشا)ش گۆڕی لێرەیە کە بە دەستی کوردێك کوژراوە ، لە کاتێکدا لە دەشتی سەراو ویستویەتی لـە نـاکاو پەلاماری سوپای ( شا ئیسماعیل )بدا کوردێکی یەزیدێ [٢٠] بـە دەستێك پشتێنەکەی گرتوە و بە دەستەکەی دێ بە خەنجەر ونجڕ ونجڕی کردوە ، پیاوەکانی پاشا کوردەکەیان لەتوپەت کرد بە جۆرێك کە دەستێکی هەر لەبەر کەمەری تسکلیدا بەجێ ما و پێکەوە نێژران • (جەعفەراغای خادم) کە خۆی یەکێکە لە بینەرانی ئەم بەسەر هاتە ، وای بۆ گێڕامەوە :

---

(٢٠) بۆیە یەزیدێ پێ دەڵێن چونکو پاشای کوشتوە .

لاوێکی کورد گیرابو. باوکەکەی هاتە لای تسکلی پاشا و لێی پاڕایەوە گوتی «پاشا کوڕی من بێ تاوانە ، هەر ئەم کوڕەم هەیە . مەیکوژە و وەجاخم کوێر مەکەرەوە . ئەگەر کوڕەکەم بکوژی لە بارەگای خوادا بە دەستی یەخەو بە دەستی کەمەرت دەگرم ! » پاشا گوێی نەدایە ، بە کاری خوا وەکو کوردە گوتبوی وابو . پاشا کوژرا و دەستی کوردەی لەبەر پشتێندا بەجێ ما .

( قوربان بابا ) لە ناو دەروازەی قەڵای ژورودا نێژراوە . ئەم پیاوە ئیمامی ئەبوبەکری بە چاوی خۆی لەناو ئەم دەروازەیەدا دیوە و دواندویەتی، بۆیە چل ساڵ لەم بەر دەروازەیە ژیا و بەجێی نەهێشت . کە مردیش وەسیەتی کرد لەم جێ نەزەرگەیە بنێژرێ .

قەبری ( حسێن پاشای جانپۆلاد زادە ) کە وەزیری ( محەمەد خانی سێیەم ) بوە و کراوە بە فەرمانڕەوای وان لێرەیە . ئەو کاتەی ( سەنان پاشای جەغالە زادە) لە شەڕی (تەوریز) شکا و بە پەلەپرۆزە خۆی دەرباز کرد و گەیشتە ( وان ) ، ئەم جانپۆلاد زادەی شەهید کرد لەسەر ئەوەی کە گوایا یارمەتی نەداوە .

با بێینەوە سەر باسی مەبەست : کە (مەلیك ئەحمەد پاشا) گەیشتە وان ، بڕیاریدا ئەو هەمو گڵ و خۆڵەی (تەیموری لەنگ) لەبەر قەڵادا خڕی کردۆتەوە ، فڕێی بداتە دەریاوە . نامەی بۆ بەگ و فەرمانڕەواکانی وان نارد، ئەوانیش هەمو (بەسەرچاو)یان گوت و ڕۆژ بە ڕۆژ هەرلافاوی خەڵك بۆ دەهات ، خواردنیان بۆ سوپای کوردستان دێنا و دیاری بۆ پاشا و خۆشیان دەمانەوە، تا وای لێ هات حەشامەت ئەوەندە زۆر بو لەمسەری ئۆردوگا تا

ئەو سەری بە دوّ سەعات نەدەبڕایەوە ، تەنیا چێشتکەر و نانەوا و مدبەقچیّ نزیکەی سێ هەزار خێوەتیان هەبو •

پاشا هاتنی ئەم خەڵکەی زۆر پێ خۆشبو ، جگە لە دڵنەوایێ کردنیان رۆژی دوّ جاریش سەرەك هۆز و فەرمانڕەواکانیانی بانگهێشتن دەکرد ، دوای نان خواردن دەیانکردە هەرا و دەستدەکرا بە خۆڵ ڕشتنە ناو ئاو ، سوپای کوردستانیش وردە وردە خڕ دەبۆوە • خانی هەکاریّ خۆی نەهات بەڵام کوێخای خۆی (مەلا محەمەدی شتاقیّ) بە شەشهەزار شەڕکەری چەلۆوە نارد و دیاریّ چاکیشی پێدا ناردبو • بەگی مەحموّدییان نە خۆی هات و نە یارمەتیّ نارد ، عەبدالخانی بتلیسیش هەروا ، پاشا ئەمەی زۆر پێ ناخۆش بو ، (ئەحمەداغای ئەرغەنیلیّ) بە نامەیێکی برایانەوە ناردە لای خان، کە ئەو نامەیە دەگاتە خان و دەیخوێنێتەوە دەڵێ « ئەسپی ئێمە لە وان ئاو ناخواتەوە ، » ئاغای نامەبەریش لە بتلیسەوە بە دوّ شەو و دوّ رۆژ دەوری دەریاچەی وانی دابو بە (قوسقون قڕان)دا هاتەوە لای پاشا و بۆی گێڕایەوە، پاشا وەکو پوّشوّی بەردەستێ گڕی گرتبو نە دەکوژایەوە •.

# هۆی لەشکرکردنە سەر خان

شتێ خوا بیەوێ بیکا گەڕانەوەی بۆ نیە ، ئەو رۆژە پاشا لای (عەبدی ئاغا)ی فەرماندەی یەنیچەری‌یەکان بانگهێشتن کرابۆ ، هەمۆ پیاوماقوڵ و ئـاغاکانی وان و بەگە کوردەکان لەوێ کۆبۆنەوە ، پاشـا رای ئـەوانی وەرگرت ، تێکڕا لە دەست خان هاواریان لێ‌هەستا و گوتیان « کابرایێـکە بێدین ، خوانەناس ، داوێن‌پیس ، ئەستێرەوان و درۆزنێکە چل ساڵە خوێنی حەڵاڵە ! » ئەو خەڵکە بێ‌ویژدانانە ئەم هەمۆ بوختانانەیان بـە خـان کرد کە ئاگای لە هێچ نەبۆ [21] ، بەکاری خوا ئەوان لەم قسانەدا بۆن کە دەرکەوان هاتە ژۆر وگوتی « گەورەم نامەیێك لە والێ (ئەرزەڕۆم) (تاوخچی مستەفا پاشا)وە هاتوە و چەند بریندارێکی یەنیچەریشی لەگەڵدایە » ، پاشا گوتی

---

(21) ئەولیا چەلەبێ یەکێك بوە لەو تاك‌تاكە خوێندەوارانەی ئەو زەمانە لە ناو عوسمانێ‌دا ، پاش ئەوەی عەبدالخانی زانا و زیرەك و هونەرکاری ناسێ بە جۆرێك گیرۆدەی بۆبۆ کە لە کاتی دوژمنایەتێ سەروەرەکەشیدا رێز و قەدری خۆی سەبارەت بەو نەدەشاردەوە . لێرەدا خان بێ تاوان پیشان دەداو سوچی ئەم ئاژاوەیە دەخاتە سەر ئاغاکانی وان یا بەگێ مەلازگرد و چەند یەنێچەرێ تالآنکراو . بەلآم پاشا هێشتا لە بتلیس نانی عەبدالخانی دەخوارد کە نەخشـەی ئەم پیلانەی ئەمڕۆی لـە دڵی خۆیدا دەکێشا و بە شوێن ئاسانترین رێگادا دەگەڕا بۆ تالآن‌کردنی خان . خۆ‌کردنەوەی لەشکری کوردستان لە شاری واندا بە بیانوی گڵ فڕێدان سەرپۆشێك بۆ بۆ رێکخستن و ئامادەکردنی سوپا بۆ سەر بتلیس .

خێرا بیانهێنه ژوور ، نامەبەر هات سەلامی کرد و نامەی والی ئەرزەڕۆمی دایە ، وا نوسرا بو : (٢٢)

« گەورەم • بۆ خاتری خوا لە ژێر فەرمانڕەوایی ئێوەدا چەتەیێك هەیە ناوی خانی بتلیسە ، بە شەو بە دە هەزار کەسەوە پەلاماری ملکی ( محەمەد بەگی مەلازگردی)داوە کە سەر بە ئەیالەتی منە ، تالانی کردوە و نزیکەی سێسەد ئیسلامی بە ناهەق کوشتوە و چل هەزار سەر مەڕی شقاقی بردوە و خواردویەتی • ئەم کابرایە لەناو ملکی ئێوەدایە و بێگومان دەرەقەتی دێن و ئەم زوڵمە لادەبەن،دەنا ئەگەر تالانکراوەکان و کەسوکاری کوژراوەکان بە جلکی خوێناوییەوە رو بکەنە (ئەستەمبوڵ)ئیشی ئێوەش خراپ دەبێ ! ئەگەر ئارەزوتان کرد لەشکر بکەنە سەر ئەو چەتە و رێگرە منیش بە بیست هەزار عەسکەرەوە ئامادەم دێمە خزمەتتان • چاوەڕوانی فەرمانتانم • » ئەوانەی لای پاشا دانیشتبون بە بیستنی ئەم هەواڵە گەشانەوە و کەوتنە چەقەنەلێدان •

هەر لەم کاتەدا پەلێك لە یەنیچەریەکانی (ئەرزەڕۆم) هاتنە ژوور ، یەکیان کە قوڵی براو قوڵە براوەکەی فڕێ دایە بەردەمی پاشا و گوتی « هەی وەزیر ، هەقم بستێنە » و ئەوانی دیکەش کردیان بە هەرا و هاوار ، پاشا گوتی دەی غازییەکانم چیتان لێ کراوە ؟ گوتیان « گەورەم • ئێمە پاسەوانی سنورین و بە بازرگانێتی بەرێ دەچین ، کە بارەکانمان گەیشتە ( بتلیس ) بە بیانوی ئەوەی باج لە هەمو کەسێك دەستێندرێ باجیان لێ سەندین ، پاشانیش کوردێکی زۆریان خڕ کردبوە کە گوایا لەشکر دەکەنە سەر

(٢٢) هاتنی نامەی والی ئەرزەڕۆم دژی خانی بتلیس و شکاتی یەنیچەرییەکان و زاقە و هاواری ئاغا تورکمانەکانی وان و داخوازی هەمویان بۆ لەناوبردنی حکومەتی بتلیس شتێکی رێکەوت نەبوە ، بەڵکو ئەوانە پیلانێکی نهێنی رێکخراو بون لە پێشترا هۆنرابونەوە .

( محەمەد بەگی مەلازگرد ) ، بارەکانی ئێمەیان فڕێ دا و ولآخەکانیان هەمو لێ بە سوخرە گرتین ، ئێمەش چوینە سەر خان و هاوارمان کرد کەچی ئە ئاوا بریندارکان کردین ، جا خوا هەڵدەگرێ ئێمە هێزی بەردەرگا بێین و لەم سەر سنورە لە راهی خوادا خەزا بکەین ئاوا سوکایەتی‌مان پێ بکەن ؟ » ٠

پاشا لە دوای بیرکردنەوە گوتی « چەتەیی کردوە ، لە ولآتی خۆیەوە پەڕیوەتەوە ئەرزەڕۆم و چەند سەد کەسێکی کوشتوە ٠ » فتــوای هــەر چوار مەزەبی بە شێخول‌ئیسلامەکان نوسی ، مەلای وانیش فتوای شەرعی خستە سەر قاقەز و مۆری کرد و دایە دەست پاشا و گوتی « قوربــان ، خەزات پیرۆز بێ ، شێری غیرەت هەڵکێشــە و شوێنەواری ئــەم چەتەیــە لەسەر دنیا پاك بکەوە ٠ » ٠

پاشا بە دانیشتوانی گوت « با نامەیێك بۆ خۆی بنوســم و بــە پێی قانونی‌سولەیمانی داوای لێ بکەم بێتە وان لەگەڵ (محەمەد بەگی مەلازگرد) و شکات‌کەرەکانی دیکەدا بکەوێتە محاکەمە ، ئەگەر بە قسەی شەرع رازی نەبێ ئەوسا لەشکری دەکرێتە سەر ٠ » ئەوانەی لەوێ بون هەمو گوتیــان «قوربان شەرعی چی ، ئەوە خان تاوانبار کراوە ، دەست دەکا بە سوپا خڕکردنەوە و لەوانەیە پەلامارمان بدا ، لە سایەی خواوە بە هــۆی گــڵ فڕێدانەوە لەشکرێکی زۆر کۆبۆتەوە ، دەی با هەتا زوە بچینە ســەری ، » بەڵام پاشا بەقسەی نەکردن و گوتی دەبێ نامە بنوسرێ و کوڕەکەی بــلآوە پێ‌کرد ٠

پاش نانخواردن گەڕایەوە قەڵای ناوەوە لەگەڵ من و چەند هاودەمێکی خۆیدا بە پیاسە چوینە سەر قەڵای ملەوشتر بۆ سەر ئەو بورجەی ( سوڵتان مراد خان ) دروستی کردوە ، لەوێ هەناسەیێکی هەڵکێشا و بە منی گوت « (ئەولیا) ، باش گوێ بگرە تا بەسەرهاتی خۆمت بۆ بگێڕمــەوە و ئــەم نهێنی‌یە بزانــە ٠ »

## بەسەرهاتی مەلیك ئەحمەد پاشا

« من چرای هەڵکراوی ( سوڵتان ئەحمەد خانی ) خوالێخۆش بـوم ، سێ ویەك ساڵ لەمەوپێش بە هەر زەحمەتێـك بۆ خۆمـم گەیانـدە ژوری تایبەتی سوڵتان ، لە شەڕەکانی پرۆسە و ئەدەنە و خوتین دا لە خزمەتیـا بوم • پاش ئەو بوم بە چۆخەداری سوڵتان (مرادی چوارەم) و لـە شـەڕی داگیرکردنی رواندا لە خزمەتیدا بوم ، ئەوەبو پـاش داگیرکرانی ( روان ) وڵاتەکانی (نەخچەوان) و (شێروان) و (شاری تەورێز) و سـەدان وڵاتـی دیکەی ئێران گیرا و کاول کرا ، پاشان بە ناو خاکی کوردەکانی مەحموديدا هاتینە ناو قەڵای (وان) ، سوڵتان مراد خەریکی تەماشای قەڵا بو بە گەڕان هات تا گەیشتە ئەم کۆشکە ، پاش نانخواردن خەوی هات و نوست ، لەو سەردەمەدا (نیشانچی پاشا) سیلاحدار و من چۆخەداری پاشـا بوین ، وا رێکەوت ئەو مەنقەڵی ئاگرەی لە ژورەوە بۆ سوڵتان یان دانابو ، پریشکێکی پەڕیبوە سەر لێفەکەی و لەپڕ دوکەڵ لە ژورەکەی بـەرز بۆوە ، سـوڵتان خەبەری بۆوە هاواری کرد کێ لەوێیە ؟ یەکەم کەس من فریا کەوتم و چاوم بەو حـاڵە کەوت بە دەسـت ئـاگرەکەم کوژانـدەوە و دوکەڵی ژورەوەم رەواندەوە • سوڵتـان پرسیـاری کـرد کێ توبـەچی بـوە ؟ گوتـم توبـەچی ( حسێن پاشا شـێتە )بوە بـەڵام ئـەو کلۆڵـە فێ گرتویەتی و

هۆشی لای ژۆری ئێوه نەماوه • سولتان گوتی حەی ! دا بیهێنن ئەو کافره ، هەزار فێ بیگرێ لێرەوه فڕێی دەنه خوارێ و بیکەنه پەندی هەمو تۆبەچییێکی دنیایێ • من و مستەفا پاشا و ئەوانی دێ بەسەر دەستوپێیدا کەوتین بە هەزار حاڵ تا لە کوشتنی خۆش بو و دەری کرد •

بۆ رۆژی دوایێ لە کاتێکا (مراد خان) لەسەر سینییێکی زێڕ و چەند قاپی فەغفورێ گەوهەردار نانی بەیانێ دەخوارد ، پارویێك نان و هەندێ خواردنی هەڵگرت و گوتی « (مەلیك ئەحمەد) تۆ لە ئێستاوه بویته سیلاحدار و نزیکترین کەس بەمن ، چاك ئاگات لێم بێ، ها ئەم پاروه نانه بخۆ و بەو دوعایانه بێ من بۆت دەکەم » ، خەڵاتێکی سمۆرەی گرانی دا به شانمدا و مێزەرێکی محەمەدی بە دەستی خۆی لە سەرم بەست و کردمی بە سیلاحداری سەربەخۆ و هاودەمی خۆی • ئەو بەسەرهاتە ئا لەم کۆشکەدا رۆی دا و ساڵەکەی ١٠٤٥ بو ، خوا کارێکی کرد ئەوا جارێکی دێ لەپاش بیست ساڵ هاتومەوه ئێره و ئێستاش کە ساڵی (١٠٦٥)ە لەشم ساخە و بە سەرداری مەزن و دە ستوری موکەڕەم گەڕاومەوە • سوپاس بۆ خوا » •

کە هاتینەوه خوارێ ، پاشا فەرمانی پێ کردم نامەیێك بۆ خانی بتلیس بنوسم ، منیش ئاوام نوسی :

**نامەی ئامۆژگاریێ مەلیك ئەحمەد پاشا بۆ عەبدالخان فەرمانڕەوای بتلیس :**

هەی لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە هەمو کەس سوکتر ، تۆ کە ناوت عەبدالخانە چەتەیێکی گومڕای سەرلێشێواوی ، شەرمت لێ هەڵگیراوه و نامۆس و شورەییت لەلا نەماوه ، بە درۆ خۆت لە بنەچەی (سولتان ئەوحەدولڵای عەباسی) دەژمێریت و بەوه بابێ بووی ، کەچێ لەعنەتی خوات لە خۆت بارکردوه لەگەڵ بێگانە و رافزێ و یەزیدێیەکاندا تێکەڵ بویت و

کابرایێکی لە دین‌وەرگەڕاوی ، شان‌بەشانی گۆرانی‌بێــژ و قەشمــەر و وشکەڕن و دمبەگژەنان هەڵدەستی و دادەنیشی ، بە لەعنەت بی هەتا ڕۆژی قیــامەت •

ئەوسایەی من والی (ئەرزەڕۆم) بۆم هەر چێت کردبۆ گوتــم ئــەوە تێپەڕیوە و لێت خۆش بۆم ، کەچی گەیشتوتە ئەم تەمەنە و هێشتا خــۆت باش نەکردوە ، بە ناوی باجەوە ڕێبوار و بازرگانان تالان دەکەیت و وڵاخ لە خەڵك دەستێنی ، دەچیتە سەر خاکی (ئەرزەڕۆم) و چل هەزار سەر مەڕی (محەمەد بەگی مەلازگردی) دێنی و وڵاتەکەی تالان دەکەیت و سێســەد کەسی لێ دەکوژی • هەرچی (یەزیــدی) و (چەکوانــی) و (خــاڵتی) و (ڕۆژەکی) هەیە لە خۆت خڕکردۆتەوە [٢٣] ، هەر کەس بە لاتدا بڕوا ڕوتی دەکەیەوە و قۆڵی دەپەڕێنی ، بۆی بە ڕێگر و دەس‌درێژی دەکەیە سەر هەمو لایێك • تەنانەت ئەگەر ئەو مەلایانەی لای خۆت بە ناوی ئامۆژگاری‌یەوە پێت بڵێن بۆچ وا دەکەی ؟ لە وەڵامیاندا دەڵێی « ئێرە کوردستانە ، بــۆ ئەوەی چاوترساندنێك لە نێواندا بمێنێ ئەم تالانکردنە قانونێکی عەباسی‌یە •» شەرت‌بێ لە دەوڵەتی عوسمانیدا بە جۆرێکت تەمبێ بکەم وەك گوارە بکرێتە گوێچکەت و خــۆت و ماڵ و منداڵت وەکو دیلی بەزێڕکڕاو ببنە کۆیلەی عوسمانی‌یەکان ، من خۆم ئەو دە ڕۆژەی میوانت بۆم تێگەیشتم چ فێڵ و

(٢٣) سەرنجێکی ئەم نامەیە دەری‌دەخا کە عوسمانی‌یەکان تێکڕای کوردەکانیان بە چــاوی دوژمن و ناموسڵمان تەمــاشا دەکرد و خوین و ماڵیانیان بــە حەڵاڵ دەزانی ، پێشەوایێکی وەکو عەبداڵ خان کە خاوەنی ســامــان و دارایی‌یە و بنەماڵەیێکی فەرمانڕەوای لە مێژینەیە و لــە سەرانســەری کوردستاندا بە چاوی دەســتەڵات و ڕێــزەوە بــۆی دەڕوانــن ، بــۆ کاربەدەســتانی عوسمانی جێی مەترســی بۆ ، لەناوبردنی پێشەوایێکی وەکو عەبداڵ خان و حکومەتێکی سەربەخۆی وەکو بتلیس دۆ سودی بۆ مەلێك ئەحمەد پاشا لێ دەوەشایەوە : لابردنی مەترسی و دەسکەوتێکی بێ ئەژمــار .

تەڵەکەیێکت لە ناخی دەروندایە ، بۆیە لە ناو خێوەتی رێی ئەوا پێم گوتی « گیانەکەم خان ، هەتا من لە ( وان ) فەرمانرەوام ، تۆ لەگەڵ فەرمانده و بازرگانەکاندا تەبا بە » ئەمەم بۆ قازانجی خۆت پێ گوتی ، وا دیارە ئەو نسحەتەی من بایێ پوشێك کاری تێ نەکردوی بۆیە ئاژاوەت ناوەتەوە و دەستت داوەتە کاری بێ شەرعێ ، گومان لە رێگرێتدا نەماوە و لەسەر حوکمی شەرعی ئیسلام خوێن و ماڵت حەلاڵە و بە هەر چوار مەزهەب فتوای لەسەر دراوە ، بڕیارم داوە بێمە سەرت و وڵات لە دەست یاخێ و پیاوخراپێکی وەکو تۆ پاك بکەمەوە تا جادە و شارێ‌یەکان ئەمێن بنەوە •

جا لەگەڵ ئەم نامەیەی منت پێگەیشت رامەوەستە بە خۆت و فەرماندەکانی هاوڕێتەوە وەرە خزمەت سوڵتانی عوسمانێ ، ئەو مەڕ و ماڵەی تالانت کردوە بیاندەوە بە خاوەنەکانیان و خۆت لە تەحتی وان ئامادەی موحاکەمە بە ، وەڵڵا بیللا ئەوەندەی تۆسقاڵێك دەستت بۆ نابرێ • هەر دەبێ بێی دەنا جگە لەو هەمو زیانەی لێت دەکەوێ وڵاتەکەشت تالان دەکرێ و خۆت ناوت دەسڕدرێتەوە • من ئەوا هاتم بۆ دەشتی تەحتی وان تۆش لەگەڵ یەزیدییە مەلعونەکانی رۆژەکی خۆت وەرە بۆ بەردەمی قارەمانەکانی وان ، جا خوا یا بە تۆی دەدا یا بە ئێمە •»

ئەم نامەیە لەگەڵ نامەکەی ( ئاوخچێ مستەفا پاشا )ی ئەرزەرۆمدا پێچرایەوە و درا بە سەر دەرکەوان (جانپۆلاد ئاغا) ، ئەویش بە پڕتاو لە رێگای قوسقون ترانەوە گەیاندیە خان و ئەم نامەیە لە دیوەخاندا خوێنرایەوە، خان تورەبو گوتی «پەحا ••• دەبێ ئێمە ئەوەندە تاوانبار بین وڵاتمان تالان بکرێت و ئەم هەمو قسە ناخۆشەمان بۆ بنوسرێ ؟ کاری خوایە ، هەردو دەست بۆ خزمەتی سەرە ! » ئەمەی گوت و لەبەرچاوی نامەبەرەکە پالی لێ دایەوە ، بەڵام لە ژێرەوە بە پەلە نامەی بۆ بەگە کوردەکان نوسێ و داوای یارمەتی لێکردن •

له لایێکی دیکەشەوە خەزێنەی شەرەفخانی خستە سەر پشت حەڤدە هەزار تفەنگچی کۆکردەوە و قەڵا و مەتەرێز و سەنگەرەکانی تازەکردنەوە ، دە هەزار کەس بۆ تۆبەتگرتن و قەرەوڵی دانا ، لە لایەن کوردەکانی برادەریشیەوە حەڤدە هەزار تفەنگچی پیادە و دە هەزار سواری بۆ هات و خۆی بۆ شەڕ ئامادەکرد • پاشان ئەم نامەیەی بۆ پاشا نارد کە گەوهەری لێ هەڵدەوەرێ : (٢٤)

نامەی عەبداڵخان بۆ مەلیك ئەحمەد پاشـا :

« لە پێش هەمو شتێکدا سوپاسی ئەو خوا بێهاوتایە دەکەم کە هۆشی تەواوی داوە بە ئادەمزاد و بە پاکترین و بەرزترین گیانلەبەران سەربەرزی کردوە و کردویەتە سەرپشك بۆ هەڵبژاردنی چاکە و خراپە ، بۆ ئەوەی سود و زیانی خۆی لێك جیابکاتەوە و بە فڕوفێڵی درۆزن و دوڕو و شۆفاران هەڵنەخەڵەتێ ، ئەوانەی دەبنە فەرمانڕەوا جڵەوی کاروباری خەڵك بە دەستەوە دەگرن ، ئەو ئەرکە بەبێ لادان لەڕێ و بەبێ چاوەڕوانی دەسکەوتی تایبەتی بەرن بە ڕێوە و لە فرمانەکانیاندا پرسیان پێ بکەن •

ئەمە ڕەوایە منێك ئەوەندەی پوشێك تاوانم نەبوبێ تەنیا لەسەر گومانێك ئەو دەریا سوپایەت خڕکردوەتەوە و شەڕم پێ دەفرۆشی ؟ داخوا ڕۆژی قیامەت بەرپرسی ئەم کردەوەیەت نابی ؟ شاری بتلیس بکەوێتە بەر تالان و بڕۆ و ماڵ و منداڵی کوردان لە ژێر پێی زوڵم و زۆردا بپلیشێنەوە تۆ چۆن وەڵامی سوڵتان دەدەیەوە ؟ ئەو کاتەی لە ماڵی من میوان بوی و ئەو هەمو بەڵێن و گفتە باشانەت بۆ هەڵڕشتم چەند زو لە بیرت چونەوە ، بۆچی نەیانگوتوە پیاوی مەرد هەر بەڵێنێ بدا بە جێی دێنێ ؟ ئەو ڕۆژەی

---

(٢٤) ئەم ڕستەی ( گەوهەری لێ دەبارێ )یە جوانترین هەستی ڕێز و بەگەورە گرتنە کەئەولیا چەلەبی بەرامبەر بە دوژمنی دەوڵەتەکەی بەکاری هێناوە.

به منت گوت « خانی برام ، ئیشاللا سنجاقی (مۆش)یشت بۆ دەخەمە سەر بتلیس و تۆڵەی چاکەکانت دەکەمەوە • » منیش بەم بەڵێنەت دڵم خۆش بۆ، تۆ ئارەزۆت وابۆ کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایێ تۆدا هەمۆ کەس بحەسێتەوە، ئەم لەشکر هێنانەت خەڵك حەساندنەوەیە ؟ ئیدی ئەم خەڵکە چۆن دەحەسێتەوە و پەنا بۆ کێ بەرن ؟ جارێکی دیێ پێت گوتم « کاکەخان ، تۆ چرای داگیرساوی گەورەی من سوڵتان مراد خانی ، ساڵی شەڕەکەی (روان) زۆرمان نان خواردی و وا دیسان لەو نانەت دەخۆینەوە ، بۆیە بە دڵ حەز دەکەم هەر لە خێر و خۆشیدا بیت و دوعای خێر بۆ (سولتان محەمەد خان ) بکەیت » •

کوردەکان لە هاویندا دێنە هەواری مەلازگرد ، پیاومان دەچێ سەرژمێری مەڕەکانیان دەکات و بە پێی قانۆن مەڕانەیان لێ وەردەگیرێ ، کەچێ ( محەمەد بەگ ) سوپای لەگەڵ خۆی هێنا بۆ خاوەن مەڕەکانی گرتە بن باڵی خۆی و رێی مەڕانەدانی لێ گرتن ، لەم بەربەرەکانیەدا بەگژیەکدا چۆین و چەند کەسێکی تێدا رۆیێ ، بەلام بۆ ئەم لێکدانە ئێمە فتوای هەر چوار مەزەبمان وەرگرتوە و لامانە •

یەنیچەریەکانیش ، ویستومانە باجی میریێ لە کوتاڵەکانیان بستێنین نەیاندا و بە شێوەی ئاژاوە هێرشیان هێنایە باخی من و چەند پیاوێکیان لێ بریندارکردم و ئەم هەرایەش لە قەباڵەی شەرعێدا نوسراوە کەوا بۆم ناردن•

جا ئەگەر ئەوانە سەرەڕای ئەو کردەوە نا قانۆنیەی خۆیان هاتۆن درۆودەلەسەیان هەڵبەستوە ، تۆ ئەم هەمۆ قسە ناشیرینانەت بۆ من نوسیوە ، منیش سەرەڕای ئەوەی هیچ تاوانێك لە خۆمدا شك نابەم ، دیسان داواتان لێدەکەم ئەم نامەیەم بە تۆبە و پاشگەزبۆنەوە دانێن و لێم خۆش بن، چونکو دۆستایەتێ و خۆشەویستێ پێشومان زۆرە و ئێوە وەزیری خەلیفەی

پێغەمبەرن و لەسەرتان پێویستە هەمیشە لانی دادکاریێ بگرن و قبـەول و بەڵێنی خۆتاتتان لە بیر نەچێتەوە •

بە پێغەمبەری خوا و هەر چوار یارەکەی و بە سەری سوڵتانی مەزتتان سوێند دەدەم لە ناو خەڵکدا مەمشکێنن و رۆشکێنم مـەکەن • وا ئـەم نامەیەم بە (زەینەڵ ئاغا)ی خۆمدا ناردە خزمەت‌تان کەچی پێویست بێ بـۆ ئاشت‌بونەوەم لەگەڵ شکات‌کەرەکاندا یارمەتیم بدەن • ئیدیێ هەر خـۆش بێ • »

کاتێ ئەم نامەیەی خان لە قەڵای وان گەیشتە دەستی پاشا و تێیـدا رون‌کرابۆوە کە ( محەمەد بەگی مەلازگردی) پۆشانەی نەداوە بە خـان و بەگژیشی‌دا چوە و ئەم محەمەد بەگە خۆی تاوانبارە و بە شەرع خوێنی حەڵاڵ کراوە و یەنیچەریەکانیش بە هەرا و هۆریا چۆنەتە سەر دیوەخـانی خـان و لێدرانەکەیان کارێکی بەجێ بوە ، پاشا ئەم نامەیەی پێ خۆش‌بۆ و گوتی «بەڵام بۆچی نەهات تا لێرە شەرعیان بکرێ ؟» (زەینەڵ ئاغا) گوتی «قوربان ، خان دڵی شکاوە و تکاتان لێدەکا لەگەڵ یەنیچەریەکان ئاشتیان بکەیتەوە ، منی بۆ ئەوە ناردۆتە خزمەت‌تان لە جیاتی خۆی • »

پیاوماقوڵانی وان کێچ کەوتە کەولیانەوە و تێکرا گوتیان « قوربـان ئەوە دەتان خلافێنێ ، خوا دەیزانێ رۆژێك دێ ئێمەش وەکو محەمەد بـەگی مەلازگردی مالوێران دەکا و پاشانیش وەکو شەرەفخانی باپیری لە تەنگانەدا رۆ دەکاتە ولاتی عەجەم ، چونکو ئەمـانە لە کۆنـەوە دوژمنی خـانەدانی عوسمانین ، هەتا ئەم سوپایە لێرە خڕبۆتەوە و هەڵمان بۆ هەڵـکەوتوە بـا هەڵکوتینە سەری و لەناوی بەرین ! » ئەوەندەیان لەم قسـانە بە گوێی پاشادا خوێند و چۆنە ژێر کلیشەیەوە تا بڕیاری چونە سەر بتلیسی دا •

پاشا بە شەش هەزار عەسکەری مەحمۆدی هەڵبژاردەوە هاتە گونـدی

(سەر روبار) و لەوێ خێوەت و بارەگایان هەڵدا ، جارچیش بەناو شـــاردا جاڕیان دا هەرچێ چەك هەڵگرە با بکەوێتە ڕێ ، بە حەفتا دەرکەوانی خۆیدا نامەی بۆ سێ بەگی سنجاق و فەرماندە سوپاییەکان نـــارد ، دوو نامــەی تایبەتیشی بە ئاغاکانیدا نارد ، (ئەحمەداغای ئەرخەتیلی) یەکیانی برد بۆ والیێ (ئەرزەڕۆم) تاوخچی مستەفا پاشا کە باشترین عەسکەری خۆی بنێرێ و ئەو نامەکەی دێ بۆ (فیراری مستەفا پاشا) کە بە عەســـکەرە هەڵــبژاردەکانی خۆیەوە بێ لای پشتەوەی خان بگرێ ، جا ڕۆژبەڕۆژ شەپۆلی دەریای سوپا لە بەردەم قەڵای واندا پەنگاوی دەخواردەوە •

پاشا فەرمانی دا پەنجا دانە تۆپی قەڵای وان و شەش تۆپی باڵیۆمزێ سازبکرێن ، بیست کەشتیش پڕ بکرێ لە جبەخانە و چەند هەزار قەتـــار بەکسەم و باروت بە هەڵهەڵەکێشان بەرەو خۆراوای دەریاچەی وان ڕویـــان کردە بەندەری عادلجەواز • فەرمانێکی کردە سەر بەگی (مۆش) و داوای لێکرد شەشسەد کەڵی تۆپڕاکێش بنێرێ •

هەر لەم ڕۆژانەدا بۆ شەوێکی تاریك ئەوەندە باران باریێ و تریشقەی لێدا و لافاو هەستا ، بولەرزەیێك دنیای ڕاتەکاند و گەلێك خێوەت و چادری عەسکەرەکان بە هەمو شتێکەوە ئاو ڕایماڵێ بۆ ناو دەریا • بە گرمەی هەور و شریخەی بولەرزە خەڵك وای زانێ هەر ئێستا قەڵا نغرۆ دەبێ • کاتێ بەیانێ هەستاین دەبینین ئەو هەمو گڵ و خۆڵەی (تەیموری لەنگ) لەبــەر قەڵای ڕۆکردبو و بەشی زۆری هێشتا هەر مابو ، ئەم باران و لافاوە ڕای‌ماڵیوە و کردویەتە ناو دەریاوە ، هەروەها چیای بەرزی وان بە جۆرێك شۆراوەتەوە و پاكبۆتەوە وەکو شوشە دەدرەوشێتەوە • چونکو ئەو چەند ڕۆژە ئەو گڵەی ئەوێ بنکۆڵ کرابو بەم لافاو و بارانەیە هەڵکەندرا و لافاو لەگەڵ خـــۆی ڕشتیە دەریاوە ، جگە لەوەی لەم گڵە ڕزگاربون و دەشتەکە پاكکرایەوە یەك

کەسیش خوێن لە لوتی نەهات • عەسکەر بەمە زۆر شادبون و بە خێریان زانی و خۆیان بۆ شەڕ ساز کرد •

## یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ئەمساڵ بە چل هەزار عەسکەر لە وانەوە چوینە سەر خانی بتلیس

ڕۆژی دوشەمە بە دوعا و سەڵەواتەوە لە وان ڕێکەوتین ، تۆپەکەلی سولەیمانخانیان تەقاند کە گوللەکەی پەنجا هۆقە ئاسنە ، ئەو گوللەیە بەسەر سوپای ئیسلامدا وا بە هاڕەهاڕ تێپەڕی کە هەمویانی حەپەساند و ئەسپەکان سلەمینەوە ، بە چوار سەعات بەرەو باکور هاتینە گوندی ( سەر روبار) و لەوێ خێوەتی پاشایان هەڵدا ، پاشا ناردی فەرماندەکان هاتنە لای و زۆر دلخۆشی دانەوە • بۆ بەیانی دیسان بەرەو باکور بە چوار سەعات گەیشتینە (مێرگی قاسم ئوغلی) ،لێرەدا دو تۆپی شاهی لە وانەوە بە عارەبانە و پێنسەد چەکدارەوە گەیشت ، تۆپەکانیان لەبەر خێوەتی پاشا بە زنجیر بەستەوە ، لێرەشەوە هەر بەرەو باکور ( قەڵای ئەمێن )مان لە لای راست بەجێ هێشت و بە سێ سەعات هاتینە گوندی ( قەرەشێخلەر ) کە گوندێکی موسڵمان و ئاوەدانە و مزگەوتێکی هەیە• دیسان بەرەو باکور بە سێ سەعات هاتینە گوندی (قەرەجانیکلەر) ، لە روباری جاتێك پەڕینەوە و روەو باکور گەیشتینە ( قەڵای بارگری ) و کەمێك لەولاتر لە ( بەندی ماسی ) وچانمان گرت ، لە کوردەکانی مەحمودی ( شەرەفخان بەگی بارگری ) بە سوپای خۆیەوە هات و تێکەڵ بە سوپای ئیسلام بو ، لە روباری بەندی ماسی پەڕینەوە بەرەو خۆراوا بە قەراخ دەریاچەی واندا لە هەندێ شوێنی زەلکاو و لە هەندێ رێگای باش تۆپەکانمان پەڕاندەوە و گەیشتینە قەڵای (ئەرجیش) ، عەسکەری ناو قەڵا تۆپیان تەقاند و بەرەو پیری پاشا هاتن ،

بەگی ئەرجیش ( فەرهاد بەگە شێتە ) بانگهێشنێکی گەورەی بۆ پاشا کرد و ئەسپێکی بە زین و رەختی زیوەوەی پێشکێش کرد •

بەرەو خۆراوا بە سێ سەعات هاتینە گوندی ( کەنزەك ) کە گوندێکی موسڵمانە و سەر بە ئەرجێشە ، لەوێشەوە بە پێنج سـەعات هاتینە گوندی (دەمیرچێ) ، لێرەدا بەگی (بایەزید) بە سوپای خۆیەوە گەیشـتە ناومان • دیسان روەو خۆراوا گەیشتینە قەڵای (عادلجەواز) ، لێرەدا والیێ (ئەرزەرۆم) مستەفا پاشا بە ئاغایێکی خۆیدا پەنجا تفەنگی جەوهەرداری لـە قەتارێك ئێسـتر بارکردبێ و لەگەڵ دە خولامی گورجی بـە پێشکێش ناردبێ • (محەمەد بەگی مەلازگردیش) بـە دە هەزار تفەنگچیەوە هات و تێـکەڵی سوپای ئیسلام بو و پاشا خەلاتی کرد •

لە عادلجەوازەوە دێ تۆپی بالێومز و گەلێك جبەخانە بـەرێ کران و رۆیشتن • دیسان بەرەو خۆراوا هاتین بە سێ سـەعات گەیشتینە گوندی (سۆرپ) • لێرە بەگی (خەنەس) کە سەر بە ئەرزەرۆمە بە سوپای خۆیەوە هات و خەلات کرا ، ئەمجار رومان کردە قیبلە و بە سـێ سەعات بە قەراخ دەریادا گەیشتینە قـەڵای (ئەخلات) ، عەسکەرەکانی قەڵا بە شـادیەوە پێشوازیێ پاشایان کرد و تۆپیان ئاگردا ، قەڵاداری قەڵا هاتە خێوەتی من و منیـش بە دیاریێەکانەوە بردمـە خزمـەت پاشا ، زۆر قـەدری گرت و خەلاتی کرد ، ئیدێ لەگەڵ مندا بێ بە برادەر ، بەگی مێشیش هات و خەلاتی وەرگرت • بۆ سبەینێ نیوەی عەسکەری ناو قەڵای ئەخلات شـوێن پاشا کەوتن • هەر بەرەو قیبلە بە چوار سەعات هاتینە گوندی ( ئەزغاك ) ، بەگی (تەکمان) و هێزەکەی گەیشتن و خەلاتکرا •

ئەمڕێ ( برایم بەگی مەحمێدێ ) بە شـەش هەزار کەسەوە کرا بـە

چەرخەچیێ کە تۆغەکان پێش نەکەون و لەگەڵ پاشادا بڕوا • دوژمنی خوێنەخۆی خانێ بتلیس محەمەد بەگی مەلازگردێ بە سێ هەزار کەسەوە داندرا بە قەرەوڵی ناوەند ، بەگی تەکمان و بەگی خەنەس بۆ قۆڵی راست و بەگی‌مۆش و بەگی عادلجەواز بۆ قۆڵی چەپ دیارکران • بەگی پنیانش بە شەشسەد کەسەوە کرا بە قەرەوڵی راست و بەگی غازی قڕان بە قەرەوڵی چەپ •

لە گوندی ئیزغاك بارمان کرد بە قەراخ دەریای واندا لە دەشتی (ڕێگای ئووا) و لەناو (چیمەنی چاڵش)دا خستمان • لەشکر چێن لەسەر چێن خێوەتیان هەڵدا • لێرەدا هەندێك لە عەسکەرەکانی ئیسلام چۆبۆن بۆ دار و چیلکە هێنان و لۆتیان تەقی بۆ بە لۆتێ قەرەوڵەکانی عەبداڵخانەوە ، پەنجا کەسێکیان لە عەسکەرەکانمان کوشتبو و سەریان بڕیبۆن و شەشیان بە دێل گرتبۆ بردبۆیانن بۆ خان • خان لە دیلەکانی پرسیبو سوپای پاشا چەندە و لە کوردەکانی (ئەرزەڕۆم) کێ هاتوە و تۆپ و جبەخانەتان چەندە • پاشان یەکی دە زێڕی دابۆ بە دیلەکان و سەرە بڕاوەکانی‌پێدا ناردبۆنەوە • پاشا فەرمانی‌دا سەلکەکانیان ناشت و ئاغای قۆڵی راستی کردە فەرماندەی دار و چیلکە هێنان • لەم کاتەدا لە ئەیالەتی ئەرزەڕۆمەوە بەگەکانی (پاسینێ)و (عۆنیك)و (قرەرۆجان) بە تەپڵ‌لێدان بە بەردەمی پاشادا تیپەڕین و پاشا خەڵاتی کردن • پاشا پیاوەکانی ئەم سێ بەگە تازەهاتوەی دانا بۆ چاودێرێ ئەوانەی ئاگرودۆ و ئازۆقە دێنن و ئاغاکانی قۆڵی راست و چەپ گەڕانەوە بۆ ناوەندی لەشکر •

ئەمجار بەگەکانی (ئەرزەڕۆم) بوسەیان نایەوە و چەند کەسێکیان نارد بچن خۆیان وا پیشان بدەن کە هاتۆن دار و چیلکە بەرن ، لەولا پیاوەکانی خان هاتن بیانگرن ئەمان لە ناو بۆسەوە لێیان دەرپەڕین حەفتایان لێ

کوشتن و بیست کوردی یەزیدییان (٢٥) بە دیل گرت و لەگەڵ سەرە براوەکاندا بۆ پاشایان هێنان ، پاشا خەڵاتی کردن . سەلکەکانیان لە بەر خێوەت فڕێدا و زیندوەکانیان خستە ژێر پرسیار • چەندبازێکیان تێدا بو بە ناوی کوڕی باخەوان ، هەر لە خۆیەوە هاتە زمان و گوتی « قوربان، خان لە سەنگەرەکانیدا دە هەزار تفەنگچی و دوو هەزار عەسکەری سوارەی هەیە، پەنجا هەزار چەکهەڵگریش لە هەر چوار دەورەی (بتلیس) پێنج قات و شەش قات لە ناو چیاکاندا خەریکی پاسن . (قەرە عەلیاغا )ش بە سێ هەزار تفەنگدارەوە قەڵا دەپارێزێ • خان بە سێ هەزار مەردی هەڵبژاردەوە لە باخەکەی خوێدایە •

بەڵام قوربان ، پێش ئەوەی تۆ بگەیتە (عادلجەواز) هەرچی خەڵکی بتلیس هەیە لە دەست زوڵم و زۆری خان رایانکردۆتە چیا و چۆڵان و ژن و منداڵیان کەوتۆتە دەستی پیاوەکانی خان ، ئێستا لەناو شاردا هاوار و هەڵلایێکە بۆتە رۆژی حەشر • »

پاشا قسەی کابرای بە دڵ بو لێی پرسی « دەی قسە بکە ، لە بەگە کوردەکان کێ هاتۆتە یارمەتی خان ؟ » کابرا گوتی « بەخوا قوربان لە ئەیالەتی دیاربەکرەوە بەگەکانی (چیاقچور)و (جومتوشگەزەك) دەهاتنە یاریدەی خان کە والی دیاربەکر پێی زانی عەسکەری کردە سەریان کە بۆچی بەبێ فەرمان دەچن پشتی یەکێك دەگرن لە سوڵتان یاخی بوە ، هەردوکیانی بەند کردوە و ناردوونی بۆ دیاربەکر • بەڵام بەگی حەزۆ کە سەر بە ئەیالەتی دیاربەکرە و خۆی زاوای خانە ، لە پێش ئەم شەڕەوە لە بتلیس بو و ئێستاش ئەم مورتەزا بەگە هەر ماوەتەوە ، بەگی جسقە لە ئەیالەتی دیاربەکر و بەگی

---

(٢٥) هەر کوردێك بە دڵی عوسمانی‌یەکان نەبوبێ بە یەزیدی ناوبراوە ، سوپای عەبداڵخان یا یەزیدی تێدا نەبوە یا ژمارەیان زۆر کەم بوە ، کەچی هەمویان بە یەزیدی ــ واتا دین دوژمن ــ ناو دەبرێن .

زرێقی سەر بە وان ئێستا بە سوپاوە لەگەڵ خانن ، هەر لە ئەیالەتی وان بەگەکانی (سعرد) ، (گەڕگەڕ) ، (شروێ) ، (کارنێ) ، (هیزۆن) ، (ئاغاکیس)، (کشان) ، (بردعه) ، (لادێك) ، (ئەرەجك) ، (دالاگەر) ، (چۆپانلق) ، (هەکارێ) ، (بەنی قەتور)و (ئەباغای) هەمویان یارمەتیان بۆ خان ناردوە و خۆشیان خەریکن بێنە کن تۆ ، بەڵام نایەن ، ئەوا لەناو دۆڵەکانی ئەم چیایانەدا خۆیان حەشار داوە و چاوەڕوانی ئەنجامی بەسەرهاتن ، ئەگەر خوا نەکا خان تۆی شکاند ئەوا دێنە خوار و ئەو کەسانە بەشێر دادەپەڵۆسن کە بونە هۆی ئەم شەڕە و تۆیان بەگژ خاندا کردوە .

هەی پیرە وەزیر ، قسەی کوڕی باخەوان لە گوێ بگرە و لە خان مەترسە ، عەشیرەتی خان رۆژەکین کە نە شەڕکەرن و نە خانیان خۆش دەوێ، زیاتر وریای بەگەکانی گورجستان بە ، ئەوان بە سوێند و پەیمان لەگەڵ خان رێك کەوتون . بەڵام قوربان تۆ یارمەتیت لە والێ ( دیاربەکر ) داواکردوە و ئەویش ئەوا بە بیست هەزار عەسکەرەوە بە رێوەیە ، تۆش لێرە شێست هەزار عەسکەرت پێیە ، شاری (بتلیس) بە جۆرێك سام گرتویەتی هەر مەپرسە، بەڵام هەر ئامادەن بۆ شەڕ ، چونکو رێگای دیاربەکر بەناو چیادایە و ئێوەش چیای (دێوان) و (ئۆیخ) پێشی گرتون . لە هەمو ئەم چیایانەدا دە چێن سەنگەری قایم ئامادە کراوە » .

کابرا ئەم قسانەی کرد پاشا سەد زێڕی دایە و بەرەڵڵای کرد و پیاوی لەگەڵ نارد تا بردیانەوە ئۆردوگای خان . ئەمجار نۆزدە دیلەکەی دیکەیان هێنان و لێیان پرسین . هەمویان گوتیان « نزانم خەبەرێ خانی » ، یەکە یەکە هەمویان سەربڕین ، کەسیان لەم قسەیە زیاتریان نەدرکاند ! پاشا زۆر تۆڕە بو فەرمانی دا ئەو سەلکانەیان وەکو گۆ دایە بەر شەق .

هەر ئەو رۆژە لە (چیمەنی چالیش) بارمان کرد و بە قەراخ دەریادا

روەو باشور بە سێ سەعات گەیشتینە ( تەحتی وان ) ، لێرەوە نامە بۆ عەسکەری (دیاربەکر) نێرا کە « بیست و چواری مانگی رەمەزان کە دەکاتە رۆژی دوشەمە ، لە پاشڕا لە خان بسرەوێنن » • نامەش بۆ بەگە کوردەکانی هێشتا نەهاتبون ڕۆیشت •

جگە لەلای دەریا سێ لایەکەی دیکە نۆبەچی و قەرەوڵ بلاو کرایەوە و نزیکەی بیست هەزار کەس چون بۆ هێنانی ئازوقە و سوتەمەنی ، فەرمان دەرچو کە پێنج فەرزە دوای نوێژکردن هەر فەرماندەیە تەپڵی خۆی لێدا ، لە پێشەوە (مەلیك ئەحمەد پاشا) ، دوای ئەو فەرماندەی (هەکاری) ، (بەگی مەحمودی) و چل و هەشت میر لیوا تەپلیان دەکوتا و عەسکەر هەلدەپەڕین•

رۆژی دوایی جارچی بە ناو ئوردودا جاڕیان دا کە دە رۆژ لێرە ئیسراحەتە ، هەر ئەو رۆژە دو کەشتی پڕ لە چەك و جبەخانە بە ساخ و سەلامەتی گەیشتە تەحتی وان و لە خۆشی ئەوە تەقەی شادیمان کرد و هەلپەڕین ، تۆپەکانیان لە کەشتی دەرهێنا و لەبەر خێوەتی پاشادا ریزیان کردن ، حەفتا هەزار عەسکەر بە جارێك دەزرێژی کرد و شەش تۆپی بالیومز و چوار تۆپی شاهانە یەکجێ تەقێندران • گرمە و هاڕەی ئەو تۆپ و تفەنگانە بە جۆرێك لە دۆلی رێگای ئوادا دەنگی دایەوە کە وەکو بیستمان لەسەر چیاکانی بتلیس کە (عەبدالخان) گوێی لێ بوە تای لێ هاتوە •

ئەو هەزار و دوسەد کەلانەی بۆ تۆپ راکیشان نێرابون گەیشتن بەلام بەگە کوردەکانی قولی راستی کوردستان دیارنەبون ، پاشا چاوپۆشی کرد و گوتی با بزانین • پاشان لە تەحتی وانەوە بەرەو خۆراوا بە رێگای ئووادا روومان کردە شاری بتلیس • ریزی سوپا بەم جۆرە بو :

لە ناوەندا پاشا خۆی و دوازدە هەزار عەسکەرە هەلبژاردەکەی و لە پشتیانەوە حەفتا ئالا پیادەکانی سەگوان و ساریجە کە لە ناویاندا چوار چوار

عەرەبانەی ئەسـپ تۆپی بالیۆمز و پـەنجا تۆپی شاهانەی رادەکێشـا • عەسکەری پێنیانش وەکو سۆکەقەرەوڵی راست و چەپ ، چەرخەچی چەپ بەگی مەحمودیێ و چەرخەچی راست بەگی مەلازگرد• لای راست عەسکەری قۆڵی راستی وان و بەگەکانی دیکە بۆ قۆڵی چەپ ، بەگی بایەزید و بەگی بارگریێ لە دواوە بونە بنکری پاشماوەی سـوپا • ئەو بەگانەی نەهاتبون چەکداریان ناردبو لای راستیان پێ سـپێردرا کە لە ناو کێوەکان و سـەر گردەکاندا تۆبەت بگرن و ناوبەناویش بێن بۆ لای چەپمان •

ئا بەم پێیە پاشا دەشتی رێی ئۆوای پڕ کرد لە عەسکەر و لە قۆناخی (خانی خسرەو پاشا)دا وەکو جاران وچانسان گرت و هـەر چواردەورەی سەرا پەردەی پاشا بە عەسکەر تەنرا و بۆ هەمو لایێك چەرخەچی و قەرەوڵ و ولاخ لەوەڕێنەکان بلاو کرانەوە و چاوەشەکان عەسکەریان وریا دەکردەوە کە ئاگاداری خۆیان بن و چەك لە خۆیان نەکەنەوە • (برایم بەگی مەحمودیێ) لە (خانی پاپشن) دو دیلی گرتبو بۆ پاشای نارد ، پاشا پرسیاری لێکردن ئەو دوە سوێندیان خوارد کە پیاوی خان‌تین پاشـا بەرەڵلای کردن • محەمەد بەگی مەلازگردیش کە چەرخەچی بو سێ کەللە و سێ دیلی بۆ پاشا ناردبو ، پاشا ویستی قسەیان لێ دەربێنێ کەچی بەرامبەر بە پاشا زۆر زماندرێژیێیان کرد لە سەریان درا و سەلکەکانیان فڕێدرایە بەردەمی سەراپەردەی پاشا •

لەسەر فەرمانی پاشا حەوسەد هەشسەد کەسێك لـە کوڕە ئازاکانی عەسکەری وان و لە ئاغاکانی ژورێ خۆیان پڕچەك کرد و خۆیان گۆڕیێ بە ناو سوپا و لە دەوروپشـتی ئۆردودا کەوتنە گوێ‌گرتن و خەڵك‌دواندن و تەماشـای تالان و لێوردبونەوەی چەرخـەچی و قەرەوڵەکان ، بـەرەو خۆراواش بۆ روانینی سەنگەرەکانی خان هەتا ( کانیێ قەساب ) رۆیشتن کە تفەنگ‌هاوێژێك لە سەنگەرەکان و ئۆردوی خان دورە •

# سەنگەر و سوپای خانی بتلیس

پەنا بە خوا لەبەر پیرە (عەبداڵ خان) کە غیرەتی باپیرانی خۆی لە دەست نەدابو و مەتەرێزێکی وای رێك خستبو کێوەکانی بتلیسی وەکو سەددی ئەسکەندەر قایم کردبو ، خۆرهەلاتی بتلیس ئەوەی بۆ رێگای ئووا دەچێ و شازێی وانە لە دەمی دۆڵێکدا ( کانی قەساب )ە و لای باکوریش بەرامبەر چیای (دەدێوان) لــە خوارەوەی کانێ قەســاب ( دێوان پەست ) هەیە • کێوێکی بلندە و لە پشتەوەشی کێوی بلندتر هەیە (ئۆلیخ)ی پێدەڵێن • لە لوتکەی بــەرزی دەدیوانەوە تا دەگاتــە گردی دێوانپەست کــە ماوەی تۆپهاوێژێك دورە نێوانی ئەم دو کێوە دۆڵێکی تەســکە ، ئەمبەرەوبەری ئەو دۆڵە کوردەکانی رۆژەکی وەکو مێرولــە خەریکی کنە و هەلکەندنن ، حەوت چێن سەنگەری یــەك لەژوریەکیان لێداوە و هەر ســەنگەرە ئالای تایبەتێ خۆی بە سەریەوە دەشەکێتەوە و ئەم کێوی دەدێوانە بۆتە یەگپارچە باخچە گولی رەنگاوڕەنگ ، هەمو سەنگەرەکان روپان لە ئێمەیە و بەسەر رێی ئووادا دەڕوانن بە جۆرێك کەس بڕستی جولانەوەی نیە ، ئەو دۆڵە کە تاقە رێگای شاری بتلیسە کراوە بە سەددی ئەسکەندەر و ئەوەندە قایم کراوە مەلی پێدا نافڕێ ، لە سەری دەدێوانی گەورە وەزیری خان (چاکرانی) بە سەدو پەنجا ئالاتفەنگهاوێژەوە هێزەکەی خۆی بە جۆرێك چێن لەسەر چێن دامەزراندوە کردویە بە ســەدی قەهقەها ، لــە دە دێوانی خوارێش (عەرەب خەلیل ئاغا) بە عەسکەرەکانیەوە خۆی داگرتوە !

پاشا که ئەمەی دی تێگەیشت که راستەوخۆ ئەمانە له گرتن نایێن ، له دیوانی خۆیەوە تاوێ بە پێ و ماوەییێك بە سواری بۆ راوێژ لەگەڵ فەرماندەکانا رۆیشتین تا سەر کێوێك کەوتین کە کێوی ( تەقلەبان )ی پێدەڵێن، راستییەکەشی ئەوەیە هەر زەلامێك لێرەوە خلێتەوە بە تەقلەلێدان دەڕوا و ناگیرسێتەوە تا دەگاتە ناو شاری بتلیس ، کە لەو سەرەوە تەماشای بتلیس‌مان کرد پەنا بە خوا شار و هەر چواردەوری وەکو دەریا شەپۆلی چەکدار جمەی دێ ، قەلای بتلیسیش هەمو بورج و شورەکانی تۆپی لێ دامەزراوە و عەسکەری بێژماریان پێوە دیارە ، هەمو ددانە و بورجەکانی بە ئالای رەنگاو ڕەنگ رازاوەتەوە •

پاشا زۆر بە وردی هەمو لایێکی ڕوانی ، پاشان فەرماندە کوردەکانی له خۆی کۆکردەوە و پێی گوتن « خوا یار بێ رۆژی پەلامار تۆ لێرەوە ••• تۆ لەملاوە ••• تۆ ئاوا بە سواری و بە پێ شوێنی هەژدە فەرماندەی دیار کرد و گوتی ئێوە لەم شوێنانەدا ئامادە دەبن ، ئێمەش له خوارەوە بە ڕێگای ئێوادا بە سوپای وان و هەکاری و دوازدە هەزار عەسکەری خۆمەوە پەلامار دەدەین ، هەر کاتێ ئێمە ئەڵلامان دەست پێکرد و تۆپەکانمان تەقاند ئێوەش لەم شوێنانەوە پەلامار بدەن ، بەڵام پیاوەکانتان تەمێ بکەن هەتا سەری هەنگی خان پان نەکرێتەوە دەست بۆ هەنگوێنی تالان نەبەن • جارێ کەس دەست بۆ ژن و منداڵان نەبات و ماڵان تالان نەکەن ، تا بۆتان دەکرێ خانم بۆ بگرن ، باخی خان داگیر بکەن ، گەمارۆی قەلا بدەن • » هەمویان بەلێ قوربانیان گوت و سوێند خورا و فاتیحا خوێندرا ، جا له گۆشەییێکی ڕێگای ئێوا له چیمەنێکدا دانیشتین و قاوەڵتی‌مان خوارد و قەرەوڵمان له چوار لاوە دانا •

لەبەر ئەوەی عەسکەرەکەمان زۆرە و گەلێکی تالانکار و شڕە خۆر تێدایە ، تاقمێك لەوانە ڕێك دەکەون و بە مەبەستی تالانکردنی دەوروبەری

بتلیس ملی رێگا دەگرن ، بە خۆیان نازانن تا بە سەر شەشسەد کەس لە عەسکەری رۆژەکیدا دەکەون و تێیان بەردەبن ، ئێمە لەگەڵ پاشا دانیشتبوین تەقەی تفەنگمان بیست بەڵام نەمانزانی چیە ، پاشا ناردی بزانن ئەوە چیبێ کە چۆن دەبینن کوردەکان سەری دوسەد تالانکار و شڕەخۆریان بڕیوە و ئەوانی دیکەیان لەگەڵ خۆیان بردوە و رۆیشتون • کە پاشا ئەم هەواڵەی بیست دەزبەجێ فەرمانی دا شوێنیان کەون ، (برایم بەگی مەحمودی) باڵی بە ئەسپەکانی خۆی گرت و گەیشتە سەریان و بۆ بە شەڕێکی قورس ، لەو شەشسەد کوردە تەنیا دوسەد و پەنجایان خۆیان گەیاندەوە ناو سەنگەرەکان و ئەوانی دی کوژران و کەلاکیان فڕێ درا ، کەللەسەری شەهیدەکانی خۆشمان لە شوێنێك نێژران •

ئێوارە پاشا لە دانیشتنا گوتی «کوڕە ئەو خانە نامەردەی من میوانی بوم و ناسیم وای خۆ پیشاندام کە تەنیا تەڕدەستێ و چاوبەستێ دەزانێ کەچی ئەوا دەرکەوت کە لە هونەری شەڕیشدا شارەزایە و گاڵتەی پێ ناکرێ ، وا دیارە لە زۆر لاوە بوسەی ناوەتەوە • با خێرا جارچی بەناو هەمو سوپادا جاڕ بدەن هەرکەس بچێ تالان بێنێ دەیکوژم » • ئەو شەوە فەرمان بۆ هەمو فەرماندەکان نێررا و قەرەوڵ داندران و بڵاو کرایەوە هەرکەس لە خێوەتی خوێدا ئامادە بێ ، لە خێوەت نەیێنە دەر و هەراوهوریا نەکەن ، سواری ئەسپ مەبن ، ئاگر نەکەنەوە و تفەنگ ناوێن » ، بۆ ماوەی تفەنگهاوێژێکیش قەرەوڵ داندران ، چونکو ئەو بەگە کوردانەی نەهاتبون بۆ کن پاشا مەترسێ دەست وەشاندنیان لێ دەکرا ، دەشترساین نەوەکو خانی بتلیس کە زۆر زیرەکە شەبەیخونمان بکاتە سەر ، بەڵام خوا ئاگای لێیە ئەو خانە پایەبەرزە بێئازار و بێوەی بێ ، لە حاڵێکا ئەو ئاگای لە هیچ نەبێ تاقمێك پیاوخراپی زمانلوس هێندەیان بە گوێی پاشادا خوێند تا ئەم شەڕەیان پێ نایەوە ، خانیش چاری نەما ، غیرەتی باپیرانی خۆی رەچاو

کرد و سێ چل هەزار عەسکەری لە خۆی خڕکردەوە ، لە قەڵای ئەخلات بەملاوە جارێ ئێمە لە خان و جارێك خان لە ئێمە دیل و کەللەسەری دەستاند.

جارێکیشیان بەگی پنیانش دیلێکی بۆ پاشا نارد کە زۆر زمانلوس و قسەزان بێ ، بە پاشای گوت « گەورەم ، ئەو خانە بێدینە لە کوردەکانی (یەزیدێ) و (خالتێ) و (چەکوانێ) و (باپیری) و (چەلۆیی) و (تەمانێ) و (مەتێرنێ) و (بزنێ) و (تانەکێ) و (کەوارێ) و (کەواشێ) و (بزێکێ) و (قەناخێ) بیست هەزار تفەنگ و چل هەزار سوارەی ئەسپی جلیتێن و هەڵبژاردەی کۆکردۆتەوە و بە فەرماندەیێ ( چاکراغا ) بە دۆڵی جەهەننەمی کێوی دەدێواندا ئەمشەو پەلامارتان دەدەن » ! ئەو کابرایە کە هاتە سەر باسی خان ئەوەندەی بە هێز و ئازایێ و شەڕکەرێ و لێهاتوییێ خاندا هەڵخوێند دەتگوت مەتحی (سامی نەریمان) و (ڕۆستەمیداستان) دەکا . هێشتا شانامەی خانی تەواو نەکردبێ پاشا ئیشارەتێکی ( شانر عەلێ ) کرد شێرێکی لە ملێ دا سەلکی پەڕیە سەر مافورەی ناو خێوەت .

پاشا خۆی ژمارەی سوپا و هێزەکانی عەبدالخانی دەزانێ و لێی نەدەترسا ، ئەو لەو هەمێ شەڕانەی پێشتر کردبێی قاڵ بێبێ و باکی لە شەڕ نەبێ ، بەڵام خوا وای ڕەزا لەسەر بێ کە ئەو ڕۆژە هەوای گەرما کاری لە پاشا کردبێ هێزی لەبەر بڕیبێ . وای لێ هات قسەی بۆ نەدەکرا . کەچێ بەو حاڵەشەوە هەر شیعری دەخوێندەوە و دڵخۆشێ خەڵکەکەی دەدایەوە . پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ گەورە و فەرماندەکان بڕیاری دا ئەو ڕۆژە ڕۆژێ بشکێنن. سفرەی نانی نیوەڕۆی بۆ ڕاخستن و لەسەر نانخواردن پێی گوتن « ئەی فەرماندەکانی ئالی عوسمان و ئەی پیاوماقوڵانی وان ، ئێمە گەیشتینە ئێرە و چەند ڕۆژە چاوەڕوانی هاتنی بەگە کوردەکانین نەهاتن ، تازە بە تەمای هاتنیان نین ، با هەتا زووە لەگەڵ خان لێك بدەین یا تەختێ یا بەخت ــ یا هەرە یا وەرە . » هەمێ گوتیان چێ تۆ بفەرمێی وا دەکەین . جا پاشا زرێی

لەبەرکرد و لەگەڵ ئاغاکانی خۆی چو بۆ خێوەتی محەمەد بەگی مەلازگردی بۆ تەگبیرکردن ٠

## ـ ڕوداوێکی تۆقێنەر ـ

پاش ڕۆیشتنی پاشا بۆ خێوەتی محەمەد بەگ ، من مامەوە لەگەڵ چەند خولامێك خەریك بوم فستق و بادامم دەشکاند بۆ بەربانگ ، لەپڕ دیتم ئەسپسوارێکی ڕەسەن بە دەستێك قەڵخانێکی چینی وکەوڵە بەوری بە دەستەوەیە و بە دەستەکەی دی شیرێکی ڕوتی پێیە تەنافی خێوەتەکانی سەر ڕێگا هەڵدەبڕێ و دێ هەر گەیشتە پێشەوە نەڕاندی «کوا مەلیك ئەحمەد پاشا ؟ » کە ڕوانیم کوردێکە دەڵێی دێو و درنجە ، گوتم « پاشات بۆ چیە ؟ » بە کوردی گوتی « ئەم ڕمبەی لە ورگی ڕۆ دەکەم ! » میفتاح کە خولامێکی ئەبازەی ساویلکەیە بانگی کرد « کوڕینە وەرن ئەم کوردە بکوژین و ئەسپەکەی لێ بستێنین» بەلام من لێیان توڕە بوم و بە کوردەکەم گوت «لۆلۆ، ئەمەتا پاشا» و خێوەتی کوێخا وێسفم پیشاندا ، خزمەتکارەکان دەستیان دابوە کوتکی سنگکوتان و تەور و چەقۆ دەیانگوت ئەم کوردە پەتیخێوەتەکانی هەڵبڕیوە ، کابرا کە باوەڕی کردبو ( کوێخا وێسف) پاشایە وەکو برۆسکە هەڵیکوتا سەری و پلارێکی نێزەی تێ گرت کوێخا وێسف لە ترسی ڕۆحی خۆی بۆ کونێك دەگەڕا لێی دەرباز بێ و هاواری دەکرد وەرن ئەمەم لەکۆڵ کەنەوە ، نێزە بەر سەرێتنی کوێخا کەوت و بلاوی کرد و تێیدا مایەوە ، کوردە شیری بە دەستەوە گرتبو هەرچی دەهاتە بەری لەتی دەکرد ، تا ئەو هەمو خەڵکەی لێی خڕ بوبونەوە برینێکی کاریگەریان لێ کرد ، بەلام ئەو وەکو سەگی هار دەستی دەوەشاند ، بیست کەس لە هاوالەکانی ئەم کوردە لە دەوروپشتی خێوەتی پاشا خۆیان ماتکردبو چاوەڕوانیان دەکرد بۆ ڕزگارکردنی برادەرەکەیان دە. تەو نێزە هاتنە پێشەوە،

لەبەر خێوەتی پاشادا چەند سەد کەسێك کۆبۆنەوە و کوردەکانیان خستبوە ناو خۆیان ، پاش شەڕێکی گەرم و خوێناویی عەسکەرەکان توانیان ئــەو بیست کوردە بکوژن و کەللەکانیان لەبەر خێوەتی پاشا هەڵواسن • خــوا ئاگادارە بە درێژایی ئەو گەشت و گەڕانەی بە دنیادا کردومە و چەند ئازاو بەجەرگم دیوە هێشتا کەس نەگەیوەتــە ئەم کوردانــە بــۆ چاوقــایمی و بێ‌ڕەزایی ! • گوایە ئەمانە نانخۆری خانی بتلیس بون و بڕیاریان داوە سەری خۆیان دانێن و پاشا بکوژن • پاشان کە پاشا بەمەی زانی وازی لە گەڕان بەناو خێوەتەکاندا هێناو زرێشی لە خۆی نەدەکردەوە •

**دیسان شتی سەیر :**

ڕۆژێکی ڕەمەزان پاشا بە هەزار کەسێك چەکدارەوە چوبو دوربەدور تەماشای سەنگەرەکانی خان بکا و منیشی لەگەڵ خۆی برد ، بە چاوی خۆمان دیمان کە چەند گابەردی زلی بەقەد فیلێك و ئەوەندەی گومبەزی گەرماوەکان یەك لە تەنیشت یەك داندراون و لە پەنایانەوە چاڵی وا قوڵی لێ هەڵکەندراوە بنی دیار نیە و بەجۆرێك ئەو ناوەیان بە کۆسپ و ڕێ‌بەنــد تەنیــوە کەس نەتوانێ لێی تێپەڕێ ، بۆ ئەوەی پێشی چونە بەرەوەی لەشکری عوسمانی بگرن هەزاران فێڵ و تەڵەکەی نەبیستراویان بەکارهێناوە ، بۆ بەرهەڵستی داری بڕاویان خستوتە سەر ڕێ و دۆڵی بتلیس‌یان کردۆتــە بەنــدەرگەی چالندەر ، مەتەریزی چین لەسەر چین و هەر چینە بەجــۆرە شەڕکەرێــکی تایبەتی پڕ کراوە • کەواتە ئەو هەواڵانەی لە بارەی بتلیسەوە دەمان بیســت ڕاست دەرچون ، بێجگە لەو فڕوفێڵانە گرد و دۆڵ و چیا و ملەی بتلیــس هەموی داخراوە و لە زارکی دۆڵی بتلیسدا بە هەزاران تفەنگی لەسەر پــێ خۆی مات داوە ، قەدپاڵ و سەر کێوەکان پڕن لە ڕەشماڵ و خێوەتی هەمە ڕەنــگ •

پاش روانین پاشا گوتی « هەر کەس دیلێکم لەناو ئەم سەنگەرانـەوە بۆ بێنێ سەد زێڕی دەدەمێ » ، (عەلیخان) لە کوردەکانی مەحمودی گوتـی « بە مەرجێ نەیکوژی من یەکێکت بۆ دێنم » ، پاشا بەڵێنی دا ، عەلیخـان بە بەرچاوی ئێمەوە تفەنگەکەی کردە شانی و ئەوەندەی بلێی یەکودوَ خۆی گەیاندە مەتەرێزی بەرامبەرمان و چوە نـاوەوە ، دوای تۆزێـك لەگـەڵ زەلامێکی ئەواندا هاتە دەرو هێنایە بەردەمی پاشا • پاشا لێی پرسی «کابرا بلێ بزانم ، خان چەند عەسکەری هەیە ؟ » ئەویش راست و رەوان گوتی « قوربان ، ئێمە و خان حاڵمان حالی سەگە ، لەو رۆژەوە ئێوە هاتونە تەحتی وان بوین بە سەگی چوارچاو ، ها ئەمڕۆ دەبێتە شەڕ و ها سـبەینێ ، لـە خوامان گەرەکە زوَ لێکدەین یا هەرە یاوەرە و لەم تێوانی وەڵڵا و بیللایـە رزگار بین ، وامان لێهاتوە چاومان لەو چەند قرۆشەوەیە لە سعردەوە بۆمان دێ ، بەجارێ جاڕز بوین ، خان زۆر کەسی لەوانە کوشتوە کە ڕایانکردوە ، ئەم هاتنەی تۆ ئێمە و خانی بە هیلاك بردوە ، تەنانـەت دوێنێ دەستەیێـك عەسکەری برسی هەڵیانکوتاوەتە سەر باخیخان و چی ئازوَقەی تێدا بـوە بردوَیانە و دەنکە گەنمێکیشیان بۆ خان نە هێشتوتەوە ، خۆ خەڵکەکە ئەوە هیچ کە زۆر برسی و پەرێشانن ، لەولاشـەوە ئـەوا سوپـای دیاربـەکر گەیشتۆتە پێشەوە و باوکەڕۆی بە خان و سـوپاکەی خستـوە ! » پاشـا بەبیستنی ئەم هەواڵە خۆشە دە لیرەی دا بە کابرا و ئازادی کردو هەر وەکو گفتی دابوَ سەد زێڕیشی دا بە عەلیخان •

**چمکێك لە کەرامەت و پیاوچاکی مەلێك ئەحمەد پاشا :**

پاشا گەڕایەوە ناو خێوەتی خۆی و ئاغاکانی وانی لە خۆی کۆکردەوە و پێی گوتن « ڕۆڵەکانم ئاغاینە ، دەزانم ئێوە بەڵێنتان داوە خوێنی خۆتان لە پێناوی دەوڵەتدا برێژن و تا ئێستا چەند شەڕی مەردانەشتان کردوە ، بەڵام با پێتان بڵێم ، گریمان ئەو کوردانەی لەناو ئێمەدان هەموَیان هەڵگەڕانەوە و

دەستیان دایە شێر و وێکڕا پەلاماریان داین و منیش بانگم کردن ــ دەی تورکە غازی‌یەکانم ــ ئێوە چدەکەن ؟ »[٢٦] ئاغاکان گوتیان «هەتا هەمومان دەبینە فیدای دەوڵەت ، سەر دەدەین و سەر دەستێنین و هەتا دەکوژرێین هەر دەست دەکەینەوە • »بەم قسەیە پاشا فاتیحایێکی خوێند و دەستی بە دەموچــاویدا هێنا و هەستــا رەمبەکەی دەستی سیلاحدار ئاغای وەرگرت و سواری ئەسپەکەی خۆی بۆ ، دۆ سێ جار ئەمسەرەو ســەری لینــگدا و پاشان راست رۆی کردە رێگای ئۆوا . ئاغاکانیش بە سواری دۆی‌کەوتن •

لە دۆرەوە نزیکەی دۆ سەد سوارێکی کوردیــان بینــی لەسەرخــۆ دەڕۆیشتن ، ئاغاکان گوتیان « قوربان ئۆردومان بەجێ‌هێشت ، ئەمە سنوری خانە نەوەکو ببینە نیشانە » پاشا گوتی «ئەدێ ئێمە پێکەوە فاتیحای شەڕمان دانەدا ؟ چۆن ئەو فاتیحایە بە هیچە بڕوا ؟ ئەم تاقمە کوردە وا لە ئــۆردۆ جیابۆنەتەوە و دەڕۆن لە چ هۆزێکن ؟ » وانی‌یەکان گوتیان « بەخوا ئۆردۆی ئێمە هەزار چەشنە میللەتی تێدایە ، ئەمانە وادیارە دەچن بۆ چیلکە و ئاگرودۆ هێنان ، خوا دەزانێ هی کام لان • » ئەو کوردانــە زۆر لــە ئۆردۆ نزیــك بۆبۆنەوە ، سۆکە قەرەوڵەکانی پنیانش بە (خۆ)یان زانیبۆن و دەنگیان نەدان هەردۆلا پێك‌وەربۆن و تەقە دامەزرا • پاشا گوتی من فاتیحاکەم بۆ ئەمە بۆ، یاڵڵا دەی ، کاتێکمان زانێ قەرەوڵەکانمان کە سەریان لێ شێوابۆ هەڵاتن و کوردەکان بە دوایاندا ، لێیان‌دەدان و دەیان‌نەڕاند « خــان ، خان »یــان دەگوت • ئاغاکان گەیشتنێ و لەگەڵیان کەوتنە شەڕەوە ، پاشاش بە خۆی و

---

(٢٦) بەڵگەیێکی زۆر رۆنی رەگەزپەرستێ عوسمانی‌یەکان لێرەدا دەکەوێتە رۆ، ئەو لەشکرە کوردەی مەلێك ئەحمەد پاشا هێنابۆیە سەر بتلیس ، سەدی نەوەد و پێنجی کورد بۆن و هەر ئەوانیــش حکومەتی بتلیســیان بــۆی روخاند ، کەچێ پاشا ئاغا تورکەکان لە خێوەتەکەی خۆیدا کۆدەکاتەوە و پێیان دەڵێ تەنیا پشت بەوان دەبەستێ و کوردەکان لە هێچ بارێــکدا جێی بڕوا و متمانەی ئەو نین .

حەوسەد هەشسەد کەسەوە فریا کەوت ، قەرەوڵە هەڵاتووەکانیشمان بە هاتنی ئەم یارمەتیە تێر بوونەوە و گەڕانەوە بۆ شەڕکردن ، شەڕێکی گران دامەزرا ، پاشا بە دەستی خۆی سێ کوردی کوشت ، لەم دووسەد سوارە کوردە کەمیان بە ساخی دەرچوون چەند کەسێکیان لێ بە دیل گیران ، پاشا لێی پرسین ، گوتیان « ئێمە دووسەد کەسێك فیدایی بوین لە پێناوی خاندا لە گیانی خۆمان بووردین و یەکە یەکە خۆمان هاویشتە ناو سوپای ئێوەوە تا لە دەرفەتێکدا توشی (محەمەد بەگی مەلاز گردی) ببین و بیکوژین، بەڵام زانیمان کە ئەو چۆتە دەرەوە ، ئێمەش دەگەڕاینەوە توشی ئەم قەرەوڵانە بوین گوتمـان با بـە دەستی خاڵی نەچینەوە تێمان سرەواندن ، کەچی ئێوە لێـرە بوون و لێـمان تێکچوو . خوا ماڵی خان وێران کا و چاوی کوێر بێ » .

لەم شەڕەدا پاشا سەد و هەشتا و پێنج کەللە سەر و دووسەد ئەسـپی دەسکەوت و لای ئێوارە گەڕاینەوە ، لەنـاو هەمـوو ئۆردوودا دەمـاودەم بڵاوبووەوە کە پاشا کەراماتی هەیە و هەر دوعایێك بیکا جێ دەگرێ . بـۆ بەیانی ئەو ئاغایانەی بەشداری شەڕەکەیان کردبوو خەڵاتی گرانیان درایێ و چەنگاڵی زێڕیان لەسەر چەقێنرا ، پاشا کوێخا وێسفی راسپارد کە « لەگەڵ هەموو میرلیوا و فەرماندە و ئاغاکاندا هەتا دەتوانی قسەت خۆش بێ و چیت لەبارایە چاکەیان لەگەڵ بکە ، تا پێتدەکرێ دڵخۆشییان بـدەوە و بـۆ شەڕکردن ئامادەیان بکە . » خوا هەڵناگرێ کوێخـا وێسفیـش درێـخی لێ نەکردن .

بۆ رۆژی دوایی دەرکەوانێکی ئەستەمووڵ هات دەسخەتی موبـارەکی سوڵتانی هێنا بوو کە دەڵێ « هەرچی سەگوان و ساریجەی ئەیالەتی وان هەیە یەکێکیان لێ مەهێڵەوە و هەموویان سەر ببڕە ! » کە ئەمە خوێندرایەوە پاشا گوتی «فەرمانی سوڵتان لەسەر سەرم» و لە ساریجەکانی خۆی سەد کەسێکی

لێ کردن بە ئاغای ژۆرەوە و گوتی « ئیشەڵلا پاشان فەرمانی سوڵتان بەجێ دێنین » چۆنکو بۆ شەڕ دەچۆ چاوپۆشی لێ‌کردن •

لە کوردەکانی وان کوڕی ( تەتار بەگی شیروان لـەگەڵ کوێخـا و سێ‌هەزار چەکداری گەیشت ، (کوێخا وێسف) خەڵاتی دانێ و کردنی بـە یەدەگی لەشکر ، پاشا لەوەی کە بەگ خۆی نەهاتوە تۆڕە بۆ ، بەڵام بەسەر خۆی نەهێنا ، هەر ئەو رۆژە کوێخای بەگی هیزۆن بە پێنج هەزار چەکدارەوە هات ئێرران بۆ لای خانی پاپش کران بە قەرەوڵ ، دیســان بـەگی کارنی کوێخای خۆی و دۆهەزار کەسی ناردبۆ ئەویش کرا بە قەرەوڵی لای دزەخان، بەگی سعردیش دۆهەزار کەس و کوێخاکەی گەیشتن کران بە قەرەوڵی ناو بەردی چیاکان •

ئەم چوار بەگە کە بە نابەدڵی چەکدارێکی کەمیان ناردبۆ و خۆیـان نە هاتبۆن دڵی پاشایان زۆر ئێشاند ، بەڵام هۆزەکانی (گەڕگەڕ) و (زریقی) و (کورلارك) و (مەکس) و (کەسان) و (ئاغا کیس) و (بەنێ قەتور) و (بەردەع) و (ئەرەجك) و (شورگەر) و (چۆپانلۆ) و (دالەگەر) نە بەگیان هاتبۆ و نـە یارمەتێ و نە هەواڵێك ! پاشا لە ترسـی ئەوەی نەوەکو لـە کاتی شـەڕدا چەکدارەکانی ئەم چوار بەگە هەڵگەڕێنەوە و یاخێ ببن ، یەکی ئاغـایێك و دۆسەد عەسکەری بە سەرەوە دانان و پێی گوتن وریا بن •

لەم رۆژەدا ئەو نامەبەرانەی بۆ دیـاربەکر چۆبـۆن ، کێواوکێو بـە بێ‌رێدا هاتنەوە نامەی والێ دیاربەکریان هێنـا کە پۆختـەکەی ئەمەیـە «نامەکەتان گەیشت ، داوای یارمەتیتان کردبۆ و فەرمۆتانە رۆژی بیست و پێنجی رەمەزان دەچینە سەر بتلیس . ئێمەش وا هاتین و ئێستا لە خوار قەڵای کفندڕین ، جا ئەگەر ئەو بڕیارەی دابۆتان وەکو خۆی ماوە ئێمەش سبەی دێینە سەر شاری بتلیس ، چاوەرێی فەرمانتانم • » پاشا ئەم خەبەرەی زۆر

پێ خۆش بۆ سەد لیرەی سوری دا بە نامەبەرەکە و وەڵامی نارد کە « بەڵێ سبەی دەچینە سەر بتلیس » ٠

سەیر لەوەدایە کە هەر لەم رۆژەدا عەسکەرەکانی خان لە تاوی برسێتی دەستیان بە هەڵاتن کردو دەهاتنە ناو سوپای ئێمەوە ، پاشا کە بیستی عەسکەرە کوردێکی زۆر هەڵاتون و لەناو هێزی بەگە کوردەکاندا بڵاو بونەتەوە لەوە ترسا ئەمە فێڵ بێت و لە کاتی پێویستا دەستمان لێ بوەشێنن ، بۆیە جارچی خستە ناو ئۆردووەوە کە هەرکەس کەللەی یەکێك لەوانە بێنێ کە لە سوپای خانەوە هەڵاتون پەنجا زێڕ و ئەسپێکی دەدرێتێ ، ئەو شەوە نزیکەی سێ هەزار کەس لە عەسکەرەکانی خان لەناو ئۆردووەوە هەڵاتن و رۆیان کردەوە کێو و باخەکان ٠

بۆ سبەینێ کە هەمو عەسکەرەکانمان بە ئامادەیی راوەستابون ، لەلای چەپی کێوەکانەوە دەنگی تفەنگ هات و بو بە هەرا هەرا ، قەرەوڵەکان حەفتا کەسێکیان گرتبو هێنایانن ، پاشا لێی پرسین ئێوە چین ؟ گوتیان ئێمە هەندێکیمان پیاوی خانین و هەندێك دیاربەکرین و بتلیسین لەبەر زوڵمی خان و لەتاو برسێتی خۆمان ویستمان بەناو چیاکاندا سەری خۆمان دەرکەین کەچی گیراین ، پاشا ئەمانەی دایە دەست سێسەد کەس لە عەسکەرەکان کە هەتا ( دۆڵە جوان ) بەڕێیان بکەن ٠

**خەونی مەلیك ئەحمەد پاشا :**

پاشا ئەو بەیانییە لەناو ئاغاکاندا بڵاوی کردەوە گوتی « من ئەمشەو خەونێکی سەیرم دیوە ، شارە مێروولەیێك بە لاقم هەڵدەگەڕان بەڵام ئازاریان نەبو ، تەنیا یەکێکی زلەیان تێدا بو هات بە بەلەکم دا نوسا ، زۆری ئێشاند ، منیش لاقی خۆم داتەکاند مێروولەکان بەربونەوە و مردن ، لەوانەی مابون شازدەیانم دا بە ئەولیا تا بیانباتەوە کونەکەیان ، چەند دانەیێکیشم دا بە ئاغای

وان دەمیرچی ئوغلی ، ئەوجا گەڕام تا ئەو میرۆلەیەم دۆزی‌یەوە کە گەزتبۆمی و گوتم گوایا تۆش ئازاد کەم ؟ دامە دەست وێسف ئاغا گوتم کاری ببینە ، ئیدی مێرولەکانی دیکەم پێ‌لێ‌خست و پانم‌کردنەوە • »
( مەلا محەمەدی هەکاری ) گوتی « ئەو مێرۆلانەی کوژران دەکوژرێن و تۆش لەگەڵ خانا ئاشت دەبیتەوە و ئیدی مێرۆلەیێکیشت پێ ئازار نادرێ،»
منیش گوتم « سوپای خان دەشکێ و ئەو مێرۆلانەی دابۆتن بە من ئەو دیلانەن کە بە منیان دەبەخشی و دەمدەیەوە • » پاشا گوتی « هەردوکتان باشتان لێکدایەوە ، یاخوا خێر بێ » •

ئەو ڕۆژە دەستەیێك مەلا و پیاوماقوڵی شاری بتلیس هاتنە خزمەت پاشا و پاش بەڵێن دانی چەند سەد کیسە تکای ئاشت بونەوە لەگەڵ خانیان کرد ، پاشا تکای نەگرتن پێی گوتن « من لە وانەوە نامەم بۆ نوسی و داوام لێ‌کرد بێتە دیوانی شەرع و نەهات ، ئێستا کە ئەم هەمو سوپایەم کۆکردۆتەوە و چەندم ڕەنج لەگەڵ کێشاوە فایدەی نی‌یە ، پێی بڵێن با ئامادە بێ یا هەرە یا وەرە ! خەڵکەکە بە دەستی خاڵی گەڕانەوە •

★ ★ ★

# شەڕی قورس و شكانی خان

ڕۆژی چوار شەمۆ بیست و چواری ڕەمەزان ساڵی هەزار و شێست و پێنج تاریك و ڕۆنی بەیانێ چاوەشەكانی ئۆردۆ دەستیانكرد بە ( نەبـاها ) كێشان و عەسكەر سواری ئەسپەكانیان بۆن •

فەرماندەكان هاتنە خێوەتی پاشا دوعای بۆ كردن و هەر یەكەیانی نارده ئەو جێیەی بـۆی دیار كراوە ، تفەنگچییەكان هەر بە شـەو چۆبۆنە ناو ئەو بۆسانەی بۆیان داندراوە ، لە ناوەندی سوپادا لای پاشا یەنیچەریە سەر بـە تەپلەكان و سەگوان و ساریجە و چەكداری پیـادە تێكڕا هەشـت هەزار كەسێك مابۆوە ، هەشـت هەزار عەسـكەری هەڵبژاردە لەگەڵ ( بـەگی مەحمودیێ) بۆ قۆڵی راست ، شەش هەزار لەگەڵ ( بەگی مەلازكرد ) بـۆ قۆڵی چەپ ، ( شەرەف بەگی بایەزید ) بە شەش هەزار كەسەوە بۆ ناوەند ، بەگەكانی ( ئەرجیش ) ، (عادلجەواز) ، (مۆش) ، (تەكمان) ، (قوڕۆجان) ، (پاسـین) ، (عۆنیك) و (خەنەس) بۆ لای راسـت • (كارنێ) ، (هیزۆن) ، (سعرد) ، (مەكەس) ، (شروێ) و (كەسان) ، بۆ لای چەپ ڕۆیشتن • دوازده هەزار عەسكەری هەكارییش بۆنە چەرخەچێ پاشا واتە لە بەردەمی ئاڵای پاشادا بۆنە پێشڕەوی سوپا ، فەرماندە كوردەكانی دیكەش بـە دە هەزار عەسكەر و هـەمۆ خزمەتكارەكانەوە وەكو مەیتەر و پینـەچێ و عەكام و چراچێ و ئۆردۆچێ و بازارچییەوە لە دواوە بۆنە بنكڕی سوپا ، فەرمانی

قەرەوڵ داندران دەرچۆ • قۆڵی راستی وان لای راستی پاشاو قۆڵی چەپ لەلای چەپی ئامادە راوەستان ، پیادەکانی قەلای وان و نەفەری قەلاکانی دیکە لەگەڵ عەسکەرە پیادەکانی هەکاریێ ، لە چەکداری دەروازەکان شەش فەوج یەنیچەری و جبەچیێ و تۆپچی کە تێکڕا دوازدە هەزار پیـــادە بۆن و بیست و هەشت پارچە ئالایان هەڵکردبۆ ، پەنجا تۆپی شاهانە و دە تۆپی کولومبورنێ و چوار تۆپی بالیۆمزی کە عەسکەری هەڵبژاردەی باشلێ و داشلێ و حەسەنێ و حوسێنێ بەئاسپایێ لەملاولەولای تۆپەکانەوە دەڕۆیشتن و سێ هەزار پیادەی فیدایی لەپشتیـــانەوە دەهاتن ، سێ سەعات و نیوی تەواو بەمجۆرە راوەستان ، پاشا زرێی لەبەرکرد و شیری کردە شانی و نوێژی کرد و لەگەڵ ئاغاکانیدا بە دەنگی بەرز فاتیحایان خوێند . پاشان وەکو تاوس بە لەنجەولار هاتە دەر تەماشایێکی سەعاتەکەی کرد و سواری ئەسپ بۆ ، چاوەشەکانی دیوان تێکڕا هاواریان کرد « خەزات پیرۆز بێ و ســەرکەوتو بێ و عومری ســولتان درێژ بێ ، هــەر بژێ دەولــەت » پاشــا یەك دۆ ئەمسەرەوسەر بە بەردەمی خەلکەکەدا هات و سلاوی لێ کردن و ئەوانیش وەلامیان دایەوە • لەوکاتەدا برایم ئاغای ئەمینی سندوق چل مەڕی لە بەرپێدا سەر بڕێ ، لەو مەڕانەی کوژرانەوە سێیانیان پاش سەر بڕان هەستانــەوە سەر پێ یەکیان سەلکەکەی تەکەتەکی بۆ و دوانیان بە بێسەر رۆ لە سوپای خان کەمێك بە لەقەلەق ڕۆیشتن جا کەوتن ، عەسکەر کە ئەمەیان دێ بــە هاواری ( ئەڵلا ئەڵلا ، ئەمە نیشانەی خێرە و ئێمە پیــاوە غەیبییەکانمــان لەگەڵدایە ) ئەو ناوەیان پڕ کرد •

تەپڵکوتەکان ئیزنیان خواست کە دەست پێ بکەن ، بەڵام پاشا گوتی جارێ ، خێرا چاوەشــی هەمۆ ئالاکان بێن ، کە هــەمۆ هاتن پێی گوتن بگەڕێنەوە ناو سوپا ، با گشت عەسکەرەکان (فەتحی شــەریف) بخوێنن ، ئەوانەی نایزانن ( ئیزا جائــە ) بخــوێنن ، چاوەشەکان ئــەم فەرمانەیان

بەجێ‌گەیاند • بەم‌جۆرە ئەو هەمو عەسکەرە لەســەرخۆ بە دەشتی ڕێی ئووادا هاتن و چاوەشەکان بەناویاندا دەگەڕان و دەیانگوت

**« خەزایی‌یەکان ، بزانن و ئاگادار بن ، ئەمڕۆ ڕۆژی کەربەلایە ، ئەم دوژمنەی بەرامبەرتان دوژمنی گیان و دینتانە ، ئەمانــە یەزیدین ، بڕ و بیانوی تیــدا نەماوە ، ئەمڕۆ ڕۆژی عوسمانی‌یە ! »**

بەم جۆرە خەڵکیان هاندەدا و دەڕۆیشتن هەتا سەنگەرەکانی خان دەرکەوتن، بە فەرمانی پاشا سێ‌جار بانگی محەمەدی هەڵدرا و نۆ چین تەپڵی فەرماندە کوترا بە جۆرێکی وا ئاسمان دەنگی دایەوە • بریقەی ڕمب و تیزە و ئاڵاکان ئاوی چــاوی دەبرد ، چەند هەزار ئاڵا بەجارێ دەشــەکانەوەو شریخەیان زراوی زراوداری دەبرد ، چیمەنی ڕێگای ئووا بــە دەنگەدەنگ و قیــژە و هاڕەی ئینسان و ئەسپ و ئێستر و وشتر بوبوە ڕۆژی حەشر و تۆزی پێیان وەکو هەورێکی ڕەش بارانی خۆڵی بەسەر عەسکەری خاندا دەباراند • ئەو حەشامەتە بە جۆرێك چین‌چین و قات قات نیشتبونە سەر یەك کە هیچ کەس ماوە و دەرفەتی گەڕانە دواوەی نەمابو ، هەمو وەسێتیان بۆ یەکتر دەکرد و گەردنی یەکتریان ئازا دەکرد •

کە گەیشتنە مەودای تۆپ‌هاوێژێك ڕاوەستان و فەرماندەکان هەریەکە ڕوی کردە ئەو شوێنەی بۆی دیار کرابو ، لە پێشــەوە (بەگی مەلازگرد) ڕوی کردە (چاکراغا)ی وەزیری خان لە کێوی (دەدێوان) ، (بەگی کارنێ) بەرەو (کێوی ئاویخ) بۆ (عەرەب خەلیل ئاغا) ڕاوەستا ، کە خەبەر بە پاشا گەیشت لــە هەر چوار لاوە دەوری شــار دراوە ئیشارەتی دا تۆپــەکانی کولۆمبۆرنێ و بالیۆمزە و شاهانە هەمو پێکەوە گرمژنیان کرد و گوللەکانیان بەر زەلام و چیا و ڕەوەزەکان کەوتن ، خەڵکی ناو سەنگەرەکان کەمێك بڵاو بون و گەڕانەوە جێی خۆیان ، ئەمجار ئــەوان وێکڕا نەعرەتەی خۆیانیان کێشا و گرماندیان ، عەسکەرەکانی ئێمەش وەڵامی نەعرەتەیان دانەوە •

من لەم بازاڕی کڕین و فرۆشتنەدا واقم وڕمابو • پاش چەند دەزڕێژی تۆپ کەلەبەر کەوتە مەتەریزی دوژمن و عەسکەرەکانمان دەستەو شیر هەلیان کوتایە ناو سەنگەر و ئەوانیش بە شیرەوە بەرەو ڕویان هاتن ، لە هەردو لاوە تۆپ دەتەقێ و عەسـکەرەکان کەوتبونە ژێر گڕی ئاگری نـەمرودەوە ، دەتگوت ڕۆژی حەشرە چڕە دوکەلی باروت بەری ئاسمانی گرتبو، (چاکراغا) لەسەر لوتکەی دەدیوان زۆری خۆ گرت و شـەڕی کرد ، بەلام بەگەکانی مەلازگرد و مەحمودی هەلیانکەند و بەرەو خواری شـاری بتلیسیان ئاوا کرد ، پاشـا فەرمانی دا بە هێزی وان کە لە دۆلی قەسابدا قەسـابێ بکا و زیندەوەر نەهێلێ ، لە سەنگەرەکانەوە خوێن سەری کرد و بەردێك نەما بـە خوێن ڕەنگ نەکرێ •

لەو کاتەدا پاشا بانگی کردم دەستەسڕێکی خۆی دامێ و ناردمیە لای برایم بـەگی مـەحمودی ، منیـش بە شەش خولامەوە گەیشـتمە لای دەستەسڕەکەم دایێ و پێم گوت « جەنابی بەگ ، پاشا سـەلامت لێدەکاو دەلێ غیرەتەکە هێ من نیە هی بنەمالەی مەحمودیە ، با بیان بێنم لە پێناوی دین و دەولەتدا چ دەکەن ، خوا هاریکارتان بێ » دوا بە دوای قسەکەی من ( برایم بـەگ ) ڕوی‌کردە عەسـکەرەکانی و گوتی « کوڕینە ، کێ خوا و پێغەمبەری دەوێ زرێیەکەی داکەنێ » نزیکەی سێ هەزار کەس زرێکانیان داکەند لەسەر یەکیان دانا و هەزار کەسێکیان لە لایان بەجێ هێشت و هەمو دەستیان کردە ملی یەك و گەردنی یەکتریان ئازا کرد • من لەوە نەگەیشتم، چونکو خەلك زرێ بۆ ڕۆژی شەڕ لەبەردەکا ئەمان بۆچی فڕێیان دان ؟ پرسیارم کرد ، گوتیان « ئێمە دەچینە ناو شـەڕە تفەنگەوە کە بونی زرێ زۆر خراپە ، هەر کەسێکی زرێلەبـەر گوللەی بەرکەوێ ئەگەر نەشیبڕێ بەجۆرێك ئالقەی زرێ بە گۆشتیدا دەچێتە خوارەوە پرزەی دەبڕێ ، خۆ

ئەگەر زرێی لەبەردا نەبێ گوللە لەشی کون دەکا و دەچێتە دەرێ ، یا پاکی دەکاتەوە و دەیکوژێ یا برینەکەی چاك دەبێتەوە • »

چاوم لێ بـو دوبەدو لە ئەسپەکانیان دادەبـەزین و بـە بەردەکاندا هەڵدەگەڕان و پەلاماری سەنگەرەکانیان دەدا ، من هەروا بە سـەر پشتی ئەسپەکەمەوە چەقیبوم روم نەدەهات بگەڕێمەوە و هەروا مامەوە ، خـوا ئاگادارە هەر ئەوەندەم زانی بەری چاوم تاریك بو و سەرم سوڕا لە هەردو لاوە گوللە وەکو رەهێڵەی بەهار داباری ، هەندێك کەوتن و سارد بونەوە، هەندێك کەوتبون و دەیانویست هەسـتنەوە و هەندێکیدی دەیانناڵاند و هاواریان دەکرد •

هێزەکانی ئەولاشمان لەگەڵ گرمەی تۆپەکان لە بەشی خۆرهەڵاتەوە بە ناو دۆڵی ئەسکەندەردا لە شار چونە پێش ، عەسکەری ئەرجیش چونە ناو دۆڵی ئۆیخ و پیـاوەکانی عادلجـەواز گەیشـتنە دۆڵی تەقلـەبان • عەسکەرەکانی وانیـش وەکو گورگ بکەوێتە ناو مێگەلی بێ شـوانەوە بریندار و مردویان دادەپەلۆسی ، بەگەکانی مۆش و تەکمان چونە ناو دۆڵی قەنـاخ ، لە دۆڵی ئۆیخـدا بـەگەکانی قوروجان و پـاسین رژانە نـاو سەنگەرەکانەوە••• بـە کورتی لە هەر چـوار لاوە تەنگیان پێ هەڵچنین و دایاننە بەر دەمی شیر • کوردەکان خۆیان گەیاندە سەنگەرە قایمەکانیان و هیوایان خستە سەر هێزی باسکی خۆیان و بە هەمو دڵێکەوە خۆیان بۆ شەڕ ساز کرد ، ئەوانی دەرەوەی سەنگەرەکان کە زانیيان عوسمانی و وانیيەکان ئابلۆقەیان داون خڕ بونەوە سەر یەك و وەکو تۆپ لێك ئالان و بە وێنەی سەگی هار کەوتنە شالاو هێنان ، هەردولا ئەللا ئەللایان دەگوت و لێکتریان دەدا • ئەو رۆژە خوا هێز و دەسەلاتێکی وای دابو بە عەسکەرەکانمان کە لەناو سەنگەرەکاندا بەسەر گاشە بەرد و رەوەز و ماهی سەختا ، بەناو چاڵ و

بۆسه و تەڵەی سەر ڕێگادا هەر بۆپێشەوە ملیان دەنا ، سوارەکانمان بێ باکانە ئەسپەکانیان تاو دەدا شیریان دەوەشاند و سەریان دەپەڕاند •

پیاوەکانی چەلۆی هەکاری کە دیتیان سەنگەرەکان بە ڕێژنەی گوللە ڕێگای چونە پێشـەوە یان نادەن لە پشتەوە بـە ناو ڕەوەزەکاندا بۆیـان سەرکەوتن و بۆ بە شیرلێدان ، تومەز لەمەوپێش دوژمنـایەتی خوێنی لـە نێوان چەلۆیی‌یەکان و ڕۆژەکی‌یەکاندا بوە ، هۆزی چەلۆیی ئەم هەلەیان بە دەرفەت زانیوەو وێڕای سوپای وان دەستیان بە لێدانیان کرد ، سێ سەعاتی تەواو شـەقەی شـیران هات و کەسـ جێی خۆی چۆڵ نەکرد هەتا لـە شەڕکەرەکانی خان یەکێکیش بە پێوە نەمایەوە، هەرچی مابو ئەو برینداز و دەست و لاق شکاوانە بون کە هەر یەکەیان کەوتبوە دەست چەند سەربڕێکی بێ ڕەزاوە ، عەسکەرەکانمان ئەوەندەیان مـل هەڵبڕیبو سـەلکەنیان پێ هەڵنەدەگیرا ناچار بـون لوت‌و گوێیان دەبڕین‌و سەرەکانیان فڕێ دەدا ، هی‌وایان تێدا بو بیست کوێچکەو دە لوتی هێنا بو، یەکێکی دی چل گوێ و بیست کەپوی پێ بو •

بەڵام پیاو بە ئینسـاف بیگێڕێتەوە ، سەرکەوتن بە دەسـت خوایـە ، قارەمانەکانی ڕۆژەکی هەتا بڵێی ئازا و بە جەرگ بون ، ئەمانە کە زانی‌یـان شکاون و دەورە دراون عەسـکەرەکانی خان لەگەڵ فەرماندە و سـەرەك هۆزەکانی (مۆدەکی) و (سورپایی) و ئەوانی دی کفنیان لەبەر کرد و لەگەڵ (مۆسلی ئاغای دۆلی گەندەڵ) شانیان پێکەوە نا و پێشی چەلۆیی‌یەکانیان گرت و بەرەودوا هەڵیـان‌بڕین ، چـل ئالای دیکەی خان لەملا و لـەولا خڕبونەوە و هەمو وێکڕا بە دەزرێژی تفەنگ کارێکیان بە عەسکەرەکانمان کرد کە هەرچی کەوتە بەریان یەکی بـە ساخی لێ دەرنەچو و کەلاك وەکو حەسیر لەو سەربەردانە ڕاخران ، بـۆ نەگبەتی عەسـکەرەکانمان خۆیان هاویشتە یەکێك لە سەنگەرە چۆڵەکانی هێزی بتلیس کە ببێتە پەناگایان و

پێشی کوردەکانی بتلیس بگرن کەچی لە قەلآی بتلیســەوە حەوت تۆپیان هاویشتە ئەو سەنگەرە و عەسکەرەکانمانیان وەکو ئاردی ناو دڕکان پەرش و بلآوکرد و شەڕکەرەکانی خان بیءوەی مانەوە •

**راوێژ و تەگبیرکردن :**

هەمۆ فەرماندەکان لە یەك جێ کۆبۆنەوە بۆ چارە دۆزینەوە « کوڕە کار لە کار ترازا ، شەڕکەرەکانی ئێمە چۆن بۆ تالآنی شار و عەسکەرەکانی خانیش خەریکن خۆیان دەگرنەوە ، چار چی‌یە ؟ » منیان ناردە کن پاشا بۆ داوای یارمەتی ، منیش وەکو برۆسکە خۆم گەیاندێ و پێم گوت « پاشا ، بەگە کوردەکان سلآوت لێدەکەن و داوای چەند هەزار عەسکەرێك دەکەن بگاتە یارمەتی‌یان » بەسەرهاتەکەشم بۆ گێڕایەوە • پاشا کوێخا وێسفی کردە سەرداری سێ هەزار عەسکەری پاشایی و پێی گوتن « یەکی پارچەیێکی سپی بکەنە ملی ئەسپەکاتتان و هەر دۆ لکی مێزەرە پاشایی‌یەکاتتان بەملاولادا بەردەنەوە » چونکو عەســکەرەکانی‌خان و عەسکەری کوردستانی پاشــا مێزەر و سەر و بەرگیان وەکو یەکە ، تەنانەت لە شــەهید و بریندارەکانی خۆمان چەند سەلکێکیان بۆ پاشا هێنابۆ و خەلآتیشیان پێ وەرگرتبۆ ، من گەڕامەوە بۆ کن بەگە کوردەکان و مزگێنی یارمەتیم بۆ بردنەوە •

کاتێ سێ هەزار عەسکەری هەڵبژاردەی کورد و سێ‌هەزار عەسکەری پاشایی بە فەرماندەیی ( کوێخا وێسف ) گەیشتن لە هەر چوار لاوە دەمیان ژەندە مەتەرێزەکەی خان و بۆ بە شــەڕێك ئەوسەری دیار نەبێ • هــەر ئەوەندەمان زانی کوتوپڕ عەســکەرەکانی خان دەستەو شــیر لە مەتەرێز دەرپەڕین و وایان هەلکوتایە سەرمان کە عەسکەرەکانی ئێمە هەر یەکی بە لایێکدا هەلآتن ، پاشان بە هەزار حاڵ توانیمان لە ناوبەردان خڕیان‌کەینەوە، عەسکەری خان شەڕێکی ئەوەندە رۆستەمانەیان کرد کە توانیان بەشی هەرە

زۆریان خۆیان ڕزگار کەن و لەو سەرەوە شـۆڕ بۆنەوە خوارێ و خۆیان گەیاندە ناو قەلاّ ، ئەم شەڕکەرانە کە ئازوقە و جبەخانەیان نەبۆ و زوربەیان برسیَ بۆن پالّەوانانە دەجەنگان و بە کوژران خۆیان دەحەساندەوە ، هێزی وان کە شیریان دەوەشاند گوێیان لە نالّەی بریندارو هاواری خۆ بەدەستەوە دان نەبۆ هەرچی بهاتایە بەریان دەیانماشتەوە ، دەیانکوشت ، دەیانبڕیَ و خوێنیان دەڕشت و کەللەی کوژراوەکانیشیان دەپەڕاند •

# هەڵاتنی عەبداڵ خان بۆ ناو هۆزی مۆدەکی

( عەبدالخان ) لە ناو کۆشکی باخە خۆشەکەیدا چاوەڕوانی ئەنجامی مەیدانی شەڕ بو ، کاتێ بە دووربێن دیتی کە عوسمانیەکان گەیشتنە ناو سەنگەرەکانیەوە کەوتە بیری گیان دەرباز کردن ، بۆ ژن و ماڵ و منداڵ سەرو ئەسپی رەسەنی سازکرد و لە سامانی خۆی شتی هەرە بەنرخی هەڵگرت و بە پێنج هەزار تفەنگچییەوە ڕوی کردە چیاکانی مۆدەکی ، هەرچەندە خان تێوانی لەگەڵ ( عەلیاغای مۆدەکی )زۆر خۆش نەبو دیسان بۆ ئەوێ چو ، ژن و منداڵەکانی لای ئەو دانا و خۆی بە سەڵت و بارسوکی بۆی دەرچو • پاشا کە ئەم هەواڵەی بیست ( محەمەد بەگی مەلاز گردی ) دوژمنە ڕەشەکەی خانی بەدوادا نارد •

پاش کوژرانی ئەو هەمو خەڵکە و ڕژانی دەریا خوێنە و نەمانی سەنگەرەکانی خان، عەسکەر وەکو گورگی برسی پەلاماری ناو شاریان دا و کەوتنە تالان و چەپاوی خەڵك ، سەید و مەلا و پیاوماقوڵانی شار هاتنە کن پاشا و لێی پاڕانەوە کە « هەی هاوار پاشا ، دوژمنی تۆ خان بو ئەوا هەڵات و ڕۆیی ، ئەم خەڵکە بێتاوانە بۆچی ماڵوێران بن و بکەونە سەر ساجی عەلی ؟ » پاشا هەر بەسەر پشتی زینەوە ئاغاکانی وان و بەگ و فەرماندەکانی دیکەی گازکرد و سوێندی بە سەری سوڵتان خوارد کە ئەگەر

لەم کاتەوە تالآنکار لەناو شاردا بمێنێ و یەك کەس هاواری لێ هەستێ بە دەرکردن لێتان رازێ نابم سەریشتان دەبڕم ، پێویستە هەر تالآنێکی براویشە بدرێتەوە بە خاوەنەکانی ، ئەوا منیش دێم بۆ ناو شار و ئیدێ کەیفی خۆتانە !
ئەمجار کوێخا وێسفی بە دوو هەزار کەسەوە کردە بەرپرسی ئەم فەرمانە و پێی گوت کە تالآنکاران بکوژێ و تالآنەکان یا بداتەوە بە خاوەنیان یا بیانهێنێتە بەر بارەگا ، کوێخا بە گەیشتنە ناو شاری حەوت کوردی چاو پێکەوت کە شتومەکێکی زۆریان لە مالێك هێناوەتەدەر ، هەر لەوێ سەری هەر حەوتیانی بڕی و جارچی بە چل پەنجا لادا بلاوکردەوە و بە کوشتنی چەند چەپاوکارێك ناو شار هێمن و ئارام بۆوە ، بەلآم زوتر عەسکەرێکی زۆر تالآنیان بردبو و هەلآتبونە ناو چیاکان ٠

**گیرانی قەلآی بتلیس :**

بەلآم شار هەروا بێدەنگ نەمایەوە ، ئەو کوردە یەزیدییانەی لەناو قەلآدا بون جار جار تۆپ و تفەنگیان داویشت و خەلکیان دەکوشت ، لەسەر ئەمە پاشا ئاغاکانی خۆی و فەرماندەکانی بانگکرد و راوێژی پێ کردن ، هەمو گوتیان « پاشا تۆ لە سایەی خواوە سەرکەوتی بەلآم باشتر وایە هەتا قەلآکە نەگرێ نەڕۆی ،چونکو هەرچی سامان و زێڕ و گەوهەری بە نرخی خان هەیەتی هەموی لەوێدایە ، با هەمومان پێکەوە پەلامار بدەین و بە تۆپ لێی دەین ٠ » هەندێکی دیکە گوتیان « جەنابی وەزیر ، خان خەرج و باجی حەوت سالەی موش و بتلیسی وەرگرتوە و دەنکێکی بەش کەس لێ نەداوە، زۆرمان بەلگە و قەبالەمان بەدەستەوەیە کە چەندمان لەسەر خانە ، هەرچی چەك و ئازوقەی هەیە هەموی لێرەدایە ، با بە تۆپ بیروخێنین و پیگرین ٠ » پاشا گوتی « دوژمنی ئێمە و ئێوە خان بو ئەو هەلآت ، قەلآش قەلآی سولتانە، بە تۆپ لێی دەین و نەگیرێ و گەمارۆ درێژە بکێشێ دەبێتە هەللآ و لەوانەیە شار توشی تالآن و بڕۆ بێ و خەلکەکە پەرێشان دەبن ٠ » هەمو

فەرماندەکان گوتیان « ئێمە دەستەبەر دەبین هەرچی شتێك بڕوا یا یەکێك زیانی لێ بکەوێ لە ملی ئێمە ، عەسکەرەکانمان چل پەنجا هەزار کەسیش بن دابینیان دەکەین و ناهێڵین هیچ بقەومێ • » پاشا بەم قسەیە رازی بۆ و بڕیاری گرتنی قەڵای دا •

یەکەم شت باڵوێزی ناردە سەریان و داوای لێ کردن کلیلەکانی قەڵای بۆ بنێرن، ئەوانی ناو قەڵا گوتیان « قەڵا قەڵای خانە ، عوسمانێ چ هەقێکیان بە سەریەوە هەیە ؟ ئەگەر ئەم قەڵایە هێ عوسمانێ بوایە هێزی عوسمانێ تێدا دەبۆ ، ئێمە هەمۆمان پیاوی خانین » جگە لەمە خەریك بۆن چەند کەسێك لەو راسبێردراوانە لەسەر دیوارەکانەوە هەڵدێرنە خوارێ بـە هەزار حاڵ وازیان لێ هێنابۆن ، هاتنەوە ئەمەیان بۆ پاشا گێڕایەوە ، پاشا فەرمـانی دا کۆڕێکی شەرع بەسترا و تێیدا یاخێ بۆن و لە دین وەرگەڕانیان لە دەفتەری شەرعی ئیسلامدا نۆسرا ، جا پاشان فەرمانی گەمارۆی قەڵای بۆ گشـت فەرماندەکان دەرکرد ، ئێوارە هەمۆ عەسکەر رۆی لە قەڵا کرد و نۆستن ، لەگەڵ بانگی خەوتنان بە ئاسپایێ خۆیان هاویشتە ناو سـەنگەرەکانەوە و قەرەوڵ بە هـەر چوار لادا بڵاو بۆنەوە، تـۆپ و جبەخانەکانیان هێنایـە پێشەوە و دایانپۆشین •

یەزیدییەکانی نـاو قەڵاش دار و دیواری قەڵایان بە مۆم و نـەوت داگیرساند و بە چراخان کردیانە رۆژی رۆناك و هەتا خوا رۆژی کردەوە بە نەعرەتەی ( خوا یەکە یـەك ) گرمەیان هات • لـە تاریك و رونی بەیاندا تۆپەکانی بالیۆمزە و شاهانە گەنمگردی قەڵایان داگرت تا لە چەند لایێکەوە کەلەبەری تێـکەوت ، زۆری پێ نەچۆ دیمان کە ئاڵاییێکی سـپێ لەسەر دەروازەی قـەڵا هەڵکرا و داوای چەند کەسـێکی باوەڕپێکراویان کرد ، (کوێخا وێسـف)و کوڕی دەمیرچێ وان هاتنە بـەر قەڵا ، ئەوان کوڕی دەمیرچییان وەرگرت و هەڵیانکێشـایە ژورێ و کوێخای قەڵایان نـاردە

خواریّ ، دوای ئەوەی هەردولا سوێند و قورعانیان بـۆ یەکتر خوارد ، دانیشتوانی قەڵا بە تێر و مێوە بێ چەك هاتنە دەرەوە کە بچنەوە ماڵی خوێان کەچێ سەگوان و سـاریجە دەورەیان گرتن و ڕایان کێشایە بەر خێوەتی پاشا ، بەڵام پاشا هەمویانی بەخشێ کە نزیکەی حەوسەد کەسێك بون •

کوێخا وێسفیش دەرگای قەڵای داخست و (ئەمان)یشی بۆ سەرداری قەڵا نارد کە لە قوڵلەی خاندا خۆی پەنادابو بەڵام ئەو نەهاتەدەر ، وێسف خۆی لێی چوە پێشەوە و سوێندی بۆ خوارد کـە قەڵا گیراوە و ئەویش ئەگەر بێتەدەریّ رزگاری دەکا ، سەردار لەسەر ئەو سوێند و پەیمانە هاتە دەر و بیست و هەشت دانە کلیلی قەڵا و سەرای خانی دانێ • ئا بەم چەشنــە رۆژی بیست و پێنجی رەمەزانی ١٠٦٥ قەڵای بتلیس وا بە سانایێ داگیر کرا• (کوێخا وێسف) سەربلوکباشێ بە هەزار کەسی هەڵبژاردەوە دانا بە تۆبەچێ ماڵ و خەزێنە و گەنج و گەواهێری خان کە لە سـێسەد ژوردا بو ، ئـەو ژورانە دەستیان بەسەردا گیرا و من خـۆم مۆرم کردن و دەرگای قەڵامان داخستەوە •

بۆ باخیخانیش دە ئاڵا سەگوان و ساریجە و هەزار کەس لە هێزی وان بە سەرکردایەتێ دە دەروازەوان لەگەڵ (عەلی ئەفەندێ غینایێ زادە)دا چون سێسەد و شێست ژوری دەرەوە و ناوەوەی خانیان دەست بەسەردا گرت و هەرچێ جبەخانە و گەنجینەی هەبو بە مۆری کوێخا مۆر کران •

کە هاتنە قەڵای خواریّ ، سەرداری قەڵا کوڕی ( قەرە عەلێ ) لەگەڵ قەڵادار و کوێخاکەی و حەوسەد کەس جڕ و جانەوەر دەستیان لە پشتەوە بەسترا و هێنرانە بەر بارەگای پاشا ، پاشـا لەسەر کورسـی دانیشتبـو و سەربڕەکان چاوەڕوان بون• پاشا پرسێ ئەمانە چین ؟ (کوێخا وێسف) گوتی ئەمانە لە سوڵتان هەڵگەڕانـەوە و دەروازەی قەڵایـان داخستبـو نیـازی

شەڕکردنیان هەبێ، پاشا گوتی من تازە حەوسەد کەسم لێ بەرەڵــلا کردن ، کوێخا گوتی ئەمانە لەوان نین، ئەمانە سێ ڕۆژ لەمەو پێش دەسخەتی سوڵتان لەمەڕ کوشتنیان هاتبێ خۆیان کوتابوە ناو قەڵای خانەوە. خەڵکی دیــوان چاوەڕوانیان دەکرد و ســەربڕیش شیرە تیژەکەی هەڵبڕیبێ ، پاشـــا گوتی سەرداره پیسەکەیان بێنن بزانم ، ( قــەره عەلێ ) ناوی ڕەشتاڵە کە پیــاو خراپێکی بەناوبانگە و کوشتنی ڕەوایە هات ، پاشا چاك لێی ورد بۆوە و دوایێ پرسێ ئەوانی دێ چین ؟ گوتیان ئەمانەش لەشکری ئەمن ، پاشا گوتی دەی سەربڕ و ئیدێ دەست‌کرا بە مل پەڕاندنیان .

پاشا گوتی ئەولیا چەلەبیم بــۆ بانگ کەن ، منیش هاتمە پێشــەوە ، پێی‌گوتم لەبیرتــە دوێنێ بەیانێ خەونم بــۆ گێڕایتــەوە کە مێروولەم پێ هەڵگەڕابێن یەکێکی ڕەش گەستمی و ئەوانی دێ هیــچ ئازاریان نەدام ؟ مێروولە ڕەشەکە ئەم کافرەیە کە دەروازەی داخست و دڵمی ئێشاند ، دەی خێرا بیکوژن . سەربڕ هاتە پێشەوە ، منیش گوتم قوربان خەونەکەت زۆر ڕاستە بەڵام تۆ لەو خەونەدا ئازادت کردبێ ئێستاش خێری سەری سوڵتان ئازادی بکە، پاشا گوتی باشە هەڵیستێنن ئەم مەلعونە ، (قەرە عەلێ) هەستایە پێ‌و گوتی جەنابی وەزیر ئەو سەردەمەی تۆ والیێ دیاربەکربێی من میراخوڕت نەبــێم ؟ پاشـــا گوتی هــا ، کەواتە تۆ ئەو مەلعونەی لە شــەڕی شەنگار هەڵاتێ و هاتوی خۆت توشی ئەم شەڕە قورسە کردوە ؟ دەی لێیدەن لەم کافرە ! دیتسان چێمەوە پێش و گوتم گەورەم یەکێك ئازادت کردبێ دێبارە نایکوژێتەوە . پاشا گوتی باشە ، جا ڕێی کردە قەرە عەلێ و گوتی تۆ کە ئەوسا میراخوڕی من بێی بۆچێ هەڵاتێ ؟ قەرە عەلێ گوتی تۆ لەسەر ئەوەی گوایا ئەسپە چەقەڵت لاوازە فەرمانت دا پەنجا قەمچیم لێ‌دەن ، منیش کە لەبەرچاوی هەموان ئابڕێم چێبێ نەمتوانێ ڕاوەستم ، لە شــەنگارەوە بە یەکشەو هاتمە ماردین و لەوێوە بۆ حەسەنکێف و دوایێ هاتمە بتلیس بێم بە

پیاوی خان و گردمی بە خاوەنی ماڵ و حاڵی خۆم. پاشا گوتی باشە، لە جیاتی ئەو پەنجا قەمچییەی بە ناهەق لێت درابوو ئازادم کردی بەڵام تۆ دەرگای قەڵات بۆ داخستو ئەو هەمو زیانەت لێدایین ؟ عەلیاغا گوتی وەزیر ، ئێشی قەمچییەکانت هێشتا لە بنی ددانمدایە و داخت لە دڵم نەچۆتە دەرێ ویستم تۆڵەی خۆمت لێ بکەمەوە . پاشا گوتی ئەم مەلعونە راست دەکا ، فەرمانیدا خەڵاتێکی باشیان دایە دەست (کوێخا وێسف) کە بە ئازادی لای ئەو میوان بێ .

ئەمجا پاشا گوتی لەسەر دەسخەتی سوڵتان من ئەمانە قڕ دەکەم ، دەی، هەر کەس چەندیان لێ دەکوژێ جلکەکانی بۆ خۆی . ئـەو دانیشتوانەی ئەوێ کەس زاتی نەکرد ورتەی لێوە بێ، من گوتم پاشا ئاخر تۆ لە خەونەکەتدا شازدە مێرولەت بە من بەخشیبو ، پاشا گوتی ئەشـەمبیللا راستـە ، دەی (ئەولیا) لەمانە شازدەیان لێ هەڵبژێرە و لەجیاتی هەر یەکەیان فاتیحایێـك بخوێنە ، گوتم گەورەم هەشتا فاتیحات بۆ دەخوێنم و هەتا دەنگم بڕی کرد گوتم ئەلفاتیحە ، پاشان چوم لەناو باڵ بەستراوەکان شێست کەسێکم لـێ جودا کردنەوە، پاشا گوتی (ئەولیا) ئەوە تۆ چ دەکەی؟ بە یەك فاتیحا هەموت بەردان ! بەڵام من هیچم نەگوت ئەوانەم بردە خێوەتی خۆم و نانم لەپێـش دانـان .

کە هاتمەوە دیتم پاشا زۆر توڕەیە حەیزەرانەکەی دەستی هەڵدەسوڕێنێ و هاوار دەکا دەی خێرا ئەمانە قڕان تێخەن ، پەنا بەخوا هەرچی سـەگوان و ساریجە لەوێ بون بە شیری روت لەم خەڵکە دەستبەستراوانە بەر بون ، دەست و سەر و قوڵ و ملیان دەپەڕاندن ، ئەوانیش وەکو مەڕی بەر دەستی قەساب لە ملشۆڕکردن زیاتر هیچیان لە دەست نەدەهات ، دەتگوت ڕۆژی حەشرە ، لەم ناوەدا یەکێك لە ڕۆژەکییـە قارەمانەکـان دەستـی خـۆی راپسکاند و شیری لە دەستی سەربڕەکەی خۆی هێنایە دەر و تێیان بەربـو

حەوت سەربڕی داپاچی و ئەوانی دیکەی بڵاوە پێ‌کرد ، کاتێ بە هەمو لایێك کەڵەکەیان لێ‌کرد پاشا قیڕاندی کوڕە لێی مەدەن ، مخابنە مەردی وا بکوژرێ دەزبەجێ ئازادی کرد و خستیە ناو هێزی وان .

ئەو ئاغا و پیاوماقوڵانەی لەوێ بون کە دەیاندێ وا بە شـیری روت بەربونەتە ئەو کەسانە دەست بەستراوانە بەزەیی‌یان پێیاندا دەهاتەوە بەڵام کەسیان نەیاندەوێرا ورتە بکەن ، من بـە تورەیی تێم‌خوڕین گوتم «ئەرێ نابێ توزێ غیرەتتان بێ ، ئەوا پاشا چاو دەگێرێ بەڵکو یەکێك بچێتە پێشەوە و تکای لێ بکا ، خوتان ئاگاتان لێ بو من بە فاتیحایەك شەست حەفتا کەسـم رزگار کرد ، دەی ببزون ئەمە سێ روژە یەکدەریا خوێن لەم ناوەدا رژاوە .» ئیدی ئاغاکانی پاشا و ئاغاگەلی وان تێکڕا چونە پێش و گوتیان قوربـان فەرمانی سوڵتان هاتەجێ و چی ماوە بە ئێمەی ببەخشە . پاشا تکای گرتن و پێنج‌سەد و پەنجایان مابون ، بەردران .

رێکەوتێکی سەیر ئەوەیە کە ئەم شەڕە ساڵی ١٠٦٥ قەوما و زیـانی سوپای خانی بتلیسیش ١٠٦٥ کەس بو ، لە ئێمەش نوسەد کەس کەوتبو . ئەمە هەموی کاری خوایە ، بناخەی دنیا لەسەر هەرا و هوریا و تا دنیـا بمێنێ هەرا و هوریا هەر دەمێنێ .

## هۆی راستەقینەی ئەم شەڕە

لەپاش هەمو شتێك (مەلیك ئەحمەد پاشا) پێیی گوتم « (ئەولیـــا) ، دەزانی لە بناخەوە ئەم شەڕەم بۆ کرد ؟ » گوتم «ناوەڵڵا نازانم ، » پـــاشا گوتی «ساڵی ١٠٤٨ کە (سوڵتان مراد خان) بەغدای گرت ، لە گەڕانەوەیدا خانی بتلیس نەهات خەزا پیرۆزانەی لێ بکا ، مرادخان زۆر دڵی رەنجا و بە منی گوت (ئەحمەد وەك قەرزی خوا لەسەرت فەرز بێ کە تۆڵەی من لە خانی بتلیس بستێنیتەوە) • پاشان لەوکاتەدا کە من حەوت مانگ جێگری (ئیبشیر پاشا) بوم ئەو شەوەی ئیبشیر بە سوپاوە هاتە ناو (ئەستەمۆڵ) شەو سوڵتان مراد هاتە خەونم لەسەر چیای وان راوەستابو ناتێکی خوێناوی بەدەستەوە بو، پێی گوتم ( ها ، لەتێکی بدە بە چیا و لەتێکی بە خـــانی بتـــلیس ) ، بـــەوە قسەکەی پێشویم بیرکەوتەوە و ئەم شەڕەم سازکرد • هۆی ئەم شەڕە سوڵتان مراد بـــو » •

پاشان لەگەڵ پاشادا چوینە سەر سەنگەرەکان کە پڕ بون لە لاشـــەی هەردولا ، پاشا فەرمانی دا بتلیســـیەکان بێن لاشەکانی لای خۆیان بەرن بیانشارنەوە و تەرمی شەهیدەکانی خۆشمان لە گۆڕستانێـــکی تایبەتیـــدا بنێژرێن و برینداەرکانمان بدرێن بە حەکیم و برینکاران دەرمانیان بکەن • ناو سەنگەرەکان کەلاك بەسەر کەلاکدا کەوتبو خوایە هێز و سەرکەوتـــن

بە دەست تۆیە ، لەناو ئەم بەرد و رەوەز و دۆڵ و دەرەیەدا چۆن توانیمان سوپای خان بشکێنین پیاو ناچێتە ئاقڵیەوە !

لە گەڕانەوەماندا خەبەریان هێنا کە لە بەگە ناپیاوەکانی کوردستان ئەوانەی نە خۆیان هاتبوون و نە یارمەتییان ناردبوو وەکوو (بەگی شیروان) و (هێزان) و (کارنێ) و (سعرد) و (زریقی) و (کەسان) هاتوون دەیانەوێ پاشا ببینن ، پاشا گوتی تازە پاشی چی ؟ مانگا مرد و دۆ بڕا ، ئیدێ هاتنی ئەم نامەردانەمان بۆ چییە ، با بڕۆن ئەم یاخییانە ملیان بشکێنن • ئاغاکانی وان وێکڕا هاتنە زمان و هاواریان کرد پاشا بۆ خاتری خوا مەهێڵە دەرچن ، پاشا گوتی «ئەمانە بەگی سوڵتانن لە ئەیالەتەکەی مندا، پێشتریش یارمەتییان ناردبوو بەڵکو نەهاتنیان هۆیێکی بەجێی هەیە ، بەڵام ئەوانەی نە هاتوون و یارمەتیشیان نەناردبوو پێویستە شتێکیان لێ بکرێ ، ئێوە فکرێکیان لێ بکەنەوە » هەموو گوتیان ئیشەڵڵا ئەوانیش بە دەردی خان دەبەین •

لەو بەگانە یەکەم کەس بەگی شیروان هاتە ژوور و دوای ئەو بەگی هێزان و کارنێ و سعرد و زریقێ و کەسان هاتن • بەگی هێزان لە ئاستی خۆیەوە دەلەرزێ ، پاشا بێ ئەوەی تەماشایان بکا پاش دەقیقەیێك گوتی « ئەمانە چین ؟ » دەرکەوان گوتی « گەورەم ئەمە شیروانییە و کوڕی تەتاری پێ دەڵێن » پاشا گوتی « ئێ ، چەلەبییێکی بە زولف و ڕیشە ، بیانوە ژنانەکەی دیارە ، خان ریشی پێ هێشتۆتەوە و ئەویش لەبەر خاتری خان نەهاتە یارمەتیمان • ئەدی ئەمە کێیە ؟ گوتیان ئەمەش بەگی هێزانە ، پاشا گوتی « بەڵێ دیارە کچ حەز بە شەڕە شیر ناکا و لەناو چەکانـدا قەڵخان هەڵدەبژێرێ • ئەوی دی کێیە ؟ » گوتیان بەگی کارنییە ، پاشا گوتی « دەی پیری بێ دین ، تۆ لەژێر کێوە بتوی نەهاتی ؟ » و بەم شێوەیە هەر یەکەی توانجێکی تێ گرتن و قسەیێکی ناخۆشی پێ گوتن و پاشان بە ئاغاکانی وان و بەگەکانی ئەرجیش و عادلجەوازی گوت «ئەم بەگۆکانە

دەکەم بە میواتتان ئاگاتان لێیان بێ » بەگی کارنێ هاتە زمـــان و گوتـــی «قوربان ، سوپا و خێوەتی خۆمانمان پێیە ، دەچینەوە لای خۆمان » • پاشا قیژاندی دەی بیانبەن ئەم کافرانە ، تومەز لەپێشترا رای سپاردوّن دەزبەجێ بەگەکان و ئاغاوانی‌یەکان قۆستیانەوە و بردیانن لای خۆیان زنجیریان کردن•

( محەمەد بەگی مەلاز گردێ ) کە بۆ راونانی خان ڕۆیشتبو گەڕایەوە، زۆر ماندو بو و ئەسپەکانی پەکیان‌کەوتبو ، نەگەیشتبوە خان بـــەلاّم ئـــەو ئەسپ و ئێستر و بارخانانەی لەناو چیاکاندا بەجێ مابو و بریتی بون لە هەزار و حەوسەد ئەسپ و ئێستر هێنابویان و نزیـــکەی حەوســـەد کەسێکیـــش کە پەراگەندەی ناو دۆڵ و چیاکان بوبون گرتبویانن و بە قـــۆڵ بەســـتراوی رایانگرتن • ئەمانە زۆریان لەسەریان درا •

**دوای سەرکەوتن چاکەی پاشا بۆ عەسکەرەکانی :**

لە نیوەڕۆدا چاوەشی هێزەکان و فەرماندەکانی سوپا لەبەر خێوەتی پاشادا خڕبونەوە و تەپڵ لێدرا ، لەو تالاّنەی بەگی مەلازگرد هێنا بـــۆی لەپێشەوە سێسەد خێومت و بارەگا و هۆبە دران بە فەرماندە و پیاوماقوڵەکان، یەکێ لە خەیمە نەخشینەکانی خانیش کە سێ هەزار قرۆشی دێنا درا بە محەمەد بەگی مەلازگرد ، ئەسپ و ئێسترەکان دران بەوانەی ئەسپـــیان نەمـــابو • جبەخانەکەش بەچەك و شیر و هەزار و حەوسەد تفەنگەوە بۆ خەزێنەی میرێ داندرا و جبەچێ هات بە دەفتەر وەری گرت • تۆپ و شتەکانی‌دی خرانە ناو کەشتێ ، چێ هێ عادلجەواز بو بۆ عادلجـــەواز و چی هی وان بو بـــۆ وان نێرانەوە و تەنیا دە تۆپ لەبەر خێوەتی پاشادا مایەوە •

ئەمجار هەشت قات تەپڵ لێدرا • گشت ئاغا و فەرماندەکان لە چەپ و راست راوەستان ، چاوەشی دیوان دەیگوت و ئەوانی‌دی بەدوێدا «خەزات پیرۆز بێ••• سوڵتانمان عومر درێژ بێ •••» یەکەم کەس ( کوێخا وێسف)

هاتە پێش ، کەوڵێکی سمۆرەی رەشی بە شانیدا دا و پشتێنێکی زێڕی لـە پشت بەست و پاشا بە دەستی خۆی سێ چەتاڵ و چەلەنگێکی بە مێزەرەکەیدا چەقاند • چاوشەکان هاواریان کرد « خەڵات و چەلەنگت پیرۆز بێ » ، دوای ئەو بەپێی تەشریفات (مەلا محەمەد) وەزیری فەرماندەی هەکاری خەڵاتێك و چەلەنگێك ، (برایم بەگی مەحمودی) و بەگەکانی (پنیانش) و (غازیقڕان) و (بارگری) و (ئەرجیش) و (عادلجەواز) و (مـوش) ، یەکی خەڵاتێـك و چەلەنگێکیان درایە ، ئەو بەگانەی نەهاتبون بۆ شەڕ و بەند کرابون هیچیان نەدرایە • ئەوانەی لە ئەیالەتی ئەرزەڕۆمـەوە هـاتبون (محەمـەد بـەگی مەلازگرد ) و بەگی (خەنەس) و (بایەزید) و (عونیك) و (پاسین) و (تەکمان) و (قوریجان) یەکی خەڵاتێك و سێ چەلەنگیان لە مێـزەر چەقێنـرا • بـەگی مەلازگرد گوتی « پیرە وەزیر ، هەرچەندە عەبدالخان چل هەزار سەر مەڕی بردم و نیازی وابو ماڵ و وڵاتم لێ تێك بدا ، بەڵام کە تۆ لەبەر خاتری مـن لەشکرت کردە سەری و تۆڵەی منت لێ سەندەوە، تازە هیچ خەمم نەماوە»•

دوای ئەوەی بەگەکان خـەڵات و چەلەنـگیان وەرگرت ، تیپ تیپ بڵاوەیان لێکرد و گەڕانەوە ، (رەمەزاناغا)ی پیاوی مستەفا پاشای فیراری والی دیاربەکر لە جیاتی پێنج بەگی سنجاقەکانی دیاربەکر هاتە خزمەت پاشا• پاشا زۆری قەدر گرت و پاش بەخێر هـاتن لێـی پرسـی ئـەدی کـوا عەسکەرەکانت ؟ کابرا دەستی کرد بە مەرایی و ماستاوکردن و گوتی «قوربان خەزات پیرۆز بێ ئێمە خۆمان ساز کردبو بێین کە هەواڵی سەرکەوتنتانمان زانی گوتمان تازە چونی ئێمەی پێ ناوێ ، عەسکەرەکانمان نارده قەڵای حەزۆ و خۆم هاتمە خزمەتتان » • پاشا کەوڵێکی سمۆری دایە و پەڕێکی لە سەری چەقاند و سەر و خەڵاتێکی گرانیشی بۆ بەگەکانی ئەوێ دایێ کـە بیانداتێ و خۆشی نارده کن (وێسف ئاغا) میوان بێ• ئاغاکانی وانیش یەکی خەڵاتێك و چەلەنگێکیان درایێ ، ئەو خەزاکارانەی دوهەزار و سەدوبیست

کەللە سەریان هێنابۆ یەکی خەلاتێك و چەلەنگێکیان درایێ و مێزەرێکی محەمەدییان وەرگرت • بە کورتی بڵێین لەو دیوانەدا دۆ هەزار و حەفتا خەلاّت و حەوت سمۆر و نۆ وشەك و بیست سنجاو بە شاندا دران و تا ئەو کاتە دۆسەد و پێنج کیسە خەرج کرابۆ • ئەوەی من زانیبێتم ئەوەبۆ کە باسم کرد •

## دانانی خـــانی تازەی بتلیس

### لە رۆژی ٢٧ ی رەمەزانی ساڵی ١٠٦٥ دا

مەلا و شێخ و گەورە و پیاوماقوڵانی بتلیس کە کوڕەکانی عەبـــداڵ خانیان لە پێشەوە بو ، یەکەم ( زیادین بەگ) کە لە کچی (زاڵ پاشا)یە و لەو گەورەتر ( بەدرەدین ) کە لە عەرەب خانمە و (تورودەدەهر) کە لـــە ژنێـــکی دیکەیە هاتنە دیوەخانی پاشا ، دەستی پاشایان ماچ کرد و پاشاش ئـــەوانی ماچکردەوە ، زیادین بەگی لە دەستە راستی خۆی دانا و بەدرەین بـــەگ لە دەستە چەپی و پاشان بە ســـەرە بـــەگەکانی دیـــکەی دانـــا ، زۆر رێـــزی شێخەلئیسلام و مەلای بتلیسی گرت .

یەکەم کەس (مەلا محەمەدی بۆتی) هاتە قسە و گوتی «وەزیری بەڕێز ، ئەمانەی هاتونە خزمەتت . هەمو پیاوماقوڵانی بتلیسن و ئەوەی من عەرزتان دەکەم قسەی هەموانە . تکات لێ دەکەین زیادین بەگمان بۆ بکەی بە خان و گەورەی وڵاتەکەمان » . پاشا گوتی « تکاتان لەسەر سەر و لەسەر چاوم ، بەڵام ئەگەر ئەم بەگەتان بۆ بکەم بە خان . ئێوە پشتی دەگرن و فەرمانەکانی بەجێدێنن ؟ » هەمو وێکڕا سوێندیان خوارد کە گیانی خۆمانی لە پێناودا بەخت دەکەین . ئەوە چەند ساڵە لەگەڵ عەبداڵخاندا توشی چەند تاڵان و بڕۆ بوین و ئەمجارەش ئەم هەمو خەڵکەی تێداچو . وامان لێ هاتوە ئێمـــەش و کوڕەکانی خانیش بێزاربوین . پاشا گوتی من بەگی ئەرجیش و عادلجەوازم

بەدوای خاندا ناردوە بێ گومان دەیگرن و دەیهێننەوە ، بەڵام ئێوە کە داوای دانانی زیادین بەگ دەکەن دەبێ بزانن کە خان دوسەد کیسە قەرزی هێزی وانی لەسەرە و چل هەزار سەر مەڕی بەگی مەلازگردی لەپێدایە ، جا ئەگەر ئێوە دەستەبەری دانەوەی ئەم قەرزانە دەبن ئەوا من بەگەکەتان خەڵات دەکەم و سەبارەت بە دانانیشی نامە بۆ سوڵتان دەنوسم ، خۆ ئەگەر بەم مەرجە رازی نین ئەوا عەرزی خەلیفە دەکەم کە وەکو زەمانی (سولەیمان خان) وڵاتەکەتان ببێتەوە بە ملکی عوسمانی • هەمویان گوتیان جا قەیدی چی یە ، خان خۆی ڕۆیشتوە سامان و دارایی لەناو قەڵادا بەجێ ماوە و خۆتان مۆرتان کردوە ، لەناو باخەکەشیدا ئەوەندەی ماڵ و خەزێنە هەیە ئەگەر بە چاکی بفرۆشرێ لە سەری قەرز و قۆڵەکانی زیادە •

لەسەر ئەمە فاتیحا خوێندرا و (زیادین بەگ) بو بە خان ، کەولێکی سمورەی پەراوێز مەخمەری سوری بە شاندادرا و خەڵاتێکی شاهانەی لەبەرکرا و مێزەرێکی جقەداری لە سەرنرا • لەم کاتەدا لەبەر دەرگا دە دانە تۆپ ئاگر درا ، دەرکەوانەکان بە راکردن ئەم خەبەرەیان بۆ دایکی زیادین بەگ بردەوە و ئەویش دە کیسەی مزگێنی دانێ •

پاشا قۆڵی زیادین خانی گرت و لەسەر کورسی یە زێڕ نیشانەکەی خۆی دانا و لە بەردەمیا بە پێوە راوەستا و گوتی « خانی گەورەم پیرۆزتان بێ » ، ئەمجا فاتیحا خوێندرا ، دوای ئەوە بەدرەدینی برای هات بەیعەتی پێ کرد و دوای ئەوە نورووددەهر هات و چاوم لێ بوو لە کاتی بەیعەت کردندا چاوی پڕ بوو لە ئاو من کە ئەوەم دی زانیم گرێیەکی لە دڵدایە خوا یار بێ ئەم رازە لەکاتی خۆیدا دەنوسم • براکانی دیکەی خانی نوێ (شەرەفەددین) و (شەمسەدین) و (ئیسماعیل) و (حەسەن) و (حوسێن) هاتن بەیعەتیان کرد و لەدوی ئەوان شێخەلئیسلام و نەقیب و شێخ و مەلاکان و فەرماندە و گەورەکان هاتن • پاشا حەفتا دەست خەڵاتی بەسەرا دابەش کردن،

( حەیدەراغا ) ناوێك كە تەمەنی سەد و هەشت ساڵ بێ كرا بە كوێخای ماڵ و پاشا ئەویشی خەڵات كرد •

خەڵكی شار خانی تازەیان بە نۆ دەستە دەهۆڵ و زوڕناوە گەیانـدە سەرا و لەناو قەلاش دەزڕێژی تۆپ و تفەنگ كرا و سێ رۆژ كرا بە جەژن و شادمانێ ، بۆ رۆژی دوایێ دیوەخانی بتلیس وەكو جـاران دائەكرایـەوە و هەركەسە لە شوێنی خۆی دانیشتەوە •

پاشا فەرمانی دا (كوێخا وێسف) و حەفتا ئاغا و قازێ شار لەگەڵـم هاتن چۆینە ناو قەڵا مۆرەكانمان شكاند و ئەوەی لێی بێ لە ئێسترانمان بار كرد و هێنامان كۆمەڵ كۆمەڵ لەبەر بارەگادا رۆمان كرد ، دیسان كوێخـا وێسف و مفتێ و مەلای شار و ئاغاكان چۆنە ژوری ماڵی خـان و دەرگای ژورەكانیان كردەوە و بـە ئاگادارێ زیادین خان خـەزێنە و جبـەخانە و شتومەكەكانیان هێنایە دەر و لە سەد و پەنجا ئێستریان بار كرد و لەبـەر بارەگا وەكو گردێك هەڵیـان دانـەوە ، ئەمجـا ئاگاداری فەرمانـدە و عەسكەرەكان و خەڵك كرا بێن بۆ بەشداربون لەم هەڕاجەدا • لەم رێـگای ئووایەدا ئەوەندە حەشامەت خڕبۆوە كە ئەوسەری دیار نەبێ وەكو دەریـا جمـەی دەهات •

★ ★ ★

## خەزێنە و سامانی عەبداڵ خان
## ئەوەی من مۆرم کردبوّ

یازدە سندوّقی چوارگۆشەی میناکاریّ کە یەکیان کەلّبەی فیل و یەك ئەبەنوّس و یەك سەرو و یەك بەڕوّ و یەك یەنگی دنیا و یەك پلاسانتا و یەك ئێسکی نەهەنگ و یەك ددانە ماسیّ و یەك کارەبی پەتی و یەك مەرجانی سوّر و یەك لە دار عوّدی بێگەرد بوّن،چەند پێش تەختەکە یەکیان نقێمکاریّ و یەك میناکاریّ و یەك سەدەف تیّ‌گیراو و دوانیان هەڵکەندراو ، کە چاوی تەماشاکەریان ئەبلەق دەبوّ ، لە بەرچاوی هەموان مۆرەکانمان هەڵپچڕی و هەڵمانداناوە ، هەر یەکی دە دانە کتێبی بە نرخ و بایەخداری تێدا بوّ کە لەلایەن خۆشنوسە بە بەناوبانگەکانەوە نوّسرابوّنەوە و بە چەشنێك رازابوّنەوە کە هەر یەکەیان کرابوە پارچە ئەتیکەیێکی بیّ وێنە ، جگە لە قەڵەمدان و لمدان و گوڵاودان و بوخوّڕدان و سوّرەدان و مقەست و قەڵەمبڕی بە نقێم و وردەکاریّ بە بەردی گرانبایێ ، لە کتێبەکان شانامە و گولستان و شەرەفنامە و چەند دیوانی شیعر کە زوربەیان بە دەسخەت و مۆری زیادین خان خۆی بوّن ، خان بە دیتنیان چاوەکانی پڕ بوّن لە ئاو . پاشا کە ئەمەی دی گوتی « کوڕم هەست دەکەم ئاو لەچاوت هات ، بۆ گریای ؟ نەکا ئەم پێش تەختانە هیّ توّ بن ؟ » خان گوتی « بەڵیّ هەموّی هیّ

خۆمە ر ھی باوکم نین چونکو زۆریان خۆم نوسیومنەتەوە و مۆری خۆمیان پێوەیە » ، دەزبەجێ پاشا فەرمانی دا ئەو چواردە سندوق و پێش تەختانە بە کلیلەکانیانەوە بدرێنەوە بە زیادین خان •

**شتە بەنرخەکانی عەبدالّ خان کە بە هەڕاج فرۆشران :**

حەڤدە بەرگ قورئانی نەخشێنراو و بۆ شاهان نوسراوە بە دەسخەتی (یاقوتی موستەعسەمی) ، (ئەحمەدی قەرە حەساری)، (شێخ بایەزیدی وەلی)، (شێخ قەرە محەمەد) ، (عەبدوڵلای فرێمی) ، (خالید ئەفەندێ ئەسکوداری) ، (دەمیرچی حەسەن چەلەبی) لە شاگردانی قەرە حەساری • هەزار و سێسەد بەرگ تەفسیر و کتێبی بە نرخ کە لەسەر قاقەزە باشەکانی خەتایی و دیمەشقی و سەمەرقەندێ و ئەحمەداوایی نوسرابونەوە ، حەفتا بەرگ تەفسیری پیرۆز وەکو تەفسیری سەبری تەبەری ، تەفسیری دەیلەمی ، تەفسیری فەیزوڵلای هیندێ بێ نوختە (جگە لە ئایەتەکان وشەی تەفسیرەکە هیچی نوختەدار نەبون ) ، تەفسیری (ئەبو لەیسی سەمەرقەندێ) ، تەفسیری شیخ ، (تەفسیری بەغەوی) ، (تەفسیری قازی) ، (تەفسیری ئەبوسعودی سلێمانی) کە هیچیان لای شێخول ئیسلامەکان دەست ناکەون ؛ هەزار و سێسەد بەرگ کتێبی حەدیسی پێغەمبەر ، جگە لە (قەدوری) و (مولتەقا) و (کەششاف)و (قەهستانی)و (مەلا جامی) ، تەجویدی بە هەڵبەست رێکراوی شاتبی و حەریری ، لە کتێبی زمان قاموس و ئەختەری و شەمعی و لۆغەتی ئیبنو مالیك و چارەپەردێ و گەلێك کتێبی بایەخداری دێ ، بیست بەرگ شانامەی فیردەوسی بە خەتی تەعلیق نوسراوە ؛ هەزار بەرگ دەسخەتی جۆر بەجۆر لە خەمسەی نیزامی و دیوانی حافز و عورفی گولستان و بۆستان و نیعمەتوڵلا و دیوانی مەلا جامی و تەزکەرەتول شوعەرای حەسەن چەلەبی و تەزکەرەی لوتفی و دیوانی سایب و دیوانی باقی و دیوانی نەفعی و دیوانی نیساری و دیوانی ئەنوەری و دیوانی خاقانی و گەلێکیدێ لە کتێبی

نەخشاو و رازاوە ، دۆ سـەد و شێست پارچە بەیاز کە هـەر تاقە لاپەڕەیێکی سەد قرۆشی دێنا • دەسخەتی خۆشنۆسە کۆنەکان ، ئەو بەیازانە هەندێکیان شەشسەد پەڕە بۆ کە هەمۆی دەسخەتی سەردەمی سـولتان بایەزیدە و هێ وەکو شێخ ئەحمەدی قەرەحەساری ، بەکری ، عەبدوللای قرێمی ، حەسەن چەلەبی ئوسکوداری‌و حەسەن چەلەبی قەرەحە سـاری‌و خالید ئەفەندی و حسێن ئەفەندی مودیری مەکتەب و وێسف ئەفەندی و قەرە عەلی چەلەبی و مەنتیقی چـەلەبی و دەروێش عەلی و سـۆیۆلچی زادە و حوکمی زادە و تەکنەچی زادە ، یەکی ٥ تا ١٠ پارچە دەسخەتیانی تێدایە • بۆ خەتی دیوانیش تاجر زادەی دۆستی یێلدرم خان ، جندرەچی زادە ، ئۆقچی زادە ، گولابی زادەو ئەحمەد چەلەبی نۆسیویانەتەوە • لەبەرئەوەی باسـی خەتەکان هاتە گۆڕێ با کەمێك لێیان بدوێم :

خۆشنۆسەکانی خەتی دیوانی و سـولس نەسخمان باس‌کرد ، ئەمجا نۆرەی خاوەنی خەتەکانی دیکەیە •

خەتی رێحانی :ـ کە شێخ ئیسحاقی فەقێ خەلکی کوتاهیە دایهێناوە و بۆ یەکەمجار لە رۆمەوە پەیدا بوە• ئەم شێخ ئیسحاقە لە کۆتاهیە مزگەوتێکی هەیە مزگەوتی (ساق فەقێ)ی پێدەلێن •

خەتی سیاقی :ـ کە لە ولاتی (میسر) لەناو گەلی (قیبتی)دا پەیدا بوە، لەکاتی گەشتەکەی میسر و سۆدانمداگەیشتمە شوێنێك (رومێلەتول جیمال)یان پێدەگوت شارێکی کاول‌و رۆخاو بۆ ، لەوێ کۆلەکە بەردی هێجگار زلم دی بە خەتێکی سەیر لێیان نۆسرابۆ گوتیان ئەمە خەتی حەزرەتی ئیدریسە لە شاری کوفەی نزیك بەغداش جۆرە خەتێکی سەیر و سەمەرە هاتۆتە کایەوە ناویان لێ ناوە (خەتی کوفی) ، پاشتر زۆر هونەرکاری‌یان تێدا کردوە تـا وای لێهاتوە ئـەمڕۆ دوازدە جۆر خەتی کوفی هەیـە ، لـەمانە هـەرە

ناسراوەکانیان خـەتی کوفیِ عوسـمان ، حەفسـیِ ، مەغریبیِ ،فاسـیِ ، مەرانکوشیِ ، تەلەسانیِ ، سەناریِ و حەبەشییە ، لە زۆر مزگەوتی میسردا جۆرە خەتی کوفیِ هەیە وەکو مزگەوتی عەمری کوڕیِ عاس ، مزگەوتی مەتیل ، مزگەوتی بەرقوق ، مزگەوتی ست نفوس ، مزگەوتی ئـای بەگی تورکمان ، مزگەوتی فەرەج ، مزگەوتی تیلون ، مزگەوتی تاهیر بیبەرس کە خەتی کوفیِ سەریان تێدایە، لە وڵاتی مەغریبیش مزگەوتەکان خەتی کوفییان پێوەیە وەکو (تەلەسان)و (قورتوبە)و (تەنجە) • جـا ئەگەر لەمە زیاتر لە سەری بڕۆین بابەتەکەمان لە دەست دەردەچیِ •

لە خەتی تەعلیقدا ئەوانەی گەیشتونەتە پلەی وەسـتایی (ئەمیر عەلیِ تەورێزی)و (عیمادی حوسێنیِ)و (محەمەد رەزای تەورێزیِ) و ( قوتبەدین مخەمەدی یەزدیِ)و (شا مەحمودیِ)و ( حەسەنی شاملو )و (موعیزەدین)و (موحەمەدی حوسێنیِ)و (ئەحمەدی حەسەنیِ) کە قوتابیِ عیمادی حوسێنی بوە و (میر شەرەفخان) کە لە باپیرانی خانە و (فەخریِ بەرسەویِ) ناوانن ، بەتایبەتیِ خەتی ئـەم فەخرییە ئەوەندە جوانە نە لەپێـش ئەو کەس وای نوسیوە و نە پاش ئەو کەس دەیگاتیِ ، خوای گەورە حوکمی چاوێکیوای داوەتیِ دیدەکانی دەڵیِی گەوهەریِ شـەوچران ، قورئان و گولسـتان و بۆستانێکی نوسیوە ، موعجیزەیێکن بۆ خۆیان •

هەروەها تۆماری وایـان لەناو هاتەدەر کـە هەریەکەی گومبەزێکی ئەفراسیاو دێنیِ ، لە سایەی خواوە منیش چەند دانەیێکم دەسـت کەوت • ئەم تۆمارانە ئەوەندە بە هەرزان فرۆشران کە پارەکە بایِ یـەك نوختەیان نەبو •

## باری حەوت وشتر کتێبی بایبدار
## کە مۆری خانیان پێوەبوو

فتوحاتی مەکییە دانانی شێخ ( محیّدینی عەرەبیّ) ، فسوسی محیّیینی عەرەبیّ ، لێکدانەوەی فسوس دانانی (ساری عەبدوڵلا ئەفەندیّ) بە خەتی خۆی، فتوحاتی مەککیە دانانی (قوتبەدین حەنەفیّ)،فەتحنامەی میسر بە دەستی سوڵتان سەلیم خان دانانی کاتب وێسف جان ، میلەل و نیحەل دانانی (نوح ئەفەندیّ) ، مەناقیبی شێخ ئەبوئیسحاقی کازروونیّ دانانی (شەوقی ئەفەندیّ)، سەعادەتنامە دانانی خوالیّخۆشبوو (عاشق پاشا) ، مەناسیکول حەج دانانی (سینان ئەفەندیّ) ، مەناقیبی ئەولیا دانانی شێخ (دەدە مەقسودی ئەخلاتیّ)، مێژووی ختوتی مەقدیسـی ، مێژووی ســالح ئەفەندیّ ، مێژووی جامیعــول حیکایات ، مێژووی میرخواند ، لۆغەتی لامیعیّ ، شەرتەکانی نوێژ بە شیعر هیّ شێخ (شەمســەدینی فەناری) ، تەرجەمەی پەند نامەی شـێخ (فەریدەدینی عەتار) لەلایەن ئەمیر چەلەبیّ پیاوی بایەزید خــان ، جەریدەتول عەجایب ، مێژووی میرئاتی کائینات ، مێژووی تەبەریّ ، قانوننامەی لوتفیّ پاشا ، مێژووی خەزاکانی سوڵتان مرادی چوارەم ، مێژووی پەچەویّ ، نامیلکەی عەقایدی کەمال پاشا زادە بە لێکدانەوەی قوسونیّ زادە ، تەرجەمەی میرئاتیکاینات لەلایەن فەنایی تەڕەبزونی ، تــەقویمول بولــدان دانانی (عاشــق چەلەبیّ)

تەزەبزۆنی ، سوحبەتول ئـەبکار لە وەڵامی سـەبحەتول ئەبراردا عەتایی چەلەبی داینـاوه ، زەیلی شەقایق دانانی نەوعی زادە عەتایی چەلەبی ، مێژۆی سوککەزی کە هەمۆ خەزاکانی سـەلیم خانی داگیرکەری میسری تێدایە ، مێژۆی میسر دانانی شەهاب چەلەبی ، حوسنول موحازەرە یا مێژۆی (شێخی سیوتی کە لە زەمانی بابە ئادەمەوە تا سەردەمی ( عەمری کوڕی عاس ) کـە میسری گرت هەمۆ بەسەرهاتەکانی میسری تێدایە و مێژۆیێکی پڕ بایەخە ، ئەم کتێبە ( شـەهاب چەلەبی ) بە شـێوەیێکی ئەوەندە رەوان و خـۆش نۆسیویەتی و کردۆیە بە شیعر کە شیاوی خوێندنەوەیە ، هەر ئەم شەهاب چەلەبیە مێژۆی سوککەری نۆسیوە ، فتوحاتی میسر دانانی ( ئیبن عەبدول حەلیم) ، فەزایلی میسر دانانی (ئەبی عەمری کەندی) ، کتێبی ئیبن دولاق ، کتێبی مەلەکان ، خوتەتی قوزاعی ، کتێبی ئیبن ئەلیەسیر ، کتێبی ئیقازول موتەفەززیل ، کتێبی ئیقازول غافیل دانانی (تاجدین محەمەد کوڕی عەبدوڵلا)، کتێبی ئەلمەسالیك دانانی ئیبن فەزلوڵلا ، کتێبی ئەلموختەسـەر دانانی شێخ (نەسرەدینی کرمانی) ، مەناهیجول فیکر مەناهیجول عیبەر ، عینوانول سیەر ، باسـی پێغەمبەر دانانی نـوح ئەفەندی باسـی پێغەمبەر دانانی وەیـس ئەفـەندی ، واقیعـە نـامەی وەیـس ئەفەنـدی ، عەوانـول سـەواب هی محەمـەدی کوڕی عەبدولەلیکی هەمـەدانی ، تاریخـول سـەحابە ، ئەلتەجرید فی ئەلسـەحابە هی ( زەهـەبی ) ، ئەلئیسـابە فی مەعریفەتیل سەحابە ، ریجـالول کوتوب ئەلعەشرەی حوسـێنی ، تەبەقاتول حوففازی زەهەبی ، تەبەقاتول شافیعیەی ئیبنول سوبوکی ، تەبەقاتول مالیکیەی ئیبنو فەرحۆن ، تەباقاتی شەعرانی ، میزانی شەعرانی ، تەبەقاتول حەنەفییەی ئیبنو دوقماق ، میرئاتلزەمان دانانی (سەبتی کوڕی جۆزی) ، ئەلبیدایە وەلنیهایەی (ئیبنو کەسیر) ، کتێبی ئەلسوکەردان هی (ئیبنو حیجلە) ، ئەلسەجعول هەزیل فی ئەوسافیل نیل ، مێژۆی غابن ، سیمارول ئەوراق هی ئیبنو حوجە ، قازی

خان ، بەزازیە ، تاتار خانیە ، کەششاف ، سن داود ، دەدە جەنگی ، عەقایدی بەکەویٚ ، محەمەدیە ، جامیعول کەبیر ، جامیعول سەغیر ، ئەنوارول عاشقین، توحفەتول ئەبرار ، کلیلە و دیمنە •

جگە لەمانە حەفتا و شەش بەرگ کتێبی فارسیٚ و عەرەبیٚ و تورکیٚ لە دانانیٚ ( عەبدالّ خان ) خۆی لەگەلّ سەد و پێنج پارچە نامیلکەی جۆربەجۆر کە زوربەیانی بە زمانی فارسیٚ نوسیبو • دوسەد بەرگ ئەتلـەس مینـۆر و جوگرافیٚ و پاپامۆنتە و کتێبی هەیئەت و حیکمەت بە چاپی فەرەنگ ــ هەر کەس دەیانبینیٚ هۆش لەســەریا نامێنیٚ ــ ، چەند نەخشەی رەنگاوڕەنگی دنیای کۆن و نویٚ کە سەری تەماشاکەریان دەسوڕاند ، هەر جــۆرە گیا و روەکێك بۆ پزیشکان پێویست بیٚ • وێنەی هەمو ئەندامی لەشی ئادەمزاد کە هیچ تەماشاکەرێك لەگەلّ ئەندامی راستەقینەدا لێکیان ناکاتەوە و لەفەرەنگ چاپکراون • دوسەد دانە وێنە و نیگاری سەرسوڕێنەر بە قەلەمی عەجەم و فەرەنگ کێشراون و هەریەکەیان نمونەی جادوکارییە ، یەك لەوانە نیگاری شەڕی نێوان دو دەستە کەشــتیٚ شەڕکەر بو کە بە پوختــەییٚ لــە کاری جادوگەر دەچیٚ و پێتوایە ئەوە زینــدون و لە بەرچــاوتن • دەســکردی هونەرکارە بەناوبانگەکانی جیهانی وەکو ( شاقولیٚ ) ، (وەلیٚ جان) ،(شەمسیٚ خان) ، (مالیك) ، (ئەرژەنگ) ، (ئاغا رەزا) ، (محەمەد رەزا) و (بەهزاد)یان تێدابو کە چاوی تەماشاکەریان ئەبلەق دەکرد و پیاو لە تەماشایان تێر نەدەبو، ئەسپێك و فیلێکی جادویی کێشرابو کە بەراستیٚ جادویان کردبو • وێنــەی بیٚهاوتای سەر قوماش لە دەسکردەکانی (ئاغاجان) و (تەقیەدینی بەلخیٚ)یان لەناودا بو ، قەلەمکاریٚ ریزوان بەگی میرییش کە یەکەمی زەمانەیە •

بەلێ هەزاران بەرهەمی هونەرکارە بەرزەکانی دنیا لێرەدا خرابــوە هەڕاجەوە و ئەو کوردە هەمەڕەنگە و ئەو جرّوجانەوەرانە و ئەو خەلــکەی هینی خۆی و گێزەر لێك ناکەنەوە ، ئەم وێنانەیان دەستاودەست دەگێڕا و

لەم خێوەتەوە دەیانبردە خێوەتێکی دیکە و بێ‌قەدر ئەمدیوەودیویان دەکردن تا وای لێ دەهات بە شڕ و ژاکاوێ دەدرایەوە دەستی دەلاڵەکە ٠

**بەسەرهاتێکی مخابن :**

ئەم هەمو ئەتێکە و گەنجە بەنرخانەی باسمان کردن وەکو تور و گێزەر دەکڕران و دەفرۆشران ، تەنانەت یەکێکی دۆزۆی دەمارگری ئێرباز لە دەستەی (قازێ زادەکان) نامەرد و درۆزن و بوختانکەر و رەزا قورس ، هێچ نەزان و پشت‌گوێ‌خراو و بەکارهێنراو (!) دایك‌حیز و لە تاقمی‌دژ بە چاکە ، بەتەمای قازانج لەو هەڕاجەدا شانامەیێکی ئەتیکە بە هەزار و شەشسەد قرۆش دەکڕێ و دەیباتەوە خێوەتی خۆی ، ئەو ناپیاوە بەبیانوی ئەوەی گوایا وێنە حەرامە هەرچی وێنە نازدارەکانی ئەو کتێبە هەیە تێکی‌دەدا ، بە چەقۆی تورکمانێ بەردەبێتە چاوی وێنەکان هەڵیان‌دەکۆڵێ و لاپەڕەکانی کون‌کون‌دەکا ، هەندێك وێنەش بە ناوی ئەوەی گوایا سەری دەبڕێ چەقۆ بە ملیاندا دێنێ یا ئەو سەرو چاوە جوانە و جلوبەرگە رازاوەیان بە تف و لیکی دەمی پیسی دەشێوێنێ ، ئەو وێنە بە نرخانەی مامۆستای هونەرکار بێگومان هەریەکەی مانگێکی پێوە خەریك و ماندو بوە تا ئاوا بەتەواوێ دروستی‌کردون ، ئەم نامەردە بێ‌ئەدەبە بە تفێك خراپی کردن ٠ بۆ سبەینێ کە دەلاڵ دێ و داوای پارەکەی لێ دەکا ، دەڵێ «من ئەمەم بۆچی‌یە ، ئەم کتێبە گاورانەیە ؟ پڕیەتی لە وێنەی حەرام ؛ ئەمشەو هەر ئەوەم پێ‌کراوە وێنەکانی رەش‌کەمەوە و تێکیان دەم»، شانامەکەش فڕێ دەداتەوە سەر دەلاڵ ٠ دەلاڵ کە ئەمە دەبینێ هاواری لێ هەڵدەستێ « کوڕە هەی ئۆمەتی محەمەد ، وەرن بزانن ئەم زاڵمە چێ لەم کتێبە نازدارە کردوە ؟ » کابرای نامەردیش دەڵێ « چاکم کرد ، دەستم خۆش بێ ، نەهێ مونکەرم پێ کردوە ، تاقە یەك وێنەم لێ کردۆتەوە و هەڵم گرتوە چونکو لە کوڕەکەم دەچێ کە لە شاری (تیرە)

بەجێم هێشتوە ! » دەلاڵ کەوا دەزانێ یەکسەر رادەکا بۆ کن پاشا و دەڵێ « وەزیری گەورەم ، ئەم شانامەیە کوێخای بەگی هەکاری (خانمراد بەگ)ی جولەمێرگی دوێنێ بە هەزار و دوسەد قرۆش لـە هەڕاجدا کڕیبوی کەچێ حاجێ مستەفا ناوی تیرەیێ لەسەری کرد بە هەزار و شەشسەد قرۆش و بردێ، ئەمڕۆ چوم پارەکەی لێ وەربگرم کتێبەکەی بەسەردا دامەوە ، چونکو خۆی لە قازیزادەکانە و پێیوایە وێنە حەرامە ئەم شانامە بەنرخەی ئاوا لێکردوە فەرمون ببینن ، تەنانەت دەلاڵێ منیشی نەدا » •

پاشا و دانیشتوان کە ئەمەیان دی زۆر داخیان خوارد و نەحلەتیان لە کابرا کرد ، دەلاڵ گوتێ قوربان لەم ناوەدا دەلاڵیەکەی منی تێدا نەچێ » ، پاشا گوتی « دەلاڵ دڵنیا بە نە دەلاڵێ تۆ و نە ماڵی سوڵتان نافەوتێ • دەی خێرا ئەو حاجێ تیرەیییەم بۆ بێنن » ، پیاوەکانی بە پەلە کابرایان بۆ هێنا ، پاشا لێی پرسێ « کابرا ئەوە بۆ وات لەم کتێبـە کردوە ؟ » کابرا گوتی • «چێ ، بۆچێ ئەمە کتێبە ؟ ئەمە دەسکردی گاورانە ، چـاکم کرد ، نـەهێ مونکەرم کردوە » پاشا گوتی « تۆ بەرپرسی نەهێ مونکەر نیت . بـەڵام من بەرپرسی فەرمانی میریم ، هەر ئێستا نیشانت دەدەم تێکدانی کتێبێکی دوهەزار قرۆشێ سزای چیە ، ببەن » کابرا هەرچەند هاواری کرد « مـن یەنیچەریم ، لە هێزی دەروازەم » سەربڕەکان بوارەیان نەدا بردیان هـەزار داریان لێدا و بە فتوای قازێ هەزار و شەشسەد قرۆشی میری و دە قرۆشی دەلاڵییان لێ سەند ، شانامە شڕەکەشیان دایەوە دەستـی و لـە ئۆردوگا دەریانکرد ، کابرا هەر دەڕۆیێ و دەیگوت «دەك بەڵام لێدای» خەڵکیش بە هوها و فیکەکێشان دوایکەوتبون بەراستی کردیـانە مەیمـون و بـەو ناوبەردایەدا وەکو شاربەدەر بەرەو دیاربەکریان بەڕێکرد •

خۆکراوەییەکی نەدیتراو کە بریتێ بو لە سێسەد و هەشتا پەڕە و هـەر پەڕەی دەسکردی یەکێك لە مۆر هەڵکەنە هەرە بەرز و ناسراوە کۆنەکانـی

جیهانی پێوەبو ، ئەم مۆرانە هەندێکی شیعر و هەندێك سەجع و هەندێکی دیکەیان ناوە کە تێکەڵاوی قسەی نەستەق کرابو ، خەتی ئەم مۆرانە لە تەعلیق و نەسخەوە بگرە تا روقعە و کوفی تێدابو ، لەناویاندا دەسکردی مۆرهەڵکەنە ناودارەکانی وەکو (نەقشی) ، (سەلامی) ، (شەهلاد بەگ) ، (جان بەگ) ، (مەمی) ، (سەهی) ، (جەم بەگ) ، (چەمەنی بەگ) ، (ئەحمەد بەگ) ، (مەحمود چەلەبی) ، (فەرید چەلەبی) (سەیری چەلەبی) بەرچاو دەکەوتن ، ئەو مۆرەی لە لاپەڕەیێك درابێ لە لاپەڕەیێکی دیکەدا دوبارە نەکرابۆوە • ئەم تۆمارە رەنگینەش زۆری دەستاودەست کرد و نەزانان ئەمدیوە و دیوایان کرد تا لە دواییدا (عەلیەفەندی غینایی زادە) بە سەد قرۆش کڕی •

سێسەد و هەشتا پارچە شیری دەبان و جەوهەردار و نقێمکاری گرانبایی بە کالانەوە کە هەمویان لە پۆڵای شێخانی و مەقراوی و سەنقوری و ئەسەدی و جیسقاوی و داودی و هیندی و ئیسفەهانی و شامی و میسری و ئەستەمۆلی کۆن و فەرەنگی و ئەڵمانی و سەلانیکی دروست کرابون و خاسیەتیان لە کاتی ئاراستەکرانە سەر ملی دوژمن دەردەکەوت ، خوا رەحمی کرد بە راستی نەکەوتنە کار تا ئێستا بۆ هەپاچ کران هاتنەدەر •

سێ سندوقی پڕ لە خەنجەرە بەناوبانگەکانی کوردستان بە کالان و بە روتی •

دوهەزار مەتاڵی حەڵەبی و عەنتابی و میسری و داغستانی و دیاربەکری لەئاسن دروستکراو کە لەکاتی شەڕدا گیان دەرباز دەکەن •

هەزار و حەوسەد دانە گۆپاڵی بەغدا و بەسرای سەر بە بزمار و رمبی میسری لە چەشنی غوری و گورزی قیستمونی دەسك زیو و پەڕدار •

دوسەد دانە پەروانەی دەرەوە لە دەسکردی وەستاکانی وەکو (حاجی

ڕەجەبی پرۆسەیی) و (کوڕی خێرلێ گەلیبۆلێ) و (محەمەدی گالەتەیی) و (وێسفی میسری) و (جانێ شێرازی) و (خانقولێ شێرازی) و (یار وەلێ شێرازی) و (وەستا عومەری ڕۆمی) و (وەستا قوردێ میسری) و (میرزا جانی بەلخی) کە بە ڕاستی هونەریان تێدا کرابو فرۆشران •

سەدهەزار جۆرە خەدەنگ و تیر و تێزە و سەرە ڕمب ، کە هەریەکەیان یادگاری وڵاتێك و سەردەمێك بون ، تیردانەکانیان بە پەڕی تاوس و شابالی هوما ڕازابونەوە و کلکی تیرەکان پەڕی کۆتری زیرەکیان لێ قایم کرابو ، هەزار دانە تیر کە نوکەکانیان بە ژەهر ئاو درابو و کلکەکانیان جقەی شەهێنی لێ بەسترابو •

هەزار دانە تفەنگی ڕەنگداری تەقەپێنەکراوی دەسکردی فەرەنگ کە هەریەکەی یادگاری یەکێك لە کارخانە بەناوبانگەکانی ئەوروپا بون و لەناویاندا دەسکردی ئاسنگەری مازەندەرانێ و سەبی‌ی بەلخی و لاچین یەتم شای ئیسفەهانێ و موزەفەر بای خوراسانی و سوندەك خانی بەلخی و وەستا ئوروجی میسری و ئوزۆن عومەری ئەستەمۆلی و وەستا مەمێ و وەستا عومەری بچوك و وەستا محەمەدە درێژ و قەرە محەمەد هەبو کە وەستایی و شارەزایی خۆیانیان تێدا بەکارهێنابو ، هەر لەناو ئەمانەدا دەسکردێکی حاجی شاش مستەفایان تێدابو کە دەر و ژوری بە دەست چاك کرابو ، ئەم جۆرە تفەنگانە بە تایبەتی ڕادەسپێردران و وێنەیان لە (هەرسك) و (داسلیجە) و (بازارجك) و ئەستەمۆلیشدا نیە ، ئەم وەستایە خۆی لە ئینەبۆلی دادەنیشێ و تفەنگە بێنقێم و ساکارەکانی بە پێنجسەد قرۆش کەمتر نادا و لە ساڵێکدا تەنیا دو تفەنگی بۆ تەواو دەکرێ • وەستا ڕەجەبی قرێمیش هەیە کە لە باخچە سەرای لە کارخانەی محەمەد کەرای خان کاردەکا و ئەویش وەستاییێکی بێهاوتایە •

سێسەد پێستی بەور و پڵنگ ، حەفتا تۆپزی نقێمدار ، دۆسەد تۆپزی زیوی پەتێ ، هەزار تۆپزی ئاسن ، دۆسەد قوڵنگی فەرهادێ ، دۆسەد دانە تۆپزی ئاسنشکێن ، سێسەد دانە زەمبەلەکی یایلێ ، هەشتا دانە زینی زیوی هەڵکەندراو ، هەزار دانە سەر زینی سورمە و مەخمور و چۆخە ، دۆ سەد دانە دگدگی بە سورمە ، دۆسەد دانە لغاوی شامێ و ماردینێ ، هەشتا دانە پاڵتۆ و ڤوشقونی چۆخە و سورمە و دۆسەد دانە عەبای شان سورمە •

دۆسەد دانە جلەوی زەرد و سپێ بە سورمە کراو کە دەسکردی خان خۆی بون یەکی بە یەك کیسە فرۆشران و ئەو خەڵکە بۆ کڕینی پاڵەپەستۆیان بۆ ، شەشسەد جوت ئاوزەنگێ ئاسنی زەڕکەف ، هەشتا جوت رکێفی زیوی پەتێ •

هەزار پارچە لێفەی دێبا ، زێبا ، شێب ، زێڕ درۆ ، دارایێ کیمخوا ، سەرنەك ، ئەتڵەس و والا • دۆ هەزار سەرینی لۆکەی شێ کراوە لە پارچەی مەخمەر و شتی دێ •

دۆسەد دانە مافورەی ئاوریشمی عەجەمێ ، حەفتا دانە لبادی درێژ و نەخشکاری ئیسفەهان ، سەد و پەنجا بەڕەی فەرەنگێ ، جاجمی عەرەبێ ، شەمەدی بایبوردێ ، قاڵیچەی عاشقانە و بەرماڵی میسرێ ، حەفتا دانە خێوەتی سێ ژوری نۆ ئەستونێ ، شەشسەد خێوەتی کوللە دار ، سێسەد خەیمەی نەخشین ، شەشسەد خێوەت و خەرگا و سێسەد وردە چادر • ئەمانە هەموی بە مەزاد هەڕاج کران و فرۆشران •

ئەم کڕین و فرۆشتنی شتومەکانە هەتا ئێوارە درێژەی کێشا ، کە دیوان چۆل بۆ هەزار کەس لە پیاوەکانی خانی تازە و سێ هەزار عەسکەر کران بە پاسەوانی ئەو شتومەکانەی هێشتا نەفرۆشرابون • بۆ سبەینێ دیسان دەریای حەشامەت لە بەردەمی بارەگادا خڕبونەوە • دۆسەد سندوقی لیپاو لیپ

یەخدانی گەورەی وشتربار هێنرانە پێش کە هەندێکیان لە داری سەرو و هەندێك شۆلی حەڵەب وەکو سەبەتە چندرابۆن ، چەند دانەیێکیان مۆری خانیان پێوەبۆ و زوربەیان مۆری (خانم سولتان) ژنی خانیان لیدرابۆ • ئەمانەش وەکو پێشوەکان لە بەرچاوی مەلای وان و قازیی بتلیس و پیاوماقوڵەکانی شار سەریان هەڵپچڕا ، یەکەم سندوق پڕ بۆ لە کەوا و سەڵتەی هەریر و زێڕدرۆی نایاب و بەرگی شاهانەی وا کە ئەو خەڵکە وێکڕا دەمیان داچەقاند و حەپەسابۆن • سندوقیکی دیی پڕ بۆ لە جلکی سورمەی پەراوێز سپیی ، کراس و ئادەڵ کراسی ژنانە و سەرپۆش و چارشێو ، پاشا گوتی ئەمانە هیی ژنانن با بمێنیی • سندوقێکی دیکە پڕ لە کەوای سورمەی خەتخەتی ژنانە و سوخمەی بە گەوهەر و بەردی بەقیمەت نەخشاو کە دوگمەی سەردەستەیان (ئینجۆن)ی حەبەشیی بە قەدەر فندقێك بۆن ،دوگمەی هەندێکیان زمرۆتی ئەسوانیی بۆن ، پاشا بە چاوپێکەوتنیان چاوی زەق بۆ ، لە سندوقێکی دیکەدا بازن و خرخاڵ و گۆ و گوارە و حەمایەڵ و تاجی زێڕ و گەوهەر و مرواریی لەگەڵ گەردانە و پلپلەی تاج و بازیبەند و دوگمە و دۆلاب ، نەوەد دانەی بیی کەم و زیاد کەمەربەندی ئەلماس و مرواریی کە هەریەکەی خەرجی ولاتی رۆمیان تییچۆبۆ ، کەچیی ئەم نەوەد کەمەر بەندە هیچی لە هیچی نەدەچۆ و لێکتر جیاواز بۆن ، پاشا گوتی ئەمانەش هەڵگرن•

سندوقێکی گەورە کرایەوە بە هەزاران دەستەسڕی بۆنخۆش و خاولیی رەنگاوڕەنگ و ریشۆی مێزەر و پەردەی تەنك دەرکەوت ، لە ناوەندی ئەمانەدا پێش تەختەیێکی سەدەفکاری بچکۆلە دۆزرایەوە کە لە حەوت لاوە قفڵ و مۆر کرابو ، وەستاکان ویستیان بیکەنەوە خەڵکی بتلیس رازیی نەبۆن بەلام وانییەکان پێیان چەقاند کە ئیللان و بیللان هەر دەبیی بکرێتەوە ، بە ناچاری کردیانەوە ، چ ببینین ، پەنا بە خوا ، حەوسەد دەنك لەعلی بەدەخشانی ئاودار ، سێسەد دەنك یاقوتی سور و یاقوتی زەرد و یاقوتی شین،

سێ هەزار دانە پیرۆزەی نیشاپوری ، شەش مشتوی خەنجەری لە پیرۆزە دروستکراو ، حەوت پیاڵەی شەربەتی پیرۆزە ، حەوت فنجانی پیرۆزە ، سێ فنجانی زمرۆت ، سوراوداتێکی زمرۆت ، شەش کاسەی یاقیق و حەوت تەبەقی سیلانی تێدا بو ، لە قوتولەیێکی قەراخی ئەم پێش تەختەیەدا دوسەد و چل و پێنج دانە ئەڵماس هاتەدەر کە هەمویان مۆربون،لە قوتولەیێکی زەردا حەفتا دانە ئەڵماسی نەتاشراو دۆزرایەوە وەکو گەوهەری شەوچرا دەترۆسکانەوە . پیاوماقوڵان و خەڵکی شاری بتلیس ئەشەمبیللایان کێشا و سوێندیان خوارد کە لە بەیانییەوە تا ئێستا هەرچی شتومەکێ هێنراوەتە ئێرە و ئەم مجری گەوهەرانەش هەموی هی خانم سوڵتان کچی (زاڵ پاشا)یە کە بە جیاز لە (عادلجەواز)ڕا لەگەڵ خۆی هێناونی و ئێستاش کلیلەکانی لای خۆیەتی ، پاشا لە بەرچاوی هەمو ماقوڵ و گەورە پیاوان ئەو حەڤدە سندوقەی دایە دەست (عەمبەراغا)ی خواجەی خانم سوڵتان کە بۆی بەرێتەوە. ئاغاکانی وان هاواریان لێ هەستا « وەزیری بەڕێز ، ئێمە ئەم پارەی زەرەر و زیانمان لەسەر خانە ، تۆ ئەمانە بدەیتەوە پارەی ئێمە لە کوێ وەردەگیرێ ؟ » پاشا گوتی «ئەگەر پارەی ئێوە هەموی دەرنەچو من بۆتان تەواو دەکەم ، هەڵیانگرن ئەم سندوقانە » ، ئاغای تەواشی بردنیەوە بۆ خانم سوڵتان .

پاش ناردنەوەی ئەو سندوقانە چەند شتومەکی کەم نرخ مابو فرۆشرا و هەڕاج هەڵگیرا . ئێوارەیێکی درەنگ کە دنیا کەمێك چۆڵ بو لە لایەن خانمەوە دە بوخچەی پڕ لە قوماشی ئاوریشمی بەنرخ و کراس و دەرپێ و سێ کیسەی پڕ لە بەردی بەنرخ و تاجێکی نقێمدار و حەوت کەوای گەوهەردار بۆ خانمی پاشاو چل دەنك یاقوت و سەد دانە لەعلی بەدەخشان و سەد دانە پیرۆزە و پەنجا دەنك زوبەرجەد و پەنجا دانە ئەڵماسی دە قیراتی و دو مشتو خەنجەری پیرۆزە و شەش مجری پڕ لە عودی ماوەردی کە یەکێك

له سندوقه‌کانی داری عود بو ، چل هوّقه میّشکی خوّته‌ن و دوّسه‌د شه‌مامه‌ی عه‌نبه‌ر و سیّ فنجانی پیروّزه و سیّ کاسه‌ی ئاقیق و فنجانیّکی زمروت و سیّ ده‌وری سیلانی • هه‌ر به‌م پیّیه بوّ خانمی پاشا له‌ناو قوتوییّکی زیّری په‌تی‌دا بازنه و خرخالّی عه‌ره‌بی نقیّمداری شیّوه خوّراسانی و شه‌ش دانه گواره‌ی که‌یانی و جقه‌ی هوما و ته‌له‌سمیّکی نقیّمکارو چه‌ند شتی دیکه که له نرخدانان نه‌ده‌هاتن ، بوّ پاشا هات • پاشا وه‌ری گرتن و به (عه‌مبه‌راغا)ی هه‌لّگری ئه‌م دیاری‌یانه‌ی گوت « چ پیّویست بو خانمی کیژم ئه‌م دیاری‌یانه بوّ من بنیّریّ ، من هیچ چاکه‌ییّکم بوّیان نه‌بوه ، هه‌ق وابو ئه‌م شتانه بدرانایه به خانی کوژی خان ، چونکو ئه‌و بوه به چرای هه‌لّکراوی من ، به‌لاّم ئیشه‌للاّ دوای گه‌ڕانه‌وه‌م بوّ ئه‌سته‌مولّ له توّلّه‌ی ئه‌مه‌دا وا ده‌که‌م له لایه‌ن سولّتانه‌وه خاسه‌ی باجی موّشی بوّ دیار بکریّ ، له زمانی‌منه‌وه به‌م‌جوّره سلاّوی لیّ بکه » ، خه‌لاّتیّکی سموّریشی دا به عه‌مبه‌راغا و ناردیه‌وه ، پاشاش که دیاری‌یه‌کانی وه‌رگرت خوّی کز کرد • بوّ روّژی دوایی که دیوان داندرا و خه‌لّك بوّ هه‌راج کوّبونه‌وه ، بانگهیّشتنی خانم سولّتان روّی دا •

## بانگهیّشتنه‌که‌ی خانم سولّتان

له لای شاری بتلیسه‌وه سیّسه‌د پیاده ده‌رکه‌وتن که هه‌ریه‌که‌یان سینی‌ییّکی پڕ له کاسه و ده‌وری فه‌خفوری و قاپی زیّری په‌تی له‌سه‌ر بو ، (عه‌مبه‌راغا) ئه‌مانه‌ی له به‌رده‌م پاشا دانا و گوتی « خانم سولّتانی گه‌وره‌م سلاّو له پاشای به‌ڕیّز ده‌کات و ئه‌م به‌رقه‌لیانه‌ی بوّ ناردوّن » جا خوّی په‌شته‌مالّیّکی زیّردروی له پشت به‌ست و سفره‌ییّکی قه‌لّه‌مکاری ئیسفه‌هانی ریّکخست که هه‌رچی له‌ویّ بوّن ئافه‌رینیان له ده‌م هاته‌ده‌ر ، مه‌سینه و له‌گه‌نیّکی نقیّمکاری هیّنا پاشا ده‌ستی شوشت و بیسمیللای کرد سه‌رقاپی هه‌مو خواردنه‌کان لابرا ، ئای له گه‌وره‌یی خوا ••• چونکو خواردنه‌کان

به میشك و عوّد و عه‌مبه‌ر لێ‌ترابوّن بوّن و په‌رامه‌ی خوّش ئه‌وناوه‌ی پڕ کرد، خوارده‌مه‌نی‌یه‌کانی سه‌ر ئه‌و سێسه‌د سینی‌یه له خوّشترین و به‌تامترین خواردنی دنیا بوّن : پلاو بریانێ به زه‌عفه‌ران ، کوکێ ، چلاو ، ئوسله ، خوّشه‌ك ، عه‌مبه‌ر ، گولنان ، سێر ، گولاو ، کفته ، بادام ، سنه‌وبه‌ر ، توّ و شتی دێ •

که پاشا دانیشته سه‌ر سفره و به خه‌لکه‌که‌ی گوت فه‌رموّن ، ده‌فته‌رداری وان گوتی « گه‌وره‌م ، توّ خوّت ده‌زانێ ئێمه چه‌ندمان شیر له رۆی ئه‌م شاری بتلیسه وه‌شاند و سه‌لته‌نه‌تمان لێ تێکدان ، کتێبێك هه‌یه ناوی ( مه‌کری ژنان )ه نازانم خوێندوّته‌ته‌وه یان نا ؟ ئه‌م خواردنه بێته شیری خورما و نه‌باتی حه‌مه‌وێ ده‌می لێ ناده‌ین » ، ئه‌مه‌ی گوت و کشایه‌وه ، پاشا بانگی شانێ ئه‌فه‌ندێ کرد گوتی توّ وه‌ره بخوّ ، له ئاغاکانی وان کوڕی ده‌میرچێ گوتی «عه‌مبه‌راغا پیاوێکی به‌ڕێزه با بێ له‌گه‌لمان دابنیشێ و بخوا، هه‌ر قاپێ ئه‌و لیی خوارد ئێمه‌ش لێی ده‌خوّین ، ( عه‌مبه‌راغا ) گوتی قه‌یدی چی‌یه ، بیسمیللای کرد و هات چوّك به چوّکی پاشا دانیشت و یه‌که یه‌که له قاپه‌کانی ده‌خوارد و به‌وانی ده‌گوت بخوّن • ئه‌شه‌ده‌مبیللا ده‌توانین بلێین خوارده‌مه‌نێ به‌هه‌شت بوّ . منیش به جوّرێك به‌ربوّمه سه‌ر خواردن هه‌ر مه‌پرسه !

دوای نان خواردن ، تاقمه سینی‌یێکی دیکه‌یان هێنایه پێش که شه‌ربه‌ت و خوّشاوی جوّربه‌جوّریان له‌سه‌ر بوّ ، پاش خواردنه‌وه و ده‌ست شوّران عه‌مبه‌راغا ده‌ستی پاشای ماچ‌کرد گوتی « سولتان خانمی گه‌وره‌م سه‌لام له پاشای به‌ڕێز ده‌کات و داوای خوّشی و له‌ش‌ساخێ بوّ ده‌کا ، ده‌لێ گه‌وره‌ییم له‌گه‌ل بکا ئه‌م سینی و قاپانه‌م لێ وه‌ربگرێ که به‌تایبه‌تێ هێ (زال پاشا)ی باوکمن » پاشا زوّر مه‌منوّن بوّ و گوتی « خوا روّ سوّری کا و له‌شی ساخ بێ ، ده‌ی خێرا ئه‌سپه بوّره‌که‌ی خوّم بێنن با عه‌مبه‌راغا سواری

بێت و هەر بۆ خۆشـــی بێ » ، پاش ڕۆیشتنی عەمبەراغا پاشـــا ڕوی کردە (زیادین خان)و پێی گوت « کوڕە بەراستی دایکت ئێمەی شەرمەزار کرد» •

## دیسان هەڕاج

لە ماڵی تالانی چوار بار عود و سەندەڵ دەســـت چەلۆکانی هەکاری کەوتبو و لەلاییەکەوە فڕێیان دابو ، حەزیان لە چێشتی گەنمە شامی بە شیر کردبو ، ئەمان کە نەیاندەزانی عود و سەندەڵ چییە ، شیر و گەنمەشامییان کردە مەنجەڵ و داری عود و سەندەڵیان لە ژێریا داگیراند ، بۆن و بەرامەی عود بە ناو ئۆردودا بڵاوبۆوە • فەڕاشەکان زو گەیشتنە سەریان و بە تاوانی ئەوەی باخی خانیان تالانکردوە و ئـــەم عود و سەندەڵەیان لەوێ هێنـــاوە ڕەکێشیان کردنە لای پاشا و مەسەلەکەیان بۆگێڕایەوە ، دانیشتوان ئەوەندە پێکەنین بورانەوە ، پاشا گوتی ئەمانە شەڕکەر و قارەمانن ، عود و سەندەڵیان نەدیوە و نازانن نرخی چییە ، پاشان بە ڕێزەوە ناردنیەوە جێی خۆیان و چوار جەواڵ عود و سەندەڵیش لە سوتان ڕزگار کرا •

لە هەڕاجی ئەو ڕۆژەدا حەفتا بارە ئێستر قاپ و تەشـــت و مەنجـــەڵ و مەسینـــە و لەگەن و تیان ــ مەنجەڵی گەورە ــ و قاپ و قاچاخی مدبەق ، هەشت دانە شەمدانی زیو ، سەد دانە شەمدانی بچوکی ئاگرکردنەوە ، چل دانە مەقەستی زیو [٢٨] ، هەشت بخوردانی نقێمدار ، بیست دانە گوڵاودانی بلوری تراشکار فرۆشرا •

باری بیست ئێستر ســـندوقی گەورەی لباد تێدا ڕاخراو هات ، لـــە ناویاندا شەشسەد کاسە فەخفوری گرانبایی ، دە دەوری بەرقلیان خواردن و

(٢٨) مەقەست ئامێرێکی پێویستی مۆم و شەمدان بوە بۆ قرتاندنی سەری ئەو مۆمانەی لە کاتی سوتاندا دەزوەکەی ناویان گرمۆلە دەبێت و ڕونـــاکی کز دەکا و پێویستی بە قرتاندنە .

فنجانی چوار گوڵ ، کاسەی بولغاریێ ، کاسە و تەبەقی چینی ، سەد و پەنجا کوپەی بەلەمێ و خوسرەوانی‌یان هێنایە دەر کە لەناو ئەم کوپانەدا مرەبای کەبات و ئەملەج و کابولێ و هەڵوژەی خوراسانێ و قۆخی بوخارایێ و سێو و زەنجەفیل و گوێزی هینـدێ و ترشـیاتی خەیار و ڕێواس و خورمـای حەبەشی‌یان تێدا بو ، کاتێ دەلاڵ ئەمانەی هەڵگرت و دەستاو دەست گەڕان، هەر کەسە بە ناوی چێشـکە کردن قامکێکی لێ دەدان زۆری نـەخایاند کوپەکان خاڵی بونەوە و دەلاڵەکان باریان سوکتر بو ، هەزار و شەشسەد بەلەم بە هەرزان فرۆشران •

چل بار مێزەر هێنرایە پێش ، خوا ئاگادارە مێزەری محەمەدێ وایان تێدا بو سێ چل درەمی دەهێنا ، پێنج بار مێزەری رەنگاوڕەنگی دەسکردی ئەحمەداباد و گولکەنداباد و دێوەبەندەرئاباد و مەحموود ئابادێ ولاتی هیندی تێدابو هەمو رێشوی ئاوریشمیان لێ نرابو •

سندوقێکی تەختەی سەرێی زۆر زل بە چوار زەلام هەڵیـانگرتبو ، کە کرایەوە پڕ بو لە خەلاتی هێجگار بەنرخ وەکو قومـاشی زێڕدرو و شـاڵی کشمیر و کوتاڵی داوی زێڕ تێ‌هەڵکشاو و هەریر و ئاوریشم ، حەوت کەس لە یەنیچەری‌یەکانی وان هاتنە پێشەوە ، یەکیان گوتی قوربـان ، مـانگی شەعبانی رابوردو لە قەلای وان هاتینە خزمەتت و شکاتمان کرد کە خـان حەوت بار کوتاڵمانی لەجیاتی باج لێ گێڕاوینەوە و لێی‌کوشتوین و بریندادری کردوین ، ئەمە بارەکانی ئێمەیە ، پاشا لە خەڵکی ولات و باجگرەکانی پرسیار کرد ، گوتیان بەڵێ ئەم حەوت بارە هیێ ئەمانەیە ، کوتاڵیان هێنابو باجیـان نەدا بە خان و هەرایان هەڵگیرساند ، خانیش لێی‌دان و حەوت باری لەجیاتی باج لێ‌سەندن • پاشا فەرمانی دا پاش باج لێ وەرگرتن بارەکانیان بدرێنەوە•

حەفتا بوخچەی دێ دیبـا و زێڕباف و سرنـگ و خـارا و پـەردەی قەڵەمکاری سەراپەردە و پەردەی تۆڕ و دۆشەگەڵەی چنراو •

لەناو حەوت سندوقدا حەفتا تەختە کەوڵی سمۆر و شازدە کەوڵی سمۆری بەرچۆخەی هەمە رەنگ و بیست کەوڵی سنجاوێ بەخورێ و پەنجا کلاوی کەوڵی وشەك کە بەریان چۆخەی هەمەڕەنگ بۆ یازدە دانە کەوڵی قاقمی سپێ بەرچۆخە ، زیاتر لە دوسەد کەوڵی شینی عەجەمی بێبەر •
ئەو جارەی پاشا لە ئەستەمۆڵەوە هاتبوە بتلیس و میوانی خان بوبو ، کەوڵە سمۆرێکی سپێ خەلات کردبو ئەویش لەناو ئەمانە دا بو ئاغای یەنیچەرییەکانی وان بە هەزار قروشی کڕێ •

جگە لەو شتانەی باس کران ، چل باری تەواو شتومەك و کەلوپەل لەناوسندوقاندا کە جلك و بەرگی سوڵتان خانم و ژنی خانی تازە و ئافرەتانی ماڵەوەی خان بون بێئەوەی دەستیان لێ بدرێ لە بەرچاوی هەموان و لەسەر رازێبونی گشت لایەك درانەوە دەست عەمبەراغا و نێررانەوە بۆ سوڵتان خانم • ئێستا ئەگەر من شتە فرۆشراوەکان و ناوی کڕیار و پارەکانیان بنوسم ، نوسینەکەم ئەوەندە درێژ دەبێتەوە سەر دێنێتە ژان •

## ئەنجامی هەڕاج و دەسکەوتی مەلیك ئەحمەد پاشا

ئەم هەراجە چوار رۆژی تەواوی خایاند ، لەو پارەیەی کۆکرابۆوە پاشا لە بەرچاوی هەموان دوسەد کیسەی خەرجی هێزی وان دا بە ئاغاکانیان و قەباڵەی شەرعێ پێ نوسین ، پاشا و خانی نوێ یەکی وێنەیێکی ئەم قەباڵەیەیان لای خۆیان هەڵگرت ، هێزەکانی وانیش پەنجا کیسە هەقی ماندوبونیان دا بە پاشا و بەمجۆرە تۆڵەی خۆیانیان لە (عەبدالخان) کردەوە !

محەمەد بەگی مەلازگردیش کە گوایا چل هەزار سەر مەڕی تالان کراوە شێست کیسەیان دایێ رازێ بو و قەباڵەیان لێ سەند درا بە پاشا و خانی تازە • ئەو محەمەد بەگە لەمەوپێش پەنجا کیسەی لە ماڵی خان

تالآنکردبو هێنایەوە بۆ پاشا ، پارەی شتومەکەکانی دیکە لە پاشا بەولاوە کەس لێی نەپرسینەوە و شتە زۆر گرانەکانیش هەر خۆی زیادی دەکرد و لەسەر خۆی دەنوسی و کەس شتی بەنرخی دەست نەکەوت ، تەنانەت منیش کەس لێی نەپرسیم •

خانی تازەی بتلیس زیادین خانیش بەپێی نەریتی کۆنی خۆیان خەڵك سێسەد کیسەیان بۆ خڕکردەوە و ئەویش سەد کیسە هەقی زەحمەتی دا بە پاشا لەگەڵ پێنج تەویلە ئەسپی سواری و دە قەتار ئێستر و دە زرێ و دە خولام و پێنج کەنیز و خێوەتێکی نەخشین و پەنجا شەمامە عەمبەری خاو •

خانی تازە بۆ سەلماندنی ملکەچی خۆی بۆ سولتان بەڵێنی سەد کیسەی دا . ئەو سێ مجری‌یەی لەپێشەوە باســانکردن هێنایانــەوە ، هــەرچی گەوهەری تیاندابو بە تەرازو کێشایــان و نوسران و بە ئەمــانەتی خــوا و پێغەمبەر درانە دەستی پاشا و پاشاش دای بە هێزی وان کە لە خەزێنــەی قەلای واندا هەڵگیرێ • خانی تازە لەبریتی تازەکرانەوەی فەرمانڕەوایی‌یەکەی دەستەبەری چەند کیسە بو بۆ سولتان و سەدری ئەعزەم و ( دە بە محەمــەد ئــاغای مەتارەچی ) کرایە بەرپرسی ئەستاندنی ئەو دەستەبەری‌یە •

بەگەکانی (ئەرجیش) و (عادلجەواز) و (موش) چوبون بەدوای خانــی هەلاتودا بگەڕێن هاتنەوە بێ‌ئەوەی سەر و شوێنێکیان لە خان زانیبێ ، بەلام لەو کێوانە بیست هەزار و شێست سەر مەڕیان لە مەڕەکانی محەمەد بەگی مەلازگردی دۆزیبۆوە ، کاتێ بە محەمەد بەگیان گوت ئەمانە مەڕی تــۆن و دوروشمیان پێوەیە وەرە وەریانبگرەوە ، گوتی حاشا نامەوێ ، من زۆر نی‌یە شێست کیسەم لەجیاتی ئەو مەڕانە وەرگرتوە ، ئەم بیست هەزار سەرە بــۆ پاشا و گەردنی ئازا بێ ، پاشا خەلاتێکی دیکەشی دا بە محەمــەد بــەگ و مەڕەکانی دایە دەست وەکیل خەرج بیانفرۆشێ و پارەکەی بدا بە کوتــاڵ بۆ بەرگی سالآنەی عەسکەرەکانی پاشا ، جا ڕوی کردە بەگەکانی ئەرجیش و

عادلجەواز و مۆش و پێی گوتن « سەلامەت بن ، دەبوایە ئەم یاخیبەتـــان بدۆزیایەتەوە » ، ئەوانیش گوتیان « قوربان ئەوا حـــەوت شـــەو و رۆژە لەمناوەدا دەگەڕێین و شوێنیمان نەدوزیوەتەوە ، بەلآم تۆشی دەستەیێـــك لە عەسکەرە پەراگەندەکانی بۆین شەڕێکی قورسمان لەگەڵ کردن ، ســـەد کەسێکیان لێ کوژرا سەلکەکانمان هێناون و سەد کەسێکیانمان بە دیـــل گرتـــوون وا لێـــرەن » پاشـــا فەرمـــانی دا ســـەربڕەکـــان ئامـــادە بـــن ، دوای نوێژکردن گۆچانەکەی بە دەستەوە گرت و لەسەر کورسێ دانیشت و گوتی دەی سەربڕ خەریك بن ، ئەو ئاغایانەی لەوێ بۆن بەسەر دەســـت و پێیداکەوتن و تکایان بۆ کردن ، پاشا تکای قبۆل کردن و هەر ئاغایـــەی دۆ سێ کەسی پێ بەخشین و پێی‌گوتن ئاگاتان لێیان بێ ئەمانە ئازادکراوی منن رێزیان بگرن • ئەو بەگانەی کەللە سەرەکانیان هێنابۆ یەکی خەلاتێك و کلآو خۆدێکی پەڕداری لەسەر نان ، منیش بە هەلم زانێ چۆمە پێشەوە گوتم « پاشام ، لە شەڕی مەتەرێزەکاندا ئەو رۆژەی منت بۆ لای بەگی مەحمۆدی نارد تا بێتە یارمەتیتان ، (سولحان)ی نەگریس کە نیازی بۆ ســـەرم ببـــڕێ سەریم بڕێ و هێنامە خزمەت تان• ئێستا داوای خوێن‌بایێ سولحان دەکەم»، پاشا گوتی « ئەشەدەمبێللا ئەولیا راست دەکا ، دەی خێرا کەن ، تۆ لـــەم خەزایەماندا فەتحی شەریفت بۆ خوێندین و بەسەرهاتەکەمان بە چاکی لای خۆت دەنوسێ ، سەری سولحانێشت هێنابۆ » ، جا سەد قرۆشی دامـــێ و خەلآتێکی گرانی بە شانمدا و کلآو خۆدێکی لەسەر نام و لەناو خەلکان بەرزی کردمەوە •

( رەمەزاناغا )ی کوێخای پاشای دیاربەکری بـــانگ‌کرد سێ کیســـە خەرجێ رێگای دایێ و بۆ مستەفا پاشای فیراریش خەنجەرێـــکی دەبـــان و کۆیلەییێکی قوڵ و نامەییێکی پێدا نارد و بەڕێی کردەوە •

لە مانگی رەمەزانی سالی ١٠٦٥دا شاری ( بتلیس )مان بەجێ‌هێشت و

به ئۆردوی دەریا ئاساوە لە ڕێگای ئوواوە گەڕاینەوە و هاتین لە قۆناخی (خسرەو پاشا) وچانمان گرت ، بۆیە گواستمانەوە کە ئۆردوگاکەمان بۆگەنی کردبو و ئەو حەشامەتە کوردەش دەبوایە لە شار دور بخرێنەوە و دەوڵەتی خانی تازەش سەقام بگرێ بڕیار درا یەك ڕۆژ لێرە بمێنینەوە •

ئەو بەگانەی لە ئەیالەتی ئەرزەڕۆمەوە هاتبون خەلاتکران و سەردارەکانیشیان یەکی خەلاتێك و سێ کیسە و چەلەنگێك و ئەسپێکی ڕەسەنیان درایە [٢٩] ، بۆ والێ ئەرزەڕۆمیش خەنجەرێکی دەبان و دەمانچەیێکی نقێمدار و نامەیێك نێررا و ئەوانیش ڕۆیشتن •

ئەو بەگانەی کوردستان کە بەندکرابون هەروا مانەوە ، تەنیا بەگی شیروان لەسەر تکای خانی تازە بە سێ کیسە لێی خۆش بو و گوتی « هەرکەس لە فەرمانی وەزیری عوسمانێ هەڵگەڕێتەوە سەری دەبڕم بەلام لەبەر خاتری خان ئازادم کردی » ، ناردی خەلاتێکیشیان بۆ هێنا ، ئەو بەگە هاتە پێشەوە و دانەوییەوە دەستی پاشا ماچ بکا بەلام پاشا مستەکۆلەیێکی وای لە تەپڵی سەری دا کە ناوچەوانی بەر زەوێ کەوت و وای سەر لێ شێوا لەجیاتێ دەرەوە ڕوی کردە دەرگای ئاغاکان ، هەر گەیشتەوە ناو خێوەتەکانی خۆی بێ ئەوەی تەپڵ و کەڕەنای بۆ لێبدرێ سوپاکەی شوێن خۆی خست و بەرەو شیروان گەڕایەوە •

دوای ئەوە پاشا لەگەڵ میرمیران و پیاوماقوڵان چون بۆ شوێنی ڕاو و سەیرانگاکان و جێگا خۆشەکانی خان • لە گەڕانەوەدا بۆ میرمیران و

---

(٢٩) سەردار : ئەو ئەفسەرە تورکانە بون کە دەخرانە ناو سوپای بەگە کوردەکانەوە تا ئاگاداریان بن و ڕێوشوێنی پێویستیان پیشان بدەن . ئەمانە بەرپرسی ئەو هێزانە بون ، تەنانەت وەکو دەبینین لە کاتی خەلاتکران و تالانپێبڕانیشدا لە شەڕکەرە کوردەکان لە پێشتر بوون و پتریان بەرکەوتوە .

ئـاغاکانی وان یەکی یەك نێچیری راوکراوی بۆ ناردن ، ئەوانیش بۆ هەر یەك لەو ئاغایانەی نێچیرەکەی بۆ هێنان ئەسپێکی کەهێلە و چەند تۆپ قوماشی کوجەرانیان دانێ و بڕیاریشیان دا دیارێ بۆ پاشا بنێرن •

هەمو رۆژێ بەیانیان لەلایەن خانم سولتانەوە سەد و لەلایەن خـانەوە دوسەد قاپ خواردنی بەیانێ دەهات • لەلایـەن خـانەوە سەبـارەت بـە تازەکرانەوەی فەرمانڕەوایی‌یەکەیەوە سەد کیسـەی رۆمـێ بۆ سولتـانی ئەستەمۆڵ و سەد کیسە بۆ وەزیری گەورە (سەدری ئەعزەم) و هەندێکیش بـۆ کاربەدەسـتەکانی ئەستەمـۆڵ رێکـخرا • ئـەو دوسـەد کیسـە زێڕە بەباری بیست ولاخەوە رەوانەی (ئەستەمۆڵ) کران •

بۆ سبەینێ پاشا بە دەستە و دایرەیەوە هاتە ناو شاری بتلیس و نوێژی هەینێ لە مزگەوتی شەرەفخان کرد و لە گەڕانەوەیدا پیـاوەکانی پـارەیان بەسەر ئەو خەڵکەدا بڵاودەکردەوە کە لە راست و چەپی رێگادا راوەستابۆن و هاتەوە بارەگای خۆی ، بۆ بەیانێ تۆغەکانی کەوتنە رێ و خۆشی بەدوایاندا رێگای وانیان گرتەبەر و هاتن •

# گەڕانەوەمان بۆ وان

## لە بیست و نۆی ڕەمەزانی ١٠٦٥دا

لە پێشەوە خانی تازە لەگەڵ پاشادا بە سواریێ ئەسپ و شانبەشانی یەك لەگەڵ ئەو دەستە و دایەرە گەورەیە هەتا بەر بارەگا هاتن ، لەکاتی مالآواییدا خان تکای بۆ بەگی هێزان کرد ، پاشاش تکاکەی خستە سەر چاوی خۆی و هەر لەوێ سێزدە هەزار زێڕ و بیستزرێ و یەك قەتتار زیوی دا بە خەزێنەی پاشا ، بەگی هێزان بەرەڵلآکرا و خەلآتی درایە و دایانەوە دەست خان • خان لە بەگی گەڕگەڕێ پرسیار کرد ، پاشا گوتی « ئیشەڵلآ کە گەیشتمەوە وان دیوان دەگرم و لە سەری دەدەم تا بۆ جارێکیدی هەمو لایێك گوێ لەمستی والیێ وان بن و بەپێی فەرمانی سولتان بجوڵێنەوە • تۆش بڕۆ وریای حکومەتەکەی خۆت بە »، دیسانلەگەڵ خان سەری یەکتریان ماچکرد و لێك جودا بونەوە و خان بەرەو بتلیس گەڕایەوە •

سەر لە بەیانیێ ڕۆژی دوایێ پاشا لە تەحتی وان بزوت و بەلای باشوری دەریادا لەڕێی (قوسقون قڕان)ەوە هاتین ، لەپێشەوە پیادەکانی هەکاریێ و سەگوان و ساریجەکان کێوەکانیان پشکنیێ جا عەسکەری پیادە بە سلآوات لێدان کەوتنە ڕێ ، یەکەم ڕۆژی جەژن بەناو ئەو دار و بەردەدا هاتینە گوندی ( دۆڵە جوان ) کە کەوتۆتە نێوانی چیاکانیێ (هێزان) و (شیروان) و ئاوێکی زۆر ڕۆن و پاکی هەیە دەڕژێتە ناو دەریای وانەوە ، لە هاوێن و زستاناندا بواری پەڕینەوە دەدا ، گوندێکی سێسەد

ماڵی‌یه له خاکی بتلیسدا • بڕیاردرا شەو لێرە بمێنینەوە ، دوهەزار عەسکەری هەڵبژاردەی رۆژەکیمان گەیشتنێ له چواردەوورەمـــان کێشـــکی ئۆردوی پاشایان گرت •

لێرەوە هەندێك به سواری له ئاویان دا و هەندێك بەســـەر پردەکەدا پەڕینەوە و تۆپەکانمان پەڕاندەوە ، جا به رۆخی دەریادا بەرەو خۆرهەڵات ، پەنابەخوا بەناو دارستان و کەند و کۆسپ و بەردەڵانــدا دەهـــاتین کـــه نامەبەرێکی خان گەیشت ئەم نامەیەی دا به پاشا « گەورەم وریا به و ئاگات لەو بەگە گیراوانە بێ ، له کاتی رۆیشتنندا قەرەوڵ و پێشەنگەکانتان وریـــا بن » • پاشا دە زێڕی دا به نامەبەر و فەرمانی دا گیراوەکان لەســـەر پشتی وڵاخ دابەستن و پیادەکانیشمان بەناو کێوەکاندا بڵاوبونەوە •

به شەش سەعات گەیشتینە گوندی (سورە) ، دوسەد ماڵێکە لەســـەر رۆخی دەریا و سەر بە وانە ، کلیسایێکی کۆنی لێیە ، قەشەکان دیاری‌یان بۆ پاشا هێنا ، عەسکەری ئیسلام به شاخ و کێوەکاندا بڵاوبونەوە و پاشـــا لەناو مێرگێکدا وچانی گرت ،ئەو شەوە بەگەکانی زنجیرکرد و نۆبەچی بـــۆ چیای قوسقون قڕان دانا •

رۆژی دوایی به بەلەم پەڕینەوە بۆ قەڵاکەی دوزگەی ( ئاختەمـــار ) • (جالوت شا) لەکاتی خۆیدا کلیسایێکی لێرە دروست کردوە که لـــەکن هەمو دیانەکان زۆر پیرۆزە • ئەم دورگەیە لەناو دەریای وانـــدا له خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆراوا درێژ بۆتەوە و چیایێکی بەرزی سەر له هەورە ، دەوراندەوری حەوت میلە و تەنیا لەلای باشورەوە کوێرە رێیێکی لا پێی زۆر ناخۆشی هەیە ، له باکورەوە سێ میل له بەندەری سەر ئاوی کواش دورە ، له دورەوە نوکی کلیساکەی دیارە • کاتێ قەشەکان دیاری‌یان دا به پاشا و بەخێرهاتنیان کرد و گەڕانەوە ، له قەڵاوە حەوت دانە تۆپی شاهانە ئاگر درا ، منیش لەگەڵ

حەوت پیاوی خۆمدا لەگەڵیان سواری بەلەم بـوم و هـاتم بۆ سـەیری دورگەکە • لەسەر گاشە بەردێکی حەوسەد شەقاوی قەڵاییـکی سـەخت دروستکراوە کە تەنیا لەلای خۆراواوە دەرگاییکی بچوکی هەیە ، ناو قەڵاکە کلیسایێکی کۆنە کە هەرسێ کلیساکەی روان و حەوت کلیسای نەخچەوان و کلیسای قیامەی قودسی شەریف لە چاویا هیچن ، ئەگەر بێتـو پەنجەرە و دیوار و ژورەکانی و شێوەی بیناکەی باس بکەم توسینـەکەم زۆر درێـژ دەبێتەوە ، زیاتر لە دوسەد قەشە و رەهبانی هەیە کە لەبەر پارێز و چلەکێشان لەناو جبە ڕەشەکانیاندا وشك هەڵاتون• خزمەتکارەکانیان ئەوەندە قەدری میوان دەگرن هەر مەپرسە ، چ خواردنێك داوا بکا بۆی ئامادە دەکرێت ، نوێنی دیبا و سەرینی پەڕی قوی بۆ دادەنێـن • کلیساکە بریتییە لە شـەش ئەشکەوت کە هەموی پڕە لە ئازوقەی خواردن و خواردنەوە، لەنـاو ئـەو دەست لە دنیا هەڵگرتوانەدا سێسەدیـان بەرگدرون ، بەڕێوەچونیان بـەو خێراتەیە کە خەڵك بۆیان دێنن ، ئاویان لە عەمباراوەکاندایە •

بە بەلەم پەڕینەوە ئەوبەر ، لە خۆراوای ئەم دورگەیە بە پینج میل دوور هاتینە (ئاق کیرپی) ، ئێرە قەڵای نیە و بواری پەڕینەوەی زۆرە ، لە کـاتی بەرێگادا هاتنمان لەگەڵ پاشادا روەو خۆرهەڵات کە تەماشامان دەکرد لای چەپی دەریای وانمان وەکو خلیجێکی بچوك دەهاتە بەرچاو • ئاوی دەریـا ئەوەندەی شاڵاو بۆ چیاکان بردوە هەموی بنکۆڵ کردون • ئەو کێـوەی لەولامانەوە سەر لە ئاسمان دەسوێ چیای (کیپان)ە کە هەموی یەكپارچـە بەردی خارە و بەردەکەشی وەکو بەردەستێ ئاگر دەدا ، لەم وڵاتە بە رێگای سەخت و چیای زۆر توش دەڵێن کیپان ، جا ئەم کیپانی وانەی سەر رێی قوسقون قڕان لە وڵاتی رۆم و عەرەب و عەجەمدا لە گشت چیاکانی هەکاری بەناوبانگترە • کابرایێك لەسەرەوە بەردێك تل کاتەوە لە خوارەوە هەزار کەس دەکوژێ ، سەروی چیایێکی وا بەرزە و خوارەوەی دۆڵێکی بێ بنە •

وەزیرێك بەناوی ( ئەحمەد پاشای خیابێ ) ویستبوی ئەم رێگایە نەختێك بەرین بکا لە هەندێ شوێن دیواری وشکە کەڵەکی بۆ کردبو و لە هەندێ جێگای دێ بەردهەڵکەنی لەسەر دانابو کە کۆسپەکانی سەر رێگا بتاشێ ، کەچێ خەڵکی ئێرە بە بیانوی ئەوەی گوایا ئەمە رێگا بۆ عەجەم خۆش دەکا بێتە سەرمان نەیانهێشت ئەم کارە خێرە سەر بگرێ ، بەڵام لە راستیدا بۆیە وایان کرد کە دەستی وەزیرەکانی دەوڵەتیان نەگاتێ .

لەم ناوەدا گلکۆیێکمان چاوپێکەوت کە بەسەرهاتەکەی سەرسوڕێنەر و شیاوی گێڕانەوەیە :

## بەسەرهاتی ( چاومار )ی بلۆکباشی

لە ساڵی ١٠٥٥دا کابراییێکی هێجگار ئازا بە ناوی چاومارەوە لەم ناوەدا پەیدا بو کە لە زۆر شوێن خزمەتی کردبو • یەکەم جـار پیـاوی (گورجی نەبی ) و (کوڕی قاترچی) بوە ، کاتێ ئەم دوانە لەگەڵ (مراد پاشا)ی سەرەك وەزیر و (محەمەد پاشا)ی چەرخەچی بەشەڕ دێن پاش حەوت سەعات شەڕ گورجی نەبی دەشکێ و چاوماریش هەڵدێ ، بە ڕێکەوت من لەو شەڕی ئوسکودارەدا بوم ، مراد پاشای سەرەك وەزیر فەرمانێکی دامێ بیبەم بـۆ (شام) بیدەمە دەست (مورتەزا پاشا) • لە نزیك خانی (چاقت) توشی ئـەم چاومارە بوم ، بە چەتەی تێگەیشتم ، بە راستیش وابو ، چونکو لـە ڕوی ناچاری‌یەوە ڕێگری دەکرد •

یەکترمان ناسی‌یەوە و ئەملاولای یەکمان ماچ کرد • حاڵی خۆی بـۆ گێڕامەوە ، کە پێم گوت برام وەرە بتبەمە کن (مورتەزا پاشا) زۆری پـێ خۆش بو، لەگەڵ خۆم بردمە لای مورتەزا پاشا و ماوەیێك لای ئەو مایەوە • لە پەلاماری پاشا بۆ سەر درۆزەکاندا لە دەربەندی ناقورەی ( سـەفەد)دا ئەوەندەی ئازایەتی نواند خۆی پێش خست ، کە گەڕانـەوە (شـام) زۆری نەخایاند شامیان لە مورتەزا پاشا سەندەوە و دایـان بە (ئیبشـیر پاشـا) ، مورتەزا پاشا سیواسی درایە ، مورتەزا پاشا لە (سیواس) چاوماری کرد بـە میراوی شاری (نیکسار) ، شەش مانگ میراوی کرد ، ڕۆژێ (دڵاوەراغـا) ناوێك هات بۆ پشکنین و لێ پرسینەوە ، چاوماری گرت و هەرچی هەیـو

لێی‌سەند تەنیا سێ ئەسپی سوارێ بۆ هێشتەوە • بە هەرحاڵێ بۆ (چاومار) لە بەندیخانە هاتەدەر و سەد کەسێکی لە خۆی خڕ کردەوە و لەناکاو بەسەر ماڵی دڵاوەراغای‌دا دا ، هەرچی دارایێ هەبۆ لەگەڵ پەنجا ئەسپا تاڵانی کردو ماڵەکەشی ئاگر تێ‌بەردا و یەکسەر خۆی گەیاندە کن (محەمەدەمین پاشـــای شەمسێ زادە) لە (وان) ، ئەویش زۆری قەدر گرت • ئەم محەمەدەمین پاشای والێ وانە تێوانی لەگەڵ (سولەیمان بەگی مەحمـــودێ) بەگی خۆشـــاب و فەرماندەکانی (هەکارێ) ناخۆش بۆ ، چاوماری کردە سەردار • ئەویش هەلی بۆ هەڵکەوتبۆ جارێ هێرشی دەبردە سەر هەکارێ و رۆژێـــك پەلامـــاری مەحمودی‌یەکانی دەدا و هەمۆ جارێ بە تالاَنێکی زۆرەوە دەگەڕایـــەوە • وانی‌یەکان ئەم پیاوخراپی‌یانەی چاوماریان زۆر بە دڵ بۆ و هەتـــا توانیـــان رۆیـــان دایێ •

ســـاڵی ١٠٦٠ کە (مەلیك ئەحمـــەد پاشـــا) بۆ بە وەزیـــری گەورە ، محەمەدەمین پاشا لەوان یاخێ بۆ و دەستی بە شەڕ کرد ، قەڵای ســـەرەوە بە تۆپ قەڵای خوارەوەی وانی داگرت و لە چەند لاوە کەلەبـــەر کەوتـــە دیوارەکانیەوە ، لەولاشەوە والێ دیاربـــەکر بـــە هەمـــۆ سوپـــای وان و دیاربەکرەوە هاتە سەر محەمەدەمین پاشا و لە هەمۆ لایێکەوە تەنگی پـــێ هەڵچنرا تا ناچار بۆ شەو لەناوێك بەگوریس خۆی لەدیواری قەڵا شـــۆڕ کردەوە ئەسپیان بۆ راگرتبو سوار بۆ هەڵات ، بە نۆ رۆژ خۆی گەیانـــدە (ئەستەمۆڵ) پەنای بردە بەر (مەلیك ئەحمەد پاشا) ، ئەویش لێی بۆرد و لە (رۆمیلێ) سنجاقی (کۆستندیل)ی پێ سپارد و نـــاردیە کریـــت • لـــە دوای هەڵاتنی ئەمین پاشا تازە (چاومار) نەیدەتوانی لە وان دانیشێ هاتە کن خانی بتلیس ، خان کردی بە ئاغای خۆی و ئیدێ چاومار بە رەحەتێ دانیشـــت و حەســـایەوە •

**دەورەدران و شەڕکردنی چاومار لە چیای کیپان**

نامەیێکی دۆستانە لە برادەرەکانی هێزی وانەوە بۆ چاومار دێ کـە بچێ سەرێکیان لێ بدا ، ئەویش بە پەنجا پیاوی هەڵبژاردەوە بـە رێـگای قوسقون قڕاندا دەڕوا بۆ وان ، تومەز پێنسەد شەشسەد کەس لە پیـاوانی خـانی هەکاریێ هەڵســوکەوتی چاومــار دەبژێــرن و ئــاگاداری هەمــو جوڵانەوەیێکین ، خۆیانی لێ خۆش دەکەن و لە ناوەندی چیای کیپان پێشی پێ دەگرن ، دەبێتە شەڕی دەستەو یەخە ، چاومار دادەبەزێ و ئەوەنـدەی بلێی یەکو دوو حەفتا کەسیان لێ بەردەداتەوە ، ئەم شەڕە گەرمە پێنج سەعات درێژە دەکێشێ ، لە پەنجا پیاوەکەی چاومار بیستیان دەکوژرێن و سێ کەسی لەگەڵ دەمێنێتەوە ، بەو حـاڵەشەوە سـەد کەس لە هەکاریێـەکان دەکوژێ و خەریك دەبن ئەوانەی زیندو ماون هەڵێن ، لە قەڵای وەستانەوە دوو هەزار کەسێك بە هاواری هەکارییەکانەوە دێن • بەو حاڵەشەوە چاومار وەکو سەگی هار بە هەر چوار لادا دەست دەوەشێنێ و خوێن دەڕێژێ •

لەپاش شەش سەعات کە تاقە یەك پیاویشـی لەپشتـەوە نامێنـێ و بە تەواوەتێ شەکەت دەبێ ، دەگەڕێتەوە لای ئەسپەکەی کە خولامێك بۆی ڕاگرتوە ، هەردو چاوی ئەسپەکە ماچ دەکات و سوار دەبێ و دەڵێ ( بـە قوربانت بم مامزی چیا) ، بە شیر وەشاندن دڕ بە دوژمنەکانی دەدا و ڕودەکاتە دەربەند ، کەچێ دەبینێ ئەوا دوو هەزار کەس زاری دەربەندیان گرتوە و بۆی دێنە پێش ، چاومار کە دەبینێ پشت و پێشی گیراوە و هیچ کەلەبەرێك نیە خۆی پێدا دەرباز کا و تەنیشتی ڕەوەزێکی دوو ئەوەندەی منارەی سلەیمانیە بەرزە و بەسەر ئاوی دەریادا دەڕوانێ ، ئاوزەنگێ لە ئەسپ دەدا و هـاوار دەکا (خوایە لەسەر تۆ) ئەسپ دەردەپەڕێ و چاومار چـاوی دەقوچێـنێ ، ئەسپ و سوار لەو ئاسمانەوە لوول دەبنە ناو دەریا ! •••

ئەوانەی چاویان لێ بوبو بۆ پاشایان گێڕایەوە گوتیـان « قوربـان ،

هەمۆمان ڕاوەستابۆین دیمان کە خۆی هەڵداشت ئەسپەکەی وەکۆ پشیلـە چوارپەلی لەژێر زگیدا گرمۆڵە کردبۆ و چاومار خۆی بەسەر زینەکەیـەوە مەڵاس دابۆ و دەریا قوتی دان • زانیمان کە تازە پارچە پارچە بوە • چەند کەسێك چۆنە خوارەوە تا شیر و خەنجەر و تفەنگ و شتەکانی بدۆزنەوە ، بەڵام زۆر گەڕان هێچیان دەست نە کەوت • لەپڕ لەولاوە هەواڵمان بۆ هات کە ئەوا چاومار خۆی و ئەسپەکەی بە مەلە کردن گەیشـتە رۆخی دەریا ، ئێمەش خۆمانمان گەیاندە لۆتکەی چیا و روانیمان دەبینین کە خۆی بەلای راستی ئەسپەکەیدا هەڵواسیوەو پێکەوە بەمەلە لە وشکانی نزیك بۆنەتەوە، لەناو خۆماندا گوتمان « ئەرێ خەڵکینە ئەم چاومارەی چەند وەختە تاڵانمان دەکا و لێمان دەکوژێ و هەر ئەمڕۆ دۆسەد کەسی لێ خستۆین ، ئێستا لێی بگەڕێین هەروا بە سانایێ دەرباز بێ؟ ئەدێ سبەی رۆژ لە بەردەمی فەرماندەی هەکارێ (یەزدان شێر) خاندا وەڵامان چدەبێ ؟ » تێماندا هەبۆ دەیگوت « کوڕە سەر و ماڵم بە قوربانی کوڕی وا بێ ، ئەم هەمۆ کوشتارەی کرد ، بە ئەسپەوە خۆی هەڵداوەتە دەریا ، ئێستاش وەکو ماسی بەناو ئاودا دەخوشێ، ئەمە بلیمەتێ خوایە ! » •

چەند سەد کەسێك سوار و پیادە لەو شوێنەی چاومار خۆی هەڵدابۆ بە قەراخی دەریادا شوێنی کەوتن ، بەڵام نێوانیان سێ سەعات رێ بۆ ، ئەو مەودایەی چاومار بەناو ئاودا لێی پەڕیبۆوە بە وشکانیدا دەبوایە بە پێنج سەعات پێچ بکرێتەوە جا بگاتەوە سەر رێگا ، ئەو جێگایە دەربەندی قەڵای وەستانە و رۆباری خۆشاب لێرە تێکەڵ بە دەریا دەبێ •

بە رێکەوت ئەو شوێنەی چاومار سەری لە دەریا دەرهێنا و پێی خستە سەر وشکانێ ، زەلکاوێکی چۆڵ بـۆ کەس رۆی تێ نەدەکرد • خـۆی و ئەسپەکەی یەك لەیەك ماندۆتر بۆن ، لاقیان هەڵ نەدەهاتەوە ، کەچێ لێرەشدا خۆی لە زەلکاو دەهاتەدەر ئەسـپەکەی دەچەقێ ، ئەو دەردهات خـۆی

ڕۆدەچو ، زۆری پەلەقاژە کرد ، بــە ناچاریێ جزمە و جلکەکانی فڕێدا و جلەوی ئەسپی ڕاکێشا ، کاتێ هات لە زەلکاو دەرچێ دیتی کەوا دەستەیێك سواری (هەکاریێ)بەرەو ڕوی دێن ، چاومار کە زانی تیر و تفەنگ فایدەی نیە و ئەسپەکەشی هێزی دەربازبونی نەمــاوە ، دەســـتــەوشیر هەڵیکوتــایە سەر پەلاماردەرەکانی و ئەو بیست کەسەی ڕاونا ، هاتەوە کن ئەسپەکەی ، ڕای کێشا و بە هاوارێکی ( یا حەی ) لە زەلکاو دەری هێنا ٠

کاتێ ئەسپ سمی دەگاتە سەر خاك دەحیلێنێ و چاومار خۆی داوێتە سەر خانەی زێن و هەڵدەکوتێتە سەر دوژمنانی ، هەر لایێ ڕوی تێدەکا دڕ دەدەن و خۆیانی لەبــەر ناگرن ، بەلام دوژمن هەتا دێ هــەر زیاد دەکا ، چاوماری کەساسیش ڕوت و پێخواس دەمێ بە سواریێ و جارێ بە پێیان شەڕ دەکا ، کە دەبینێ ئەسپەکەی لە پێنج شەش لاوە برینداره و دەلەرزێ ، دەستی لێ هەڵدەگرێ و بە قونەشەر خۆی داوێتە ناو چاکێك لە ڕۆخی دەریا کە ( بابە سۆران )ی پێدەلێن و لە دەلاقەی قسنەکەوە درێژە بە شەڕ دەدا ، تا یەکێك لە دورەوە گوللەیێك لە ناوچەوانی دەدا و شەهید دەکرێ ٠

کە دەزانن مردوە دێنە سەری ، سەری دەبڕن و بــۆ خانی هەکاریێ دەبەن ، خان دەلێ ئەوە مەردێکی قارەمان و ئازایە ، سەرەکەی دەنێرێتەوە لەگەل لەشەکەیدا لە تەنیشت بابە سۆران دەی نێژن و ئێستاکە گلکۆکەی جێ زیارەتی خەلکە ٠

مەلیك ئەحمەد پاشا کە ئەم بەسەرهــاتەی لەزمــانی ئەو کەسانە بیست کە لە شیری چاومار ڕزگاریان بوبو ، هات و زیارەتی کردە ئەمڕۆ بەسەرهاتی چاومار بۆتە چیرۆکی ناو خەلکی وان و شیروان ٠ خێرخوایەك گومبەزێکی لەسەر کردوە ٠ ئەو ڕەوەزەی چاومار خۆی لێ هەڵدایە دەریاوە مێژوەکەیان لەسەر هەلکەندراوە ٠

رەنگە هەندێ کەس بڵێن جا کابرایێك لە چیاوە خۆی هەڵدابێتە دەریا و کە هاتۆتە دەرێ کوژرابێ ، ئەم هەمۆ باسکردن و پێدا هەڵگوتنەی بۆچی‌یە ؟ لە وەڵامدا دەڵێم هەرچەندە پیاوێکی سەر بەدەرەوە نەبۆ ، بەڵام تەنیا لەبەر ئەوەی هاواڵی رێگام بوە و نان و نمەکمان پێکەوە خواردوە باسم نەکردوە ، بەڵکو لەبەرئەوەی خوا هەڵناگرێ پیاوێکی بەدین و دڵپاك و شافیعێ مەزەب بۆ کەڵەپیاوێك بۆ لە کوردەکانی ئیزۆلێ دەوروبەری مەلاتیە ، جوامێر و قارەمان و مەردانە بۆ • من کە لە ماوەی ئەم چل و دۆ ساڵەمدا هەزارانی ئازا و شەڕکەرم دیوە هێشتا پیاوی بەجەرگی وەکو (سەید ئەحمەد پاشا)و (کدغاج پاشا) و ئەم چاومارە مەرد و پاڵەوانم نەدیوە ! بەتایبەتێ ئەو شەڕەی لە (دەربەندی ناقورەی شام) کردۆیەتی لە مێژودا بێ‌وێنە بوە ، بۆیە هەقمە پێیدا هەڵبڵێم • رەحمەتی خوای لێ بێ •

بەرەو خۆرهەڵات دەڕۆیشتین کە میراخوڕی پاشا رەوەیێك ئەسپی بتلیسی‌یەکانی گرتبو ، پاشا ئەسپەکانی یەکە یەکە دایەوە بە خاوەنەکانی و ئەوەی بێ‌خاوەن بۆ دای بەوانەی لە شەڕدا ئەسپیان لەکیس‌چوە و هەندێکیشی دا بە ئاغاکانی وان ، لە سایەی خواوە ئەسپ و زینێکیش بەر من کەوت •

کە لە پاشام بیست دەڵێ « خۆت حازرکە ، دەتنێرم بۆ وڵاتی عەجەم » لە خۆشی ئەوەی جارێکی دیکەش ئەو وڵاتە دەبینمەوە جێم بە خۆم نەدەگرت ، یەك کیسە قرۆش بۆ خەرجێ رێگا و کورتەکێکی بەربەسمۆرە و دەستێك جلکی باش و پشتێنێك ڕەخت و خوڵامێکی ئێسك سۆکی دامێ و گوتی « ئەولیا ، کاتێ گەیشتیتە وڵاتی عەجەم ، ئەو دەزبڕانەی ( رەند )یان پێ‌دەڵێن لەوێ زۆرن ، شاعیری زمان درێژ و بێ دین و هەڵەوڕیان هەیە ، دەتئەزمۆنن و شتت لێ دەپرسن ، وریای خۆت بە و رێ و شوێنی موسلمانەتیت لە بەرچاو بێ ، هەمیشە بە تەنگ پێنج فەرزە نوێژی بە

جەماعەت بەو ناموسی خۆت بپارێزە ، ئاگاداری پیاوەکانت بـە و دابین‌یان بکە ، لە هێزەکانی خۆمان حەفتا هەشتا ساریجەی تفەنگهاوێژ لەگەڵ خۆت بەرە • » خەریکی ئەم جۆرە قسە و ئامۆژگاری‌یانە بوّ من قسەکەم پێ بڕێ و گوتم « پاشا ، تۆ دەفەرموّی ولاّتی عەجـەم وایـە و وایە ، پاشان دەتەوێ جۆوجانەوەری سەگوان و ساریجە لەگەڵ خۆم بەرم • من ئەمانەم لە خـاکی بێگانەدا چۆن پێ دابین دەکرێ ؟ بە سـەری مبارەکت قەسـەم پیاوی وا هەڵدەبژێرم کە پێم دابین بکرێن ، چەك‌هەڵگر و بـە ئەدەب و موسلمـان و بەناموس بن » پاشا گوتی « ئافەرین ، بە کەیفی خۆت بکە » ، هەشتا کەسی وریا و بەدینم لە سەگوانەکان هەڵبژارد و یەکە یەکە پیشانی پاشام دان ، زۆر کەیفی پێ‌یان هات و یەك کیسە قرۆشیشی بۆ خەرجی رێگا دانێ و پێ‌ی گوتن « با بزانم چۆن لەسەر دینی محەمەد دەکەنەوە و ئابڕوو و ناموسـی خۆتان دەپارێزن • لە قسەی ئەولیا دەرنەچن ، هەرکەسێك لـە فەرمـانەکانی ئەو لای دا منیش کەللەی دەپەڕێنم • دە بڕۆن خوا کارتـان راسـت بێنێ » • پاشان بە ( ساری عەلیاغا )ی گوت « تۆش دەچی بۆ لای ( شا عەباس ) لە (ئیسفەهان) ، خۆت ئامادە بکەو دوو ئالاّ چەکدار بێنە»، یەك کیسە قرۆشیشی دا بەو •

بۆ رۆژی دوایی ئاغاکەی مورتەزا پاشـاشی ئیزن دا بڕواتەوە ، بەو ئاغای سەرەك وەزیرە کە بـۆ مەڕ خڕکردنەوە هاتبوو گوتی « تـۆ فەرموو بگەڕێوە (ئەستەموڵ) ، ئیشەڵلاّ ئێمە خۆمان بۆتان خڕدەکەینەوە » ، پێنج کیسە و خولاّمێکی گورجی و ئەسـپێکی دایە و ناردی‌یەوە • ئەو بەگ و پیاوماقوڵانەی (پنیانش) کە بۆ شکاتی تالاّن کرانی مەڕ و مالاّتیان هاتبـوون پێ‌ی گوتن « ئێوەش خۆتان حازرکەن ، سبـەی لەگەڵ ( ئەولیـا چەلەبی ) بگەڕێنەوە » •

ساری عەلیاغاشی بانگ کرد نامەکانی سوڵتانی دایە و دوای راسپێری و

ئامۆژگاریێ بەرێی کرد ، پاشان منی بانگکرد و گوتی «ئەولیا لەسەر رێگا کە دەگەیتە فەرمانڕەواکانی عەجەم ، بە خۆشی و زمانی شـیرین لەگەڵیان بدوێ ، کە گەیشتیتە (گەنجالی خانی ورمێ) خۆتی لەگەڵ رێکخە و هەتا رۆژێك زۆتر ئەو چل هەزار سەر مەڕەی پنیانشیەکان وەربگریتەوە باشترە ، چونکو من بەم زوانە لە والییێ وان لادەبرێم و دەمبەنەوە بۆ (ئەستەمۆڵ) ، ئەم ئەسپە چاکە بە دیاریێ بەرە بۆ خانی ورمێ، تا دەتوانی تێوان خۆش کردن و سەنـدنەوەی مەڕەکانـت لـە بەرچـاو بێ ، خـانی دومبڵێ کە برادەرێکی مورتەزا پاشای خۆمانی گرتوە ئەسپ و نامەکەی بدەیە و ئەو برادەرەی لـە چنگ بێنە دەر و لەوێوە دەچیێ بۆ (بەغدا) ئەم شیرە جەوهەردارە و خەنجەرە دەبانە و تیردانە نقێمدارە دەبەی بۆ ( مورتەزا پاشا ) لەگەڵ نامەکان ، بەڵام لە بەغدا زۆر مەمێنەوە ، لە گەڕانەوەدا بە ( شارەزۆر ) و (قەڵای ئەحمەد ) و هەوارگەی (زەڵم)و (هەریر)و وڵاتی (ئەردەڵان) و بەناو هەکاریدا وەرەوە بۆ (وان) • ئەم زینە زێڕینە و ئەم ئەسپە رەسەنە و ئەم خەنجەرە دەبانەش بەرە بۆ (قرچیل قەتمەر خان) فەرمانڕەوای (تەورێز) و لە هەموان زیاتر رێز و خۆشەویستیێ بۆ دەرببڕە چونکو یەکە وەزیری وریا و کارزانی ئێرانە ، ئەو کاتەی من لە بەغدا بوم ئەو کرابو بە سوپاسالاری ئۆردوی ئێران بۆ سـەر (قەندەهار) ، پاشان کردیان بە خانی خانان ، ئێسـتاش لە سەرەك وەزیریێ لابراوە و وەکو من کراوە بە خانی خانانی (تەورێز) ، ئەو کاتەی ئێمە چوینە سەر بتلیس لە وڵاتی عەجەمدا قاد داکەوتبو گوایا نیازمان وایە بچینە سەر ئەوان ، ئەگەر پرسیاریان کرد ڕاستییەکەیان بۆ بگێڕەوە ، لـە مەڕەکانی ورمێ ئەگەر شتێکیان لێ مایەوە ئەویش لەگەڵ نامە و دیارییەکان بەرە بۆ خانی تەورێز و تا دەتوانیێ بە قسەی خۆش و زمانی شیرین دوستایەتی لەگەڵ بگرە •

زین و رەخت و بەرەی گەوهەر نیشانی خانی بتلیس و ئەسپە کەهێلە

تایبەتیەکەی و سێ سەر ئەسپی خۆشبەزی دیکە و کتێبێکی شانامە و یەکی هومایۆن نامەی دا بە (ساری عەلیاغا)کە بیبا بۆ شا ، بۆ دایکی شا ئەسپێکی رازاوە و پێنج جوت کەوای سورمە لە بوخچەدا ، بۆ وەزیری شاش نامە و ئەسپێك ، ئیدیَ دوعای خێری بۆ کردین و هەردوکمان مالآوایی‌مان لیَ کرد و هاتین •

# سێی مانگی زیلفەعیدەی ساڵی ١٠٦٥
# لە وانەوە بە باڵیوزیێ چوٚم بوٚ وڵاتی عەجەم

لەپێشەوە (ساریێ عەلیاغا)بە دوسەد چەکدارەوە بە راسپێراویێ بوٚ لای شای ئێران ، ئەمجا من بە سەد کەسی ئازا و موسڵمان و قەتارێك ئێسترەوە ، لە پاش من ئاغای مورتەزا پاشا عەلیاغا بە سەد کەسەوە لە وان هاتینەدەر ، ئەو پیاو ماقوڵانەی پنیانش کە دەگەڕانەوە سەد کەس دەبون و تێکڕا پێنسەد کەسێك بوین کەوتینەڕێ ، پاشا لە شوێنی تایبەتیێ ڕاوەستا ماڵاوایی لەگەڵ کردین •

لە وان دەرچوین روومان کردە خوٚرهەڵات ، باخـەکانی (ئەردەمیت) کەوتە لای راستمانەوە و بە سێ سەعات لـە لوتکەی ( زکوك ) ئاوابوین و گەیشتینە گوندی ( زکوك ) وچانمان گرت ، سێسەد ماڵێکە و کلیساییێکی لێیە ، باجی ئێرە دەدرێ بە میری وان و دەفتەردار وەریدەگرێ ، لێرەوە بە سێ سەعات بەرەو خوٚرهەڵات هاتینە کلیسای (ونك ورك) کە لە دامێنی چیای (ورك) دایە ، لەم ناوچەیەدا بە کلیسا دەڵێن (وەنك) • ئـەم کلیسایە کە لە خوارەوە تا لوتکەی چیای ورکی داگیرکردوە بە شەقامێکی ئەمبەرەوبەر دار و درەخت و بە گومبەزی گەورە و بچوك و بە دەروازەی ئاسنەوە بوٚتە قەڵاییێکی زوٚر قایم و هیچی لە کلیسا کوٚنەکان ناچیێ ،نزیکەی سێسەد قەشە و رەبەنی تێدایە کە هەریەکەی خەریکی کارێکن ، ئەو شەوە بەجوٚرێ ئـەم پێنسەد عەسکەرەمانیان میوانداری کرد کە باس ناکرێ ، بوٚ بەیانیش بوٚ من و هاواڵەکانم سەر و کەوڵێکی وشەکیان بەدیاری داینێ •

بۆ بەیانێ شەوەکی ڕێمان گرتەبەر و بە هەزار دەرد و کولەمەرگێ بەناو لێرەواری چیای ورکدا شۆڕبوینەوە بە پێنج سـەعات گەیشتینە گوندی (هیندستین) کە سـێسەد ماڵێکە و خاوەنی باخ و باخاتـە و باجەکەی بـە دەفتەری وان دەدرێ • لێرەشەوە بە پێنج سـەعات هاتینە چیمەنی ( قولێ چایەر) و لەوێوە چوینە (چایەری سلەمان بەگ) و ئنجا بۆ قەڵای خۆشاب•

**قەڵای خۆشـاب :**

لەبەر ئەوەی روباری خۆشـاب بە بن قەڵاکەدا دەڕوا ناوی قـەڵای خۆشابی لێ نراوە ، ناوە کۆنـەکەی (ئەرچەکی باڵا) بوە و لـە بنیـاتی هەکاری‌یەکانی سـەردەمی عەباسـی‌یە ، سـاڵی ۸۰۰ کەوتۆتە دەسـتی مەحموودی‌یەکان و ئێستاش پاتەختی بەگەکانی مەحموودی‌یە ، ساڵێ ۱۰۶۰ یەکێ لە خانەکان بە ناوی (سولەیمانی زەمان) ئەم قەڵایەی پەرە پێدا ، لای خۆرهەڵاتی کە بەسەر گۆڕاییەکدا دەڕوانێ قەڵایێکی قایمی سولەیمانی لێ دروست کرد و بەردی بە قەدەر فیلێك تێـدا کار کرد ، ئەو بەردانـە درێژایی‌یان بیسـت پێ‌یـە و بە باری درێژێ خراونەتـە نـاو دیوارەوە و سوچەکانیان هاتۆتە دەرێ تا باشتر خۆی لەبەر گوللەتۆپەکان بگرێ ، جوت دیوارە و سەرەکانیان داپۆشراوە ، واتا چەندی تۆپ لێ بدرێ کاری لێ ناکا، ساڵی ۱۰۶۰ کە محەمەدەمین کوڕی شەمسێ پاشا گەمارۆی دا بیست و نۆ رۆژ بە تۆپ کوتای‌و نەیتوانی بەردێکی لێ بلەقێنێ‌و بـە هەناسە ساردێ گەڕایەوە ، لە وڵاتی عوسمانیدا باوە کە دەروازەی قەڵاکان لە دار دەکەن و بەرگێکی ئاسنی تێ هەڵدەکێشن ، ئەم دەروازانە لە کاتی شەڕدا کە ئاگریان لەژێردا کرایەوە ، دارەکەی دەسـوتێ و ئاسـنەکەی هەڵدەوەرێ ، بەڵام دەروازەی ئەم قەڵای خۆشابە هەر تاکەی لە سێسەد قەنتار پۆڵای نەخچەوانێ دارێژراوە و داری تێدا نیە ، دەروازەکەی خراوەتە نێوانی دوو قوللە و وایان شاردۆتەوە کە بە چاو نابیندرێ •

قەڵاکە زۆر بچکۆلەیە و تــەنیا فەرمانڕەوا ( برایم بەگی مەحمودی )
تێدا دادەنیشێ ، هەر چواردەوری هەزار و دوسەد شەقاوە ، لە گۆشەیێکدا
گەرماوێکی بچوك بۆ بەگ ، عەمباری دەخڵ و دان ، ژێرزەمین ، جبەخانە و
دە دانە تۆپی شاهانەی لێیە ، عەمباراوێکی هەیــە ئــاوی بارانــی تێــدا
هەڵدەگیرێ ، یەکێك لە بەردی رەوەزەکان بە چەشنــی قورتمی فیــل بۆ
دەرەوە ڕاکشاوە ، سڵەمان بەگی بنیاتنەری ئەم قەڵایە چەرخی ئاسنی بــۆ
دروست کردوە و لەم قورتمەوە بە زنجیرێکی سەد جوتە باڵی وای کردوە ئاو
لە روباری خوارەوە هەڵدەکێشێتە سەرێ بۆ ناو قەڵا ، هەمو رۆژێ خەڵــك
لە وارشی خوارەوە دێنە ســەیری ئەم کارە سەرســوڕێنەرە ، برایم بەگی
فەرمانڕەوا کە لە شەڕی بتلیسدا پێکەوە بوین قەڵاکەی بە چاکی پیشــانی
من و هاوڕێکانم دا ، هەر چوار لای ئەم قەڵایــە دەڵــێی دۆڵ و دەرەی
هاروتە ، هیچ لایێکی خەرەندی نیە ، تەنیا لای ژوروی دەروازەیێکی هەیە،
لای ناوەوەی دەروازە خەندەکێکی هێجگار قوڵی پڕ لە ئاوە •

**وارشی خوارەوە :**

لەم ناوە بە وارش دەڵێن رەبات ، جا ئەم رەباتە لە دۆڵێکدایە هەر چوار
لای حەواڵەی بەسەرەوەیە ، لای خۆراوای روباری خۆشابە ، چل قوللەی
هەیە و دیوارەکانی نزمن ، دو دەروازەی بێ خەرەندی هەیە ، ئەم قەڵایــە
نزیکەی چوار هەزار شەقاوێك دەبێ ، لە ناوەوە هەشسەد ماڵ و مزگەوتێك و
خانێك و گەرماوێکی پیس و چەند پارچە دوکانۆکەی هەیە و هیچیدی •

**کوردەکانی مەحمودی :**

ساڵی ٩٥٥ ئەم کوردانە سەریان بۆ سوڵتان سولەیمان دانەواند و لــە
شەڕەکانی (تەورێز) و (نەخچەوان) و (روان)دا خزمەتێکی باشیان نواند ،
لەبەرئەوە ولاتەکەی خۆیان درایەوە بە خۆیــان کە بە نــاوی نیشتمــانی و

خانەدانی‌یەوە فەرمانڕەوایی تێدا دەکەن ، ئێستا لە ئەیالەتی واندا بەگی خاوەن تەپڵ و ئاڵای خانەدانین ، لەسەر بناخەی قانونی سولەیمانی زەعامەت و تیماری خۆیانیان هەیە و داهاتەکانیان بۆ بەگە ، بەهۆی نزیکی‌یەوە لەگەڵ والی وان دەچن بۆ شەڕ ، لە ئەستەمۆڵەوە قازی‌یێکی سەر و پەنجا ئاقچەیی بۆ دادەندرێ ، هەشت هەزار عەسکەری هەیە و چەند جارێك بەرەنگاری شای عەجەم بون ، شەڕکەرەکانیان چەندێ بلێی ئازا و بە جەرگن ، هەمویان ردێن دێڵنەوە و ئەم ردێنانە رەنگی ئاڵ و شین و زەرد و سوری لێ‌دەدەن ، زۆر موسڵمان و بە دینن و لە تیرەی شافعین . لە ناویاندا ئەگەر یەکێك درۆی لەسەر ساخ بکرێتەوە پێی‌دەڵێن « تۆ درۆزنی » و شاربەدەری دەکەن ، تەنانەت ماڵ و منداڵیشی دوردەخەنەوە .

**رۆبـاری خۆشـاب :**

ئاوە رون و خۆشەکانی چیای هەکاری و هەوارگەکانی حوسنی کۆدەبنەوە و لەژێر ئەم قەڵایەدا ناوی (خۆشاب)ی لێ دەنرێ و دەڕوا بەرەو خوار ، لە دەشتی وان بەناو باخەکانی ئەردەمیتدا تێدەپەڕێ و لە بن قەڵای ( وەستان )ی هەکاریدا دەڕژێتە دەریای وانەوە .

شەوێك لەم قەڵایە ماینەوە خان گەلێك دیاری داینێ ، بەیانی دەرچوین بە پێنج سەعات گەیشتینە گوندی ( دو ئاوان ) کە سەد ماڵێکە و لەژێر دەسەڵاتی مەحمودی‌یەکاندایە ، خەڵکەکەی کوردن و مزگەوتیان هەیە ، لەناو چیمەنێکدا خێوەتمان هەڵدا و دانیشتوانی گوندەکە بەرخ و کارژۆلە و ماست و پەنیرێکی زۆریان بۆ عەسکەرەکانمان هێنا .

جۆرە چێشتێکیان بۆ هێناین بە ماست و گژوگیا لێ‌نرابو پێیان دەگوت ( پۆخن )[30] ! هەمومان لەو پۆخنەمان خوارد و زۆریشمان پێ خۆش بو ،

(٣٠) بە زمانی تورکی بە پیسایی دەڵێن (پۆخ) ، وا دیارە ئەو پۆخەی ئەولیا چەلەبی لە خۆشاب خواردویەتی و زوریشی پێ خۆش بوە (دۆکولیو)ە .

گوایا ئەم پۆخنە لەم ناوچەیەدا لە خواردنــە باشەکانیانــە و بــۆ میــوانی خۆشەویستیانی لێدەنێن • بەڵام هەندێ لە کوردە ناقۆڵاکان تاوە ناتاوێ دەهاتن لێیان دەپرسین « ئەرێ پۆخن ناخۆن ؟! » هێ‌وامان تێدابوَ بە شەرمدا دەکەوت و لە ترسی ناوە خراپەکەی نەی‌دەخوارد ، بەڵام بەراستێ شتێکی خۆش بوَ • لێرەوە بە شەش سەعات گەیشتینە قەڵای ئارەجك •

**قەڵای ئــارەجك :**

قەڵاییێکی چوارگۆشەیە لەسەر گردێــك ، بــەڵام لوتــکەی ژورژوی چیــاکەی ئەوەنــدە بــەرز بــوَ نەچــوَم تەماشــای بــکەم ، بەدەســت مەحموَدی‌یەکانەوەیە ، لە زەمانی کۆندا ئێرە میرنشیــنی مەحموَدیَ بــوە ، ئێستا زۆر ئاوەدان نی‌یە ، سەر بە ئەیالەتی وانە و بەگی سنجــاقی هەیــە ، خاوەنی دوَهەزار عەسکەرە ، ئەسپە هەرە رەسەنەکانی مەحموَدی‌یان لێرەوە دێ ، داهاتی بۆ بەگەکەیەتی ، بەگ خۆی لە قەڵا دادەنیشێ و لە قوژبنێکی وارشی خوارەوە پێنسەد ماڵێکی خاوەن باخ و باخچەی خــۆشی لێیــە • مزگەوتێك و خانێك و گەرماوێکی چلکن و چەند دوَکانێکی هەیە •

**دەریــاچەی ئارەجك :**

ئەم قەڵایە خلیجێکی بچکۆلانەی هەیە ، ماسی ئالای ئێرە لە کوردستاندا بەناوبانگە و یەکی دە هۆقە دەبێ ، راوکەر دەیانگرن و بە دیاریَ بۆ ئەملاو ئەولایان دەنێرن ، هیچ بۆنی ماسی لێ نایێ ( سوڵتان مرادی چوارەم ) کە روانی داگیرکرد بۆ خواردنی ئەم ماسی‌یە لێرە وچانی گرتــبوَ ، ئێمــەش میوانی بەگی (ئارەجك) بوین ، نانیمان خوارد و دیاری‌مان لێ وەرگرت و پاشان بەرەو باکور بەناو دۆڵ و چیادا بە هەشت سەعات گەیشتینە قــەڵای ئابــاغای •

**قەڵای ئاباغـــای :**

ناوەکەی وشەی شێواوی (ئاباقایی)یە کە بە تورکمانی (قایی) بە شـــا دەڵێن ، گوایا لە میسردا هێشتا ناوی قایتیبای و ئەم جۆرانە هەیە ، لەلای خۆراواوە رێگاییێکی قەدبڕی هەیە بە دە سەعات دەگاتە وان ، ئەم قەڵایـــە پێنج گۆشەیە و لەسەر دوندی ماهێك زۆر بە قایمی دروستکراوە و ئێستا بە دەست مەحمودیەکانەوەیە ۰ لێرە رێ کەوتین بەرەو خۆرهەڵات بە حەوت سەعات هاتینە قەرە حەساری وان ۰

**قەرە حەســـاری وان :**

کوردەکان بەم قەڵایە دەڵێن (قەڵای قەرەجە) ، زوربەی دیوارەکانـــی بە بەردی رەش لە لایەن (غیاسەدینی عەباسی) دروستکراوە ئاواییێـــکی کۆنە ، لە خاکی عوسمانیدا ئەمە شەشـــەمین قەرە حەســـاری کوردانـــە ، ئەوانی دی ( قەرە حەساری ئەفیون ) ، ( قەرە حەساری شـــبیین ) ، ( قەرە حەساری وشتردار) ، (قەرە حەساری ئەنتالیا) و (قەرە حەساری ساحیب) ۰ ئەمەشیان لەوان کەمتر نیە ، حەسارێکە لەسەر ترۆپکی کێوێکی سەر لـــە ئاسماندا قوت کراوەتەوە بەڵام بچوکە ، لەبەر ئەوەی هەر چوار لای گەلی زۆرقوڵی وەك چاڵاوی دۆزەخە ، ناتوانم بڵێم چەند شەقاو قوڵە ۰ قەڵاکـــە چوارگۆشەیێکی لاکێشییە و ئێســـتا بە دەست مەحمودیەکانەوەیە و هی هاوناوی خۆم ئەولیا بەگی مەحمودییە ۰ ئەم ئەولیا بەگە میرێکی بەڕێزی خاوەن تەپڵ و ئاڵایە و هەمو میرەکانی کوردستان چاکەی ئەمیان لە چاودایە، چوار هەزار عەسکەری ئازا و شەڕکەری هەیە ۰

ئەولیا بەگ بانگهێشنێکی گەورەی بۆ کردین و خۆشترین خواردنی بۆ ساز کردبوین ، پاش نانخواردن ئەنگوستیلەکەی دەســـتم کە بە خەتی (فەرید) شیعرێك لەسەر نقێمە زمڕوتەکەی هەڵکەندرابو ، ئەولیا بەگ داوای

لێ کردم پیشانی بدەم منیشن دامە دەستی خوێندیەوە نوسرابو بەفـارسیّ :

**لە سـەرۆکی گشت خێلی ئەنبیا**
**هیوای بەخشـینی هەیە ئـەولیا**

میر بە چاوپێکەوتنی ئەم مۆرە وەك شێتی لێ هات ، گوتی « ئەولیا گیان ، ئەم مۆرەم دەدەیەی ؟ » گوتم « میرم ئەمە بـۆ من پیرۆزە و بۆ خەلکیدی نەگبەتە » گوتی « نا ئەولیا ، وشەی ئەولیا و ئەنبیا قەت نەگبەت نابن ، من و تۆ ئەولیای بێخەوشین و من ئەم مۆرەم پێوە دێ » ئیدی هیچ چارم نەما ، گوتم « پیرۆزت بێ میرم » • دەتگوت دنیایان داوەتێ ، بانگی کرد « کورە پێنسەدسەر مەڕ بدەن بە کاکە ئەولیای خـۆم » هەروەها کورتەکێکی بەر بە سمۆرە و شیرێکی شێخانێ و ئەسپێکی مەحمودیشی دامـێ • سـەر و ئەسپیشی بۆ ئاغای مورتەزا پاشا و ئاغای پاشای خۆمـان خـەڵات کرد و ماڵاوایی‌مان لێ کرد •

پاش پێنج سەعات بەرەو ژوروی رۆژهەڵات هاتینە گوندی ( پاسـك ئـاغا )ی ئەولیا بەگ کە سەد ماڵێکە ، مزگەوتێك و هەندێ باخی جوانی هەیە ، دیسان سێ سەعاتی دێ ڕوەو خۆرهەڵات بەناو بەردەلانێکی سەختا هاتین گەیشتینە گوندی (مەلاحین) کە لەناو دۆلێکدایە کێوەکانی ئەملاولای سەریان لە ئاسمانە ، هەزار ماڵی بە باخ و باخچەی کوردەکانە و هەموێان شافیعین و ئازا و شەڕکەرن ، لەسەر کانێ ئەم گوندە باخچەیێکی زۆر خۆشی ئەولیا بەگی لێیە • کوێخای گوند لەناو ئەم باخچەیەدا نان و خوانێکی باشی بۆ رێکخستین • لێرەش دیاریێ‌مان وەرگرت و پێنسەد سەر مەڕەکانم ناردە وان بۆم بفرۆشن • لێرەوە بە سێ سەعات گەیشتینە قەلای پنیانش •

**قـەلای پنیـانش :**

ئەم قەلایە لەسەر چیایێکی قوچ هەلچنـراوە کە لە کاری ئـادەمزاد ناچێ و شـیاوی بینینە ، بە کاری خـوا بەردەکانی بـە جۆرێك توێتوێ

هەڵکەوتون کە هەر دەڵێی بە دەسکرد بورج لەسەر بورج و ژۆر لەسەر ژۆر دروستکراوە • لە ناوەوە نزیکەی سەد ئەشکەوتی تێدایە ، دە ماڵێك و عەماراوی هەیە ، ناو ئەشکەوتەکانی پڕە لە ئازوقە ، قەڵاکەی حەوالەی بە سەرەوەیە بەڵام زیانی پێ ناگەیێنێ • ساڵی ۱۰۲٤ رۆستەم خانە کەچەڵ هەشت مانگی تەواو ئێرەی گەمارۆ دا و بە تۆپ کوتایەوە هیچی بۆ نەکرا ، ناچار بە هەناسە ساردێ گەڕایەوە •

دەروازەیێکی لای خوارەوە هەیە کە دەبێ بە پەیژە بۆی سەرکەون و هەرکاتێ پەیژەکەیان بە گوریس هەڵکێشایەوە سەرێ ئیدی لە هیچ لایێکەوە ڕێی سەرکەوتنی نیە • لە ناوەوە مزگەوت و عەمباراوی هەیە • کێوەکانی دەور و پشتی پڵنگ و وشەك و بەرانە کێوێ زۆرە ، راوکەرە کوردەکان لەسەر کێوەکان چاڵ هەڵدەکەنن و سەری دادەپۆشن ، زۆر جار دڕندەکان دەکەونە ناو ئەو چاڵانەوە ، جا پڵنگ و وشەکەکانی ناو چاڵەکان دەکوژن و کەوڵیان دەکەن • ئێرە پڵنگی وای لێ هەڵدەکەوێ بە قەدەر ئێسترێك • لە دۆڵی ( بزدۆك )ی خوار قەڵاوە شەشسەد ماڵە کوردی لێیە بەڵام وارشی لە دەورە نیە و تەنیا خەرەندی هەیە . قەراخ رۆباری ئەم بزدۆکە بە هەزاران سورە جناری گەورە و ئەستوری لێیە •

**شتێکی سەیر :**

بەراستێ من لە چاونەترساوێ منداڵی ئێرە سەرم سوڕ ماوە• ئەو کاتەی بەهاران دار ئاوی تێدەزێ و بەرەو ژیانەوە و شینبون دەچێ ، منداڵەکان کۆدەبنەوە ، هەر دار چنارەی حەفتا هەشتا بگرە سەد منداڵی پێدا هەڵدەرۆسکێن و یەك لەسەر یەك هەتا لوتکە سەری دارەکە دەچن ، واتا ئەو شوێنەی لە هەموێ باریکترە ، دارەکە ئەم کۆڵە قورسەی بۆ هەڵناگیرێ و ئەوەندە شۆڕ دەبێتەوە تا دەگاتە نزیکی زەوێ ، ئەوسا هەندێك لە منداڵان

خۆیان هەڵدەدەن ، باری دارەکە سوك دەبێ بەڵام هێشتا چل پەنجا منداڵی پێوە دەمێنێ ، لەپڕ دە منداڵ بە جارێك خۆیان هەڵدەدەن و دارەکە سـوك دەبێ و وا بە تەوژم راست دەبێتەوە کە لەولاوە دەگاتەوە زەوێ • ئیـدێ ئەو دارە کەساسانە بە دەست ئەو منـداڵانەوە پەرێشـانن و هـەر دەبـێ بەملاولادا خوار بنەوە • سەیر لەوەدایە کە چناری هیچ شوێنێك وەکو ئێرە شلك نیە بەرگەی ئەم هەمو نوشتانەوە و هەستانەوەیە بگرێت و نەشکێ • هەمو رۆژێ کە منداڵ لە قوتابخانەکانیان ئیزن دەبن دێنە ژێر ئەم دارانـە یارێ دەکەن •

ئەم شارە مزگەوتێکی بچوك و مزگەوتێکی جومعە و خانێکی هەیـە ، گەرماو و بازاڕی نیە ، مەڕێکی یەکجار زۆریان لە کوێستانەکانە • گوایـا لەسەر پیلانی ئیبشیر پاشای والیێ حەلەب عەجەمەکان چل هەزار سەر مەڕی ئێرەیان فڕاندوە ، ئێمەش وا دەچین هەوڵی سەندنەوەی ئەو مەڕانە دەدەین• خەڵکی ئاوایێ لەژێر ئەو چنارانەدا جێگایان بۆ راخسـتین و زۆریان قەدر گرتین • ئاو و هەوای ئێرە زۆر پاك و خۆشە •

**خەڵـکی پنیانش :**

پنیانشیەکان ساڵی ٩٥٥ سەریان بۆ سولەیمانخان دانەواند ، بۆیـە داهاتی وڵاتەکەیان درایەوە بە بەگەکەیان • شەش هەزار عەسکەری هەیە ، ئێرەش بە مەحموودێ دەژمێردرێ ، نازناوی رەسمیـیان (میرەکانی پنیانش)ە خەڵکی ئێرە ئەقڵیان لە چاویاندایە ، ئەوەندە راست و دڵپاکن هەمیشە شیر بە قەدەوە و خەنجەر لە بەرپشتا دەڵێی ئاگری قودرەتن ، خۆیان ئەوەندە لە کن گەورەیە قەت فێڵ و درۆ ناکەن • ئەو سەد کەسەی لە وانەوە لەگەڵمان هاتبون لێرە بەجێ مان ، من دە کەسم لێ هەڵبژاردن و لەگەڵ خۆمدا بردمن بۆ وڵاتی عەجەم •

لێرەوە بەرەو خۆرهەڵات ڕۆیشــتین لە ( ڕوباجك ) وچانمان گرت ، ( سوڵتان مرادی چوارەم ) کە لە شەڕی ( ڕەوان ) گەڕاوەتەوە لێرە خێوەتی هەڵداوە و جێ خێوەتەکەی کراوە بە سەکۆ • ئێرە سەر سنوری پنیانشە و بە خاکی عوسمانیّ دەژمێردرێ • ئاوێکی هەیە لە ئاوەکەی قودسی شەریف خۆشترە ، هەر کەس چل ڕۆژ لەسەر یەك لێی بخواتەوە ئــازا و بەجــەرگ دەبێ و هەر لەبەر ئەوەشە هۆزی مەحمودیّ ئەوەندە ئــازان • بەداخــەوە ڕێگا و بانی ئێرە هەتا بڵێی سەخت و بەردەڵان و لێڕەوارە ، چیاکان مەڕ و بزنە کێویّ زۆرە ، پڵنگ و وێز و کەمتیاریشی هەیــە • گونــدەکەی زۆر ئاوەدان نییە سێسەدماڵێکە هەمویان کوردن ، لە هەفتەدا ڕۆژێك خەڵکی ئەو ناوچەیە لێرە کۆدەبنەوە و دەیکەنە بازاڕ ، هەرکەس شتێکی هەبێ بــۆ فرۆشتن دەیهێنێتە ئێرە • کە ڕێ کەوتین بە شــەش سەعات هاتینە قــەڵای قوتــور •

**قەڵای قوتــور :**

بە زمانی موغوڵیّ بە پیاوی لاسار و کەڵلەڕەق دەڵێن «قوتور» ، لەپاش چەنگیزخان نەوەکانی موسڵمان بون ، یەکێك لەوانە ( مەحمود شای غازان ) وەزیرێکی کەڵلەڕەقی بوە قوتور ناو ، شا فەرمانی دەداتێ کە لەناو ئەم چیا و بەردەڵانەدا قەڵایێك دروست بکا ، ئەویش لە ساڵی ٦٩٤دا ئــەم قەڵایەی کردوە و ناوی قوتوری بەسەرا بڕاوە • قەڵایێکی دیکەی ئاوا سەختیش لە سنجاقی (هەرسك) هەیە ئێستا بەدەست (واندیك)ەکانەوەیە • ئەم قوتورەش بەدەست عەجەمەوەیە •

ساڵی ٩٩٢ کە (فەرهاد پاشا) ئێرەی گرت کەوتە دەست عوســمانیّ ، پاشان لە ٩٩٦دا کە (کوڕی جەغالە) لە شەڕی ســەراودا شــکا و بــار و جبەخانەی بەجێهێشت ، عەجەم هەلیان دەستکەوت ئەم قەڵایەیان گرتەوە و

زۆر لە جاران باشتریان کرد • سالی ١٠٤٥ سولتان مرادی چوارەم پاش گرتنی (روان) لەم دۆلە دابەزیبو ، لەم قەلایەرا ئەوەندەیان تۆپ تێ گرتن کەس نەیدەوێرا سەر دەرێنێ ، مراد خان دەپرسێ «ئەم دەنگی تۆپانە چین؟» پێی دەلێن ئەم قەلایە هێ خۆمان بو کەوتە دەست عەجەم و ئێستا لەوێوە تۆپمان تێ دەگرن • مراد خان سواری ئەسپە تایبەتی یەکەی خۆی ( تۆغای ئیلی ) دەبێت و لە شوێنێکی بەرزەوە تەماشای قەلا دەکات و دەلێ « دەك بەلام لێدا هەی ، قەلاییکی چەند سەخت و دژوارە • ئێستا زستانمان لەپێشە، گەمارۆی بدەین خەریکمان دەکا ، با جارێ لێی گەرێین » •

سالی ١٠٤٨ کە بەغدای گرت ، لە کاتی مۆرکرانی ئاشتی نامەدا بە (قەرە مستەفا پاشا) دەلێ «مستەفا ، لەم ئاشتی یەدا با عەجەم قەلای (مەکۆ)ی نزیك روان تێکدەن و قەلای قوتوری لای وانیش برۆخێنن » • بەلام وا نەکرا ، تەنیا سەربازەکانی ناوی هاتنەدەر و قەلایان بەجێهێشت • وا رێ کەوت لەپاش گیرانی بەغدا سۆلتان مراد مرد و ئیبراهیم خان لەجێی دانیشت ، عەجەم لە پەیمانەکەیان پاشگەز بونەوە ، قەلاکانی مەکۆ و قوتوریان ئاوەدان کردەوە و ئەوەندەی دی قایمیان کردن • ئێستا ئەم قوتورە هاوسنوری پنیانشی سەر بە ئەیالەتی وانە ، جاران پاتەختی سنجاقی قوتور بوە • هەرچەندە قەلاکەی بەدەست عەجەمەوەیە ، بەلام ناوچەکە خاکی عوسمانی یە • قوتور خۆی بەگی هەیە و ئەو بەگە لە شەرِی بتلیسدا بەشدار بو •

**قەلای قوتور چۆن هەلکەوتوە :**

لە کۆتایی لای باشوری دۆلێکدا لەسەر چیاییکی قوچی سەر لە ئاسمان قەلاییکی مەحکەمی چوار گۆشەی لاکێشی یە ، بە شەقاو نازانم چەندە بەلام بچوکە ، ئیرە دوا سنوری خاکی عەجەمە ، سێ هەزار تفەنگچی هەلبژاردەی

مازەندەرانی تێدایە • ئەو شەوەی ئێمە گەیشتین و لە باخچەکانی خوارەوە میوان بوین هەمو بورج و دیوارەکانی قەڵایان بە مەشخەڵ چراخان کردبو و پاسەوانەکانیان هەتا خوا رۆژی کردەوە دەنگی « خودا خوب »یان هات • پیاو راست بڵێ هەروەکو قەڵا دروستکردن قابیلی فەڕەنگەکانە ، قەڵا راگرتنیش هەر لە عەجەم دەوەشێتەوە • سەر پاسەوانی قەڵا و ئەوانەی لەسەر چۆك دادەنیشن لە قەڵا هاتنە خوار و لەگەڵمانا دانیشتن ، زۆریان قەدر گرتین و میوانداری‌یان کردین • بەیانی زو هەندێ پیاویان لەگەڵ ناردین هاتینە ئەو شوێنەی پێی‌دەڵێن (محەمەد دەرە) ، ئێرە گردۆلکەیێکە دەبێتە سەرەتای خاکی عەجەم •

لە مانگی زیلقەعیدەی ساڵی ١٠٦٥دا سنوری شامان شکاند و پێمان خستە سەر خاکی عەجەم و بە چوار سەعات گەیشتینە قەڵای (ئالباق) •

# بنەتـا

لێرەدا باسی کوردستانی ئەولیـا چەلـەبێ لـە بـەرگی چـوارەمی سەیاحەتنامەکەیدا کۆتایی دێ • ئەو بەپێی فەرمانێك کە پێی دراوە دەچێتە ورمێ و تەورێز و قـەزوێن و هەمەدان و کرماشـان و بـەغدا و بەرگی چوارەمەکەی دەبڕێنێتەوە •

شێوەی نوسینی ئەولیا چەلەبیش لەم دوا بەشەدا گۆڕانێکی ئاشکرای بەسەردا دێ، وەکو جاران بە وردی لە دەر و ناوەوەی شارەکان ناکۆڵێتەوە و وشەی کورد و کوردستان بەکارناهێنێ و ئەو تام و بۆنەی پێشتوی نامێنێ • ئەوەی زیاتر سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ ئەوەیە کە شـارەکانی ئێـرانی بە ریزە و یەك لەدوای یەك و رێکوپێك تۆمار نەکردوە ، جـۆرە ئاڵـۆزی و شلەژانێك لە زنجیرەی نوسینەکەیدا بەرچاو دەکەوێ و وا لە خوێنەر دەکـا بیری بۆ ئەوە بچێ کە ڕەنگە ئەولیا چەلەبێ بۆ هەر شارێك چوبێ بـاسی ئەو شارەی لای خۆی لە لاپەڕەیێکدا نوسیبێ و پاشان لە کۆکردنـەوە و لێکدانی ئەو لاپەڕانەدا پاش و پێش و سەر و بنی تێکەوتبێ ، یا بلێین بـە هەندێ لەو شارانە نەچوە و تەنیا پشتی بە پرسیار و بیستن بەستوە ! •• دەنا ناچێتە ئەقڵەوە ئەو چوبێتە (هەمەدان) و (کرماشان) و (دزفول) ، پاشان هاتبێتەوە (قەزوێن) و (سنە) و (قوم) و (کاشان) و (ساوە) و لەوێڕا بۆ شاری (رەی) و (دەماوەند) و ئەمجا لە قەڵای (درنە)وە بۆ (بەغدا) •

لەگەڵ ئەوەشدا چونکو زۆر پەیوەندی بە مەبەستەکەی ئێمەوە نیە ، لەپاش ئاوابوونی لە سنووری رۆم و عەجەم کۆتایی بەو بەشە هات کە لەسەر کوردستان دەدوا ، ئیمەش پێش ئەوەی بەرگی چوارەمی سەیاحەتنامە تەواو بێ کۆتاییمان پێ هێنـا .

# پێڕستی ناو و شوێنەکان

«ء»

« ب »

(( پ ))

(( ت ))

« ج »

« چ »

« ح »

« خ »

« د »

(( ر ))

« ز »

« س »

(( ش ))

« ع »

(( ك ))

« و »

★ ★ ★

# فەرهەنگۆك

## بۆ هەندێ لە وشە کوردی‌یەکان

ئ

**ئەتلەس** : جۆرە قوماشێکی ئاوریشمین بۆ کەوای ژن و پیاو.
**ئاغای‌باج** : کارگێڕی باج و سەرانەسەندن .
**ئەستێڵ ( ئەستێر )** : ئەو گۆلەی لە بەردەمی کوێرەکانی و ئاوی کەمدا هەڵی دەبەستن هەتا پڕ دەبێ ، جا بەری دەدەن و ئاودێری پێدەکەن .

ب ، پ

**بقرنجێ** : درزی تێ بێ ، قرنجان درزبردن .
**بەگسەم** : جۆرە کولێرەیێکی کە زۆر دەمێنێ و بۆ هەڵگرتن دەست دەدا .
**بیشك : ( بێلەکانە )** : داردەستێکە ئاسنێکی وەکو دەمەپاچ لە سەرەکەی گیراوە بۆ هەڵکەندنی کەنگر و گیای دەشتێ .
**پاپوچ** : سۆڵ ، پێڵاوی مندالان ، یا هەر چەشنە کەوشێك بە ئاسانێ لە پێ بکرێ .
**بەلەچەك** : لە هاوینا باینجان و کاڵەك و کوولەکە قاش بکرێ و لەبەر هەتاو ، وشك بکرێتەوە تا زستان بکرێ بە چێشت .
**بژوین** : لەوەڕگەی چیمەن و ئاودار و سازگار .
**بەرقلیان** : ( قاوەلتێ ) سوکە ژەمی خواردنی کاتی چێشتەنگاو .
**پالـوده** : جۆرە هەرشتەیێکە لە نیشاستە دروست دەکرێ و دەخرێتە ناو شەکراوی ساردەوە ، خواردنی هاوینانە .

ت

**تەوەرزین** : تەورێکی دەسك ئاسنە ، جاران چەکی شەڕ بو پاشان بو بە داردەستی دەروێشی سوالکەر .
**تەڵەزم** : پارچەی باریك و درێژ کە لە کاتی دارشکاندنا لێی هەڵدەبەزێتەوە .
**تونج** : مەعدەنی خەوجۆش کە لە ئاسن و پۆڵا رەقترە .
**تۆخماخ** : گۆپاڵ ، کوتەکی سەرخڕ.
**تەپڵخانە** : دەستەی تەپڵ کوتان کە

له جیاتی دەستەی موسیقای سوپای ئێستا بوە .

## ج ، چ

**چۆقه ( چۆغه ) :** جۆره قوماشێکی ئەستوری خوری .
**چەمبەرباز :** تەنافباز ، ئاکرۆبات .
**حەمری :** قەیسی .
**خار :** زەوی ساخ و دەسکاری نەکراو ، ئەو خاکەی پێشتر هەڵنەکەنرابێ .
**خەیارچەمبەر :** بەری دارێکی هیندی‌یە ناوکەکەی لە ئاودا دەخوسێنن دەبێتە خۆشاوێکی مزر و خۆش .
**خیابان :** جاده .

## د

**دەغەز :** نەخۆشی ناوزگ کە درێژەی کیشابێ و چار نەکرێ .
**دارۆخه :** پارێزگاری هێمنایەتی‌ی ناو شار ، گەورەی پۆلیس .
**دەستەك :** داری بن‌میچی خانو لە کاریته بچوکتر .

## ز

**زەنبوری :** تۆری تەنك .
**زاکون :** عەزم و ئیراده .

## س

**سەگوان :** ئەو کەسانە بون کە خزمەتی سەگ و تاژی راوی‌یان دەکرد ، پاشتر بو بە ناوی ئەو چەك هەڵگرانەی بە پارە بۆ چەند مانگێك میری دەیگرتن و شەڕی پێدەکردن ، جاش .
**ساریجه :** زەردەواڵە . ئەمانەش جۆره چەك‌هەڵگرێك بون میری بۆ شەڕی ناوخۆ بە کرێ‌ی دەگرتن .
**سێبوەڕه :** گیاییێکی سێ پەلکەی سەوز و جوانە لە زەوی بەرز نابێتەوە ئاژەڵی پێ قەڵەو دەبێ.
**سەبیل :** ئامێری دوکەڵ‌کێشانە لە قوڕی برژاو یا دار دروست دەکرێ .
**سەرسم :** هەڵەنگوتن و رەت‌بردنی ولاخ لە کاتی رۆیشتن یا غاردانا .
**سنجاو :** گیانلەبەرێکی ناو دارستانە لە پشیله بچوکتره و کەوڵەکەی بەنرخه .

## ش

**شابەندەر:** گەورەی بازرگانانی شار ، بەتایبەتی شارەکانی قەراخ دەریا و زێ‌یە گەورەکان .
**شیداق (شیرداخ) :** جۆره قوماشێکی لۆکەی هەرزان بایی بو ، پیاوان کەوایان لێ دەکرد .
**شەمەد :** پارچەیێکی ناسك و تەنکی خوری،هاوینان بۆ نوستن بەخۆدا دەدرێ .

## ق

**قسن :** ئەو چاك و پیرانەی دیوار بۆ گۆڕەکەیان کراوه .

**قۆخ :** خۆخ .
**قەوخا :** ئاوەدان و قەڵەبالغ .
**قوژبن :** گۆشە ، قولینچك .
**قەرەبروت :** سوتاوی هەڵقرچاو و رەش‌داگەڕاو .
**قاقوم :** گیانلەبەرێکی لێرەوارە ، لە دەستەی سمۆرە و سنجاوە .
**قوشقون :** ئەو پارچەیەی زینی سواری کە لە دواوە دەخرێتە ژێر کلکی وڵاخ .
**قورتم :** ( خورتوم ) : لوزی درێژی هەندێ لە گیانلەبەران .

### ك ، گ

**کۆجیلە :** دەفرێکی دارینەیە کە ئاشەوان بەکاری دێنێ لە چەشنی ئەسکوێیە .
**کڵ :** پایەی پرد کە لە ناو ئاو دادەنرێ
**کیمخوا :** جۆرە قوماشێکی هەریرە .
**کاشان :** شارێکی ئێرانە مافورەی چاکی لێ دەکرێ .
**گونج :** لولە قوڕی‌برژاو بۆ ئاوەڕۆ لە جیاتی بۆڕی ئاسنی ئەمرۆ .
**گاڵ :** جۆرە هەرزنێکی دەنك‌گەورەیە.
**گوڵمیخ :** بزماری ئەستوور و گەورە.

### ل

**لغاوەگیرە :** رێگای بەردەڵانی‌و پلەپلەی نێوانی دو چیا کە تەنیا یەکسواری پێدا تێپەڕێ و دەرفەتی دەستەوەکەری زۆر کەم‌بێ .
**لیسپ :** قولێك خوری لە شانە نەدراوی نەڕێسراو .
**لەوێچ :** ئەوەندەی لەناو یەك لەپە دەستی چاڵکراودا جێی ببێتەوە ، واتا نیوەی مشتێك . لالەوێچ لەوێچێکی ناتەواو .

### م

**مەساسە :** دارێکی درێژ ئاسنێکی پانی سێ سوچی تێ‌گیراوە ، جوتیاران بۆ پاك‌کردنەوەی گاسنەکانیان لە کاتی جوتا بە دەستی‌یەوە دەگرن .
**میراو :** کاربەدەستی دابەشکردنی ئاوی کانی و جۆگاکان بە سەر باخ و کێڵگەکاندا .
**مێتولکە (مێتولە) :** گەرای ئەسپێی لەشی مرۆ بە هۆی چڵکنێ و دژوێنێ .
**مەیتەر :** ئەو کەسەی خزمەتی تەویلە و وڵاخی سواری دەکا .
**ماە :** رەوەزی لوس و یەکپارچەی چیا کە رێی پێ‌هەڵگەڕانی نەبێ .
**مجری :** سندوقی بچکۆلە بۆ هەڵگرتنی زێڕ و خشڵ و شتی بە نرخ .

### و

**ودم :** ئیجازە . بەو کەسانەی گوایە دەتوانن چاری هەندێ لە نەخۆشی‌یەکان بکەن دەڵێن ودمی پێ‌یە ، واتا موجازە .
**وارش :** دیواری کورتی یەك مەترێ وشکە کەڵەك کە بە دەوری شار و قەڵا یا گۆڕی پیاو چاکاندا

دەکێشرێ .
**وینجە** : گیاییێکی دەسچێنی ماڵییە بۆ ئالێکی ئاژەڵ و وڵاخ ، ساڵی چەنـد جارێـك دەدرووێتـەوە و دیسان هەڵدەداتەوە . بە عەرەبی ( بەرسیم )ە .
**وشکەڕن** : بلیاچو ، ئەو کەسەی بە دەمو چـاو رەنـگاندن و جلـکی سەیر و جوڵانەوەی پێکەنینداری خۆی لە سیرکەکاندا خەڵك دێنێتە پێکەنین. بە عەرەبی (موهەرریج)ە.
**وێرغە** : رۆیشـتنێکی زۆر خـێرای وڵاخی سواریە .
**وشەك** : دڕندەیێکی کێویە لە پڵنگ بچوکترە ، کەوڵی پارە دەکا .

## هـ

**هۆڕ** : جەوالی یەکتایی گەورەیە .

★ ★ ★

